# فەلسەفەی ئەخلاق

# و

# ئەخلاقی پزیشکی

سەرکەوت سەوادی

٢٠٢١

# پێرست

# پێشەکی

مرۆڤ بە بێ پێوەندییەکانی لە تەک ئەوانی تردا، بوونێکی ناتەواوە. بۆ ئەوەی بوونی خۆی تەواو بکات، ناچارە پێوەندییەکانی لەگەڵ دەوروبەردا ڕێک بخات. ئەوەیش ڕوونە مرۆڤ بە بێ بنەما مۆراڵییەکان، ناتوانێت پێوەندییەکانی بە درووستی دابمەزرێنێت. لێرەوە پرسی مۆراڵ هەمیشە وەک پرسێکی جیددی و نەشیاوی دەستلێبەردان خۆی دەرخستووە. هەر پیشە و بەرنامەیەک لەسەر بنەما ئەخلاقییەکان دابڕێژرێت و ڕێک بخرێت، ئەوە شکۆی مرۆڤ بە شێوەیەکی کۆنکرێتی تێیدا پارێزراو دەبێت، بۆیە گرنگینەدان بە پرس و تیۆرییە ئەخلاقییەکان و وردنەکردنەوەیان لەنێو کایەی پەروەردە و ناوەندە ئەکادیمییەکاندا، زەمینە بۆ ئەوە دەڕەخسێنێت تا مرۆڤ لە ئامانجەوە بکرێتە ئامراز و مامەڵەیەکی دوور لە پرەنسیپە ئەخلاقییەکانی لەگەڵدا بکرێت. هەر کۆمەڵگەیەکیش لە ڕووی

ئەخلاقییەوە دابڕمێت، هیچ هێزێک ناتوانێت ئەو کۆمەڵگەیە ڕاست بکاتەوە .یەکێک لەو کایە گرنگانەی ژیانی مرۆیی، کە پێوەندییەکی توندوتۆڵی بە بنەما ئەخلاقییەکانەوە هەیە، بواری پزیشکی و کارەکتەری پزیشک خۆیەتی، کە فەیلەسووفانی ئەخلاق لە کۆتاییی سالانی شەستەوە گرنگیی زۆریان بەم لایەنە داوە، تا بتوانن پزیشکەکان پابەندی بنەما مۆراڵییە هاوچەرخەکان بکەن، ئەمەیش لەپێناو پاراستنی مافەکانی پزیشک و نەخۆشیشدا .هیچ شتێک ئەوەندەی ئەخلاق مرۆڤ ناچار بە پابەندبوونی کار و پیشەکەی ناکات، لەبەر ئەوەی یاسای ئەخلاقی، پێویستی بە هیچ چاودێرێکی دەرەکی یان هێز و سزا و پۆلیسێک نییە تا پێڕەویی لێ بکرێت، چونکە هەڵقولاوی ناخی کەسەکانە. بەلام تایبەتمەندیی یاسا پێویستی بە پۆلیس و سزا و چاودێری هەیە. لەگەڵ نەبوونی چاودێرەکاندا، یاساکانیش دەخەون و ژێرپێ دەخرێن .گرنگیدان بە ئەخلاقی پزیشک لەوەوە سەرچاوە دەگرێت، کە ڕاستەوخۆ مامەڵە لەگەڵ گیانی نەخۆشدا دەکات. هەڵەی پزیشک وەکوو هەڵەی هیچ پیشەوەر و خزمەتگوزارێکی تر نییە؛ ڕەنگە هەڵەی میکانیکێک، ئەندازیارێک، یان مامۆستایەک، هەڵەیەک بێت بە بڕێک پارە یان ماوەیەک کارکردن شیاوی قەرەبووکردنەوە بێت، بەلام چونکە هەڵەی پزیشک، ڕاستەوخۆ بە ژیان و تەندرووستیی مرۆڤەکانەوە پێوەستە، ڕەنگە قەرەبووکردنەوەی دژوار بێت. ئەوە بۆیە مەکسیکییەکان لەم بارەیەوە گوتوویانە: (هەڵەی پارێزەر، تۆمەتبار دەخاتە بەندیخانە، بەلام هەڵەی پزیشک،

نەخۆش ڕەوانەی گۆڕستان دەکات.) بابەتی ئەخلاقی پزیشکی بۆ کۆمەڵگەی ئێمە، تا ڕادەیەکی زۆر بابەتێکی نوێیە و کتێبخانەی کوردی لەم ڕووەوە زۆر هەژارە، لە کاتێکدا بابەتێکی وا بە ڕادەیەک گرنگە، ئەگەر بە هەزاران کتێب و لێکۆڵینەوەیشی لەبارەوە بنووسرێت و بکرێت، هێشتا دڵۆپێکە لە زەریایەک.

## دەروازەیەک بۆ فەلسەفەی مۆڕاڵ

تا ئێستا چەندان پێناسەی جۆربەجۆر لەبارەی فەلسەفەی مۆڕاڵەوە خراونەتە ڕوو. بەڵام ناتوانین هیچ هێڵێکی هاوبەشی تەواوەتی لە نێوان ئەم پێناسانەدا بدۆزینەوە. لەوانەشە نەتوانین ئومێدمان بە خاڵێکی کۆکەرەوەی ئەرخەمێدس*ی هەبێت، کە بە پشتبەستن پێی تایبەتمەندییەکانی فەلسەفەی مۆڕاڵ ڕوون بکەینەوە. لەم سۆنگەیەوە، لەجیاتی ئەوەی بە شوێن پێناسەیەکی

* ئەرخەمێدسی کوڕی سێرەکیوس، لەدایکبووی ۲۸۷ پ.ز. بیرکاریناس، فیزیاناس، ئەندازیار، داهێنەر و گەردووناسێکی یۆنانی بووە. ئەگەرچی شتگەلێکی کەم لەبارەی ژیانیەوە زانراوە، بەو شێوەیەش ئەو بە یەکێک لە زانا پێشڕەوەکانی چاخی کلاسیک دادەنرێت. ئەرخەمێدس پێشبینیی جیاکاری و تەواوکاری و شیکاریی مۆدێرنی کرد بە جێبەجێکردنی بنچینەی نەژمێرراوەکان و شێوازی دۆزینەوەی ڕووبەری هاوکێشە بۆ دەرهێنان و بە وردی سەلماندنی ژمارەیەک تیۆریی ئەندازەیی لەوانە: ڕووبەری بازنە، ڕووبەری ڕووبارستاییی تەنی گۆیی و ڕووبەری ژێرچەماوە. هەروەها دەسکەوتە بیرکارییەکانی دیکەی بریتی بوون لە: دەرهێنانی وردی ڕێژەیی پای، دیاریکردن و لێکۆڵینەوەی لوولەک کە بە ناوی ئەرخەمێدس خۆیەوە ناو نرا، هەروەها کۆمەڵێک کاری گرنگی دیکە.

تەواو گشتگیردا بگەڕێین، وا باشترە چەند وێنایەکی گرنگ لەبارەی مەسەلە گەلاڵەکراوەکانی ئەم بوارەوە بخەینە ڕوو، تا لەم ڕێگایەوە وێنا جیاوازەکان بخەینەوە پاڵ یەک و وێنەیەکی فراوان لە زەیندا درووست بکەین.

مرۆڤ لە کۆنەوە، مژووڵی لێکۆڵینەوەی گشتگیرانە بووە لەبارەی کارە چاکەکان و نواندنی لە مەیدانی تاکەکەسیدا و پێشنیار و جەختکردنەوە لە کردنیان لە بەستێنی کۆمەڵایەتیدا. ئەم پێشنیارانە لە ڕازاندنەوەی جلوبەرگ، لێواری سفرەکان، لەسەر قاپ و دەورییەکان، شمشێرەکان و چەک و کەلوپەلی جەنگی، سەر دەرگاکان و چواردەوری خشڵەکاندا بەرچاو دەکەون، تەنانەت لە بەرهەمە تۆمارکراوەکانی شارستانییە سەرەتاییەکانیشدا ڕاسپاردەکانی چاکبوون و چاکژیان زیاتر جەختی لەسەر کراوەتەوە. سەرەڕای ئەمانەش، ناتوانین هیچ یەکێک لەوانە بە فەلسەفەی مۆڕاڵ لە قەڵەم بدەین. هەر کاتێک ئەم جۆرە پێشنیارانە ڕەهەندێکی عەقڵانیی زیاتر وەربگرن، ئەوا لە سنوورەکانی فەلسەفەی مۆڕاڵ نزیک دەبنەوە. لێرەوە، لە ڕێگەی پاساوهێنانەوەی عەقڵانییەوە دەتوانین پێشنیارکردن بۆ پابەندبوونێکی ڕێکوپێک بە (چاکە) و دەروازەی چوونەناو-فەلسەفەی-مۆڕاڵ لە قەڵەم بدەین، بۆیە پێویست بە هیچ شتێکی دیکە ناکات.

لەدوای قۆناغی فەلسەفەی کلاسیکەوە، جارێکی تر لە سەردەمی نوێدا فەلەسەفەی مۆڕاڵ لە لایەن کۆمەڵێک فەیلەسووفی وەک: دێکارت، جۆن لۆک، شافتسبێری، هیۆم، کانت

و کەسانی دیکەوە لە سەدەکانی حەڤدە و هەژدەدا خرایەوە بەر باس.

لەو دوو سەدەیەی کۆتاییدا، فەلسەفە بە پێچەوانەی زانستە ئەزموونییەکانەوە، پێشکەوتنێکی ئەوتۆی بە خۆیەوە نەبینیوە. هەروەها بە پێچەوانەی بانگەشەکارانی فەلسەفەوە، فەیلەسووفێکی ڕاستەقینە و وردبین، بە تایبەت لە بواری فەلسەفەی مۆڕاڵدا دەر نەکەوتووە، بۆیە ئەو کەسانەی دەستیان دایە نووسینی کتێبە فەلسەفییەکانی مۆڕاڵ و لەبارەی مۆڕاڵەوە قسەیان کرد، وەکوو (ئالفرێد ئایەر)* ی مۆدێلی پۆزەتیڤیستەکان و (ژان پۆل سارتەر)* ی مۆدێلی ئەگزیستانسیالیستەکان ڕای پێچەوانەیان هەبووە، یان وەکوو خاتوو (ماری وارنۆک)* کە کتێبێکی لەبارەی فەلسەفەی مۆڕاڵەوە نووسیوە و هەر خۆی دانی بە نەزانیی پۆزەتیڤیستەکاندا ناوە و لەبارەی خۆیشییەوە دەڵێت: وەک فەیلەسووفێک هێشتا نازانێت زاراوەی (مۆڕاڵ) چییە و ئەم زاراوەیە لەگەڵ زاراوەکانی دیکەدا چ جیاوازییەکی هەیە. هەڵبەت فەیلەسووفە ڕیالیستەکانیش لەم دوو سەدەیەدا لەبارەی فەلسەفەی مۆڕاڵەوە قسەیان کردووە، بەڵام تەنیا ئەو قسانەیان کردووە، کە فەیلەسووفانی کۆنی وەک سۆکرات و سۆفیستاییەکان گوتوویانن و هیچ شتێکیان بۆ زیاد نەکردووە و فەلسەفەکەشیان کامڵ نەکردووە، هەرچەندە وتەی جوان و

---

* Alfred Jules Ayer (١٩١٠-١٩٨٩)
* Jean-Paul Sartre (١٩٠٥-١٩٨٠)
* Mary Warnock (١٤/April/١٩٢٤)

ناوازەشیان لەم مەیدانەدا وتووە. بەڵام لە ڕۆژهەڵاتدا، لە بواری زانستە ئایینییەکان و شوێنکەوتووانی فەلسەفەی ئەرەستۆییدا، هێشتا فەلسەفەی ئەرەستۆ باڵی بەسەریاندا کێشابوو. لە بواری فەلسەفەی مۆڕاڵیشدا نووسراوە مۆڕاڵییەکان ئامانجی مۆڕاڵیان بە خۆشبەختی زانیوە. (سەرکەوت، ١٢،١٣٩٣-١٣).

## بەشەکانی فەلسەفەی مۆڕاڵ

زۆربەی فەیلەسووفانی مۆڕاڵ پێیان وایە فەلسەفەی مۆڕاڵ، دابەش دەبێت بۆ سێ بەشی سەرەکی کە بریتین لە: مێتا-مۆڕاڵ* مۆڕاڵی دەستووری و مۆڕاڵی جێبەجێکاری.

### میتا-مۆڕاڵ

ڕەهەندە مێژووییەکەی میتا مۆڕاڵ،* یان میتافیزیکای مۆڕاڵ * لە سەرەتادا ڕوو لەو فەیلەسووفانە دەکات یان سەر بەو قوتابخانە فەلسەفییانەیە کە فەلسەفە و میتۆدی فەلسەفاندنیان گرێدراوی عەقڵ و ئاوەزگەراییە. بەو پێودانگەی کردەکان یان سەرجەمی ئەو کردانەی کە هەڵوێستیش لەناویاندا، سەچاوەکەیان لە عەقڵەوەیە و عەقڵ ئاراستەکەرەکەیەتی. هەروەها لە فەلسەفەی هاوچەرخدا ڕووبەڕووی چەندان بیروبۆچوون لەبارەی میتافیزیکای مۆڕاڵەوە دەبینەوە کە هەر یەکەیان خاوەنی میتۆد و ڕێباز و شێوازی تێگەیشتنی خۆیانن

---

* Meta-ethic
* Applied ethic
* Practical ethic

بۆ ئەو بابەتە، هەر یەکەیان دەتوانن لە دەلاقەیەکی فیکرییەوە وەرگرین و بیخەینە بەر توێژینەوە و بەدواداچوون، تا لە ڕێگەیانەوە مەعریفەی خۆمان پێش بخەین و سوودیان لێ وەربگرین. هەرچەندە نموونەی فەیلەسووفە هاوچەرخەکان زۆرە، بەڵام ئێمە دەتوانین فەیلەسووفە نموونەییەکان وەربگرین و بەم جۆرە بەرچاوڕوونییشمان دەبێت تا پرسی میتافیزیکای مۆراڵیش ڕۆشن بکەینەوە، ئاشنای ئەو تێزانە بین کە پێشکەشیان کردووە یان ژیانی خۆیان لە کۆمەڵێک یاسادا دەبیننەوە، وەک: سەرچاوەی هەستی مۆراڵی و ئەو بزوێنەرە ناوەکییانەی بۆ گوێڕایەڵیکردنی ئەوەی هەستی مۆراڵیمان پێمان دەڵێت، پاڵمان پێوە دەنێن و هەڵسوکەوتمان بە شێوەیەکی تایبەتی گەلاڵە دەکەن، یان ئەو مەبەست و ئامانج و سەرەنجامانەی کە هەوڵ دەدەین بە کارە عەقڵانییەکانمان پێیان بگەین. مەبەستی ئەمانەش ڕوو لەوە دەکات کە چۆن جیاکاری بکەین لەوەی ئەو کردەوەیەمان کە ئاوەزمان ئاڕاستەکەریەتی و مۆراڵییە، لە کارێکی نامۆراڵی جیا بکەینەوە، یان کامە هەقە و کامە ناهەقە، کامە دادپەروەرانەیە و کامە نادادپەروەرانەیە، کامەیان ڕوو لە خێر دەکات و کامەش ڕوو لە شەڕ، یان کامە کردەوە بەرژەوەندخوازییە و کامەش نابەرژەوەندخوازییە بۆ دروستکردنی ژیانێکی مۆراڵی؟ (کەمال،٢٠٠٩،٨٤) یان لە سەرچاوەی ئەم دژانەدا چۆن کەسایەتییەکان دەناسێنرێت و پێناسەیان بۆ ئێمە ڕوون دەکاتەوە.

تیۆریی فەرمانی خودایی* نموونەیەکە لە تیۆرییەکانی ئەم شێوازە، کە بە پێی ئەم تیۆرییە هەر شتێک خودا بیەوێت، نەهیی لێ دەکات یان ئەمری پێ دەکات؛ واتا کردەوەکان کاتێک ڕێگەپێدراون، کە پێچەوانەی فەرمانێک لە فەرمانەکانی خودا نەبن. لە لایەکی ترەوە، ئەو تیۆرییانەی کە سەرچاوەی بانگەشەی نەریتی و بەهاکانی خۆیان لە دەرەوەی مرۆڤ دانانێن -یان بە واتایەکی تر ئەو تیۆرییانەی کە بڕوایان بە چاکوخراپیی خودی کردەوەکان و سەربەخۆییی عەقڵ هەیە- زۆر جار سەرچاوەی ئەم بانگەشانە ناخی کەسایەتیی بکەری کردەوەکان و سەرچاوەی فەزیلەتی کەسەکە دەزانن، یان گوێ بە کەسایەتیی بکەرەکە نادەن و تەنیا لە خودی کردەوەکە ورد دەبنەوە. (پیک حرفه، ١٣٩٠: ٦-٨)

## مۆراڵی دەستووری

مۆراڵی دەستووری،* لقێکی فەلسەفەی مۆراڵە کە هەوڵدانێکی عاقڵانەیە بۆ دۆزینەوەی کارە چاک و خراپ، خوازراو و نەخوازراو، بەنرخ و بێنرخ، درووست و هەڵەکان، هەروەها کردارە پێویستەکانی مرۆڤ دەستنیشان دەکات و سنووری کردەوە خراپەکانیشی بۆ ڕوون دەکاتەوە. بابەتەکانی مۆراڵی دەستووری بە دوای ئەوەوەن، کە چ پێوەر و ڕێسایەکی گشتی دەتوانرێ دابنرێت، بۆ ئەوەی لە ڕێگەی ئەو پێوەرەوە بتوانین

---

* Divine Command Theory

* Normative ethic

کارە مۆراڵییە ڕێگەپێدراوەکان لە کارە نامۆراڵییە ڕێگەپێنەدراوەکان جیا بکەینەوە.

## مۆراڵی کرداری

لە لایەن فەیلەسووفان و توێژەرانەوە، بوارێکی دیکە لە فەلسەفەی مۆراڵدا لە دایک بوو، کە بە مۆراڵی جێبەجێکاری،* یان مۆراڵی کرداری* ناو دەبرێت. ئەم بوارە، وەکوو زۆربەی بوارەکانی دیکەی فەلسەفە، دەتوانین لە سەردەمە کۆنەکانەوە ڕەگوڕیشەکانی بدۆزینەوە. بەڵام تا کۆتاییی دەیەی ١٩٦٠، هیچ فەیلەسووفێک بە درێژاییی مێژووی فەلسەفەی مۆراڵ پرۆگرام و شێوازێکی تایبەتی بۆ فراوانکردن و بڵاوکردنەوەی مۆراڵی جێبەجێکاری نەخستووەتە ڕوو. یەکێک لە پێناسە گرنگەکانی ئەم بوارە لە لایەن (گرێت)ـەوە کراوە. ئەو پێی وایە مۆراڵی جێبەجێکاری، یان مۆراڵی کرداری، هەوڵێکە بۆ جێبەجێکردن و کارپێکردنی بنەماکان و تیۆرییە مۆراڵییە گشتییەکان لەسەر بوارە تایبەتەکانی ژیانی ڕۆژانە و مەسەلە نوێیەکان. (پیکحرفە، ١٣٩٠، ١٨) بەڵام لە ڕۆژگاری ئێستادا، زۆربەی توێژەران لەو بڕوایەدان، کە هیچ ئاڕاستەیەکی درووست بەرەو بەڵگەکانی چاودێریی کردارەکانی مرۆڤ بە ڕەچاوکردنی تیۆرییە مۆراڵییەکان یان بنەما مۆراڵییە گشتییەکان درووست نابێت.

---

* Applied ethic
* Practical ethic

ئەمە هەمان ئەو شتەیە کە بە کەلێنی نێوان تیۆری و کردار* ناو دەبرێت. پێویستە تیۆری و بنەماکان لە ڕێگەی داتا ئەزموونییەکان، تاقیکردنەوەی ڕێکخراوەکان و هاوشێوەکانیانەوە تەواو بکرێن. بەڵام ئەم کارە چۆن دەکرێت؟ ئەم پرسیارە یارمەتیدەرێکی زۆر باشی ئێمە دەبێت تاوەکوو لە دژوارییەکانی تێگەیشتن و پێناسەکردنی وردی مۆراڵی جێبەجێکاری بگەین. بۆیە دەتوانین بە چاوی گومانەوە سەیری پێناسەکەی گرێت لەبارەی مۆراڵی جێبەجێکارییەوە بکەین، چونکە پێناسەکەی گرێت بە ئەندازەیەک بەرتەسک و کورتە، کە زۆربەی توێژەران پێیان وایە هێشتا نەیتوانیوە وێنای ناوەرۆک و شێوازی گونجاوی مۆراڵی جێبەجێکاری بکات، بەڵکوو ئەم توێژەرانە لەو بڕوایەدان، بەکارهێنانی هەر جۆرە ڕێبازێکی فەلسەفی بۆ لێکدانەوەی مەسەلەکان، جێبەجێکردن و دانانی ڕێبازە مۆراڵییەکان لە کارەکان، داهێنانەکان، کارەکانی دەوڵەت و هاوشێوەکانی بە مۆراڵی جێبەجێکاری لە قەڵەم بدەین. ئەم پێناسەیە بەم قەبارە گەورەیەوە هیچ جۆرە پابەندبوونێکی بە بنەماکان و تیۆرییە گشتییەکانەوە تێدا نییە و وەک پێویستییەک بۆ چارەسەرکردنی مەسەلەکان نازانێت. ئەم جۆرە تێگەیشتنە لە مۆراڵی جێبەجێکاریدا باوترین جۆریەتی لەنێو فەیلەسووفاندا، بەڵام پسپۆڕانی بەشەکانی دیکە، کاتێک لە دەرەوەی مەیدانی فەلسەفەوە بۆی دەڕوانن، زۆر بە دەمارگیرانە و لایەنگرانەی

---

* The gap between theory and practice

دەزانن. لە دواییدا زیاتر تیشک دەخەینە سەر مۆڕاڵی جێبەجێکاری.

هەندێک بەش و بواری دیکەش هەن، کە فەیلەسووفان بۆ قبووڵکردنیان وەک لقەکانی فەلسەفەی مۆڕاڵ، بیروڕای جیاوازیان لەبارەیانەوە هەیە. یەکێک لەو بەشانە، دەروونناسیی مۆڕاڵە*. دەروونناسیی مۆڕاڵ، بە دوای شیکردنەوەی مەسەلە دەروونناسییەکاندا دەگەڕێت، ئەو مەسەلانەی پێوەندییان لەگەڵ نرخاندنی مۆڕاڵی کردەوەکانی مرۆڤدا هەیە، بە گریمانە دەروونناسییەکانی مۆڕاڵ توێژینەوەکانی دەکات؛ واتا ئەو گریمانانەی کە بۆ دانانی ئەرکێکی مۆڕاڵی تاکەکەسیانە پێویستە هەبن. سەرەڕای ئەوەی جێبەجێکردنی دەروونناسیی مۆڕاڵی بەسەر کردەوەکانی مرۆڤدا درووست بێت یان نا، هەندێک پرسیاریش لەبارەی چییەتی و ئەگەری لاوازی مۆڕاڵی یان خۆگێلکردن* و پرسیارگەلێک لەبارەی ئەو هاندەرە* دەروونییانەی کەسێک بەرەو کردنی کارێکی مۆڕاڵی دەبات، دەکات. لە دەروونناسیی نوێدا سێ تیۆریی گرنگ خراونەتە ڕوو، کە هەر یەکێکیان بۆچوون و لێکدانەوەی تایبەتییان لەبارەی مۆڕاڵەوە هەیە.

بوارێکی دیکەی فەلسەفەی مۆڕاڵ، کە فەیلەسووفەکان بیروڕای جیاوازیان وەکوو یەکێک لە لقەکانی فەلسەفەی مۆڕاڵ

---

* Moral psychology
* Self-deception
* Motive

لەبارەیەوە هەیە، مۆراڵی پەسنی (وصفی)*یە. مەبەست لە مۆراڵی پەسنی، خوێندنەوە و توێژینەوەیە لەبارەی پەسندان و شیکردنەوەی مۆراڵی تاکەکان و کۆمەڵگە جۆربەجۆرەکانەوە، واتا خستنەڕووی بنەما مۆراڵییە قبووڵکراوەکانی تاک و کۆمەڵگە یان گرووپێک و ئایینێکی دیاریکراوە. ڕێبازی لێکۆڵینەوە لەم جۆرە توێژینەوە مۆراڵییانەدا، ئەزموونکاری و گواستەنەوەی زانیارییەکانە، نەک بەڵگەکاری و ڕاڤەی عەقڵی، (مصباح، ١٣٨٦، ١٨) بێ ئەوەی لایەنگریی هیچ کامیان بکات. هەروەها مۆراڵی پەسنی، زاراوە مۆراڵییەکان بەیان دەکات، بەڵام کاری ئەم مۆراڵە پێچەوانەی کاری میتا-مۆراڵە، چونکە ئەمەیان بە دوای ئەوەوەیە، کە وشە و دەستەواژە مۆراڵییەکان لە جێگەی خۆیان و بە شێوەیەکی درووست بە کار بهێنرێن، کەچی لە میتامۆراڵدا زاراوە مۆراڵییەکان لە بەستێنە کولتوورییە گشتییەکاندا هەوڵی شیکارکردنیان دەدرێت. مۆراڵی پەسنی پێویستی بە توێژینەوە مرۆڤناسی و مێژووییەکانە و لە ڕێگەی شیکردنەوەی فەلسەفییانەی داتاکانی توێژینەوە مەیدانییەکانی سرووشتی مۆراڵەوە دەست دەداتە دارشتنی تیۆرییە مۆراڵییەکان.

لێرەدا پێویستە وەڵامی ئەو بانگەشەیە بدەینەوە کە پێی وایە فەلسەفەی مۆراڵ، تەنها بریتییە لە میتا-مۆراڵ. بەڵام ئەم بانگەشەیە پێچەوانەی وێنە گەورەکەی ئەو بوارە جۆربەجۆرانەیە کە بە ناوی فەلسەفەی مۆراڵەوە کۆمان کردوونەتەوە. بۆ نموونە، ڕۆجەر کریسپ، نووسەری بابەتی

---

* Descriptive ethics

فەلسەفەی مۆڕاڵ لە پێشەکیی ئینسایکلۆپیدیای فەلسەفەی ڕاتلێجدا وتوویەتی: لە زمانی ئینگلیزیدا وشەی (ethic) لای کەم بۆ چوار مەبەست بە کار دێت:

یەکەم: چەندان ڕژێمی بەها و دابونەریتە دیارەکانی ناو ژیانی چەند دەستەیەکی مرۆڤەکانە (ئەم ڕژێمانە بە مۆڕاڵی ئەم دەستانە دەناسرێن؛)

دووەم: بریتییە لە تاکە ڕژێمێکی دیاریکراو لەناو ڕژێمەکانی خاڵی سەرەوە، کە تێگەگەلێکی وەک درووستی و نادرووستی و هاوشێوەکانی لە خۆ گرتووە. (ئەم بەکارهێنانەی ethic تا ڕادەیەکی زۆر لەگەڵ moralityدا یەکسانە؛)

سێیەم: بریتییە لە چەندان پرسیار و بنەمای مۆڕاڵیی زیادکراوی ڕاستەقینە، وەکوو: (بۆچی کتێبەکەت پێ دایەوە؟) لە وەلامیشدا بوترێت: (ئەوە تاکە کارێکی مۆڕاڵی بوو کە لەو کاتەدا دەبوایە بکرێت؛)

چوارەم: بریتییە لە بوارێکی فەلسەفە، کە توێژینەوەی مۆڕاڵ (ethic) بە هەر سێ ماناکەی سەرەوە دەکات.

## قوتابخانه سەرەکییەکانی فەلسەفەی مۆڕاڵ

جگە لەو دابەشکارییەی بۆ بەشەکانی فەلسەفەی مۆڕاڵ خرایە ڕوو، بە پێویستی دەزانم کەمێکیش تیشک بخەمە سەر قوتابخانە سەرەکییەکانی فەلسەفەی مۆڕاڵ، کە زۆرینەی فەیلەسووفانی مۆڕاڵی لە خۆی کۆ کردووەتەوە، کە بریتین لە: (قوتابخانەی فەزیلەتگەرایی)، (قوتابخانەی ئەرککگەرایی) و (قوتابخانەی سوودگەرایی.)

### مۆڕاڵی فەزیلەتگەرایی

یەکێکە لە سێ لقە سەرەکییەکەی مۆڕاڵی نۆرماتیڤ. مۆڕاڵ لە لای لایەنگرانی ئەم ڕێبازە، بکەرسەنتەرە. ڕیشەی ئەم بیروبۆچوونە بۆ ئەرەستۆ دەگەڕێتەوە. ئەم ڕوانینە مۆڕاڵییە بۆ ماوەی چەند سەدەیەک لە بیر کرابوو، هەتا ئەوەی کە لە سەدەی بیستەمدا، لەسەر دەستی کەسانی وەکوو ئێلیزابێس ئانسکۆم، ئەلەسدایەر مەکینتایەر و فیلیپا فووت، زیندوو کرایەوە. ئەوان لەسەر ئەو باوەڕە بوون، بۆ ئەوەی ژینێکی باشمان هەبێت، دەبێت

بۆ مۆڕاڵی ئەرەستۆیی بگەڕێینەوە. کاتێک باسی مۆڕاڵی فەزیلەتگەرایی دەکەین، ڕاستییەکەی دۆخی دڵخوازی ڕێسایی نابەستینەوە بە (کردەوە)وە.

مۆڕاڵی فەزیلەتگەرا هەوڵ دەدات بە بێ ئەوەی گرنگی بە ڕەوایی و ناڕەوایی مۆڕاڵی بە پێی ئەرکی مۆڕاڵی یان لێکەوتەی ئەنجامی کردەوەکان بدات، تاکی فەزیلەتمەند پەروەردە دەکات. مۆڕاڵی فەزیلەتگەرا گرنگی بە دوو بابەت دەدات: (یەکەم،) کردەوەی بکەر و (دووەم،) نیاز و مەبەستی بکەر. درووشمی ئەم جۆرە لە مۆڕاڵ ئەمەیە: (هەر کارێک دەکەیت، لەکاتی شیاو و بە ڕێگای درووست و بە مەبەستی چاک و پاک بیکە!) فەزیلەتگەراکان باوەڕیان وایە کە بە هۆی ئەو بۆچوونە هاودژانەی کە سوودگەراکان و لایەنگرانی کانت ناویانەتە بەردەممان، ناکرێت دۆزی کۆمەڵێک بابەتی وەک: لەباربردن، بەخشینی ئەندامەکانی جەستە و ئۆتۆنازی لە ڕێگەی تیۆرییە مۆڕاڵییەکانەوە چارەسەر بکرێن. ئەوان دەڵێن: ڕەنگە لەم دۆخانەدا باشتر بێت پرسیار لە خۆمان بکەین: (مرۆڤێکی باش لەم دۆخەدا چی دەکات؟) یان ئەوەی کە: (نەخۆشێکی بێچارەسەر چ ئامانجێکی هەیە؟) سەرەڕای وێناکردنی ئەوەی کە یاسا چۆن دەتوانێت لە پێکهاتنی لایەنەکاندا ڕۆڵ بگێڕێت، تا ڕادەیەک سەختە. کۆمەڵێک لە لایەنگرانی مۆڕاڵی ئەرەستۆیی پێیان وایە ڕەنگە گەڕانەوە بۆ مۆڕاڵی فەزیلەت-سەنتەر بۆ خۆبەدوورگرتن لە لێکەوتە و ئاسەوارە نەخوازراوەکانی ئەو ڕێبازە، بەسوود بێت. (ڕابینسون، ١٣٧٨: ١٧١) فەزیلەتگەراکان چۆن دەتوانن بۆ هەڵسەنگاندنی ڕەوابوون

یان ناڕەوابوونی مۆڕاڵیی کردەوەکان، لە دۆخە جیاوازەکاندا بەیانێکی گونجاو بە دەستەوە بدەن؟ بۆ زانینی ئەمە دەبێت بگەڕێینەوە لای بیروبۆچوونەکانی ئەرەستۆ و فەیلەسووفانی دیکەی سەر بەم ڕێبازە.

## مۆڕاڵی ئەرکگەرایی

لە لایەکی تریشەوە، هەندێک لە فەیلەسووفان پێیان وایە، پێوەری چاکە و خراپەی ئەنجامی کردارەکانمان نابێتە پێوەرێکی گونجاو بۆ هەڵسەنگاندنیان، مرۆڤەکان بەبێ ڕەچاوکردنی ئەنجامی هەندێک لە کردەوەکانیان، تا ڕادەیەک لە هیچ بارودۆخێکدا ڕێگەیان پێ نادرێت ئەو کردەوانە بکەن. ئەم گرووپە، کە ئامانجیان خودی مرۆڤ و خاوەندارییێتیی هەمیشەییەتی بۆ مافگەلێکی مسۆگەر و شیاوی پێشێلنەکردن، بە (نامەبەستگەرا)* (نائەنجامگەرا)* یان (ئەرکگەرا)* ناو دەبرێن. ئەرکگەرایی لەسەر ئەو باوەڕەیە کە مرۆڤ وەکوو بکەرێکی مۆڕاڵی، کۆمەڵێک ئەرکی لەسەر شانە، کە بە پێی عەقڵ دەبێت ڕایانپەڕێنێت. ئێمە نابێت کردەوەیەک بەو هۆیەوە بە ڕەوا بزانین کە لێکەوتەی باشی دەبێت و هەروەها نابێت کردەوەیەک بەو هۆیەوە بە ناڕەوا بزانین کە لێکەوتەی خراپی دەبێت، بەڵکوو دەبێت تەنیا بە هۆی ئەو ئەرکانەوە کە عەقڵ لەسەرمانی پێویست کردووە، کردەوەی مۆڕاڵیمان هەبێت. ئەم

---

* Non-teleologist
* Non- consequentialist
* Deontologist

ئەرکانە لە دنیای واقیعەوە وەرگیراون و هیچ پێوەندییەکییان بە لێکەوتە و ئاکامی کردەوەکانەوە نییە. بە واتایەکی دیکە، ئاکام و لێکەوتەی هەر کردەوەیەک هەرچی بێت، هیچ پێوەندییەکی بە بایەخی مۆڕاڵیی ئەو کردەوەوە نییە. ئەرکگەراکان سەرچاوەی ئەرکەکان یان لە عەقڵ و هزردا دەبینن، یان لە تێگەیشتنی بیرمەندانی ئایینی هاوڕێبازی خۆیاندا کە سەرچاوەی ئەرکەکان بۆ فەرمانەکانی خودا و ئایین دەگەڕێننەوە. دەتوانین هەندێک لە فەیلەسووفە ئەرکگەراکان ناو ببەین: لۆک (سەدەی حەڤدە)، کانت و پڕایس (سەدەی هەژدە)، ڕۆس و پریچارد (سەدەی نۆزدە و بیست.) هەندێک لەم فەیلەسووفانە باسی ئەرکەکان دەکەن و هەندێکیان باسی مافەکان؛ بە شێوەیەکی گشتی دەتوانین مافەکان بەسەر ئەم دوو دەستەیەدا دابەش بکەین: (١) مافە ئەرێنییەکان کە پێوەندییان بە وەرگرتنی خزمەتگوزارییەکانەوە هەیە. ئەمە ئەرکی ئەوانی دیکەیە کە ئەوانە جێبەجێ بکەن، ئەگەرچی بڕیاردان لەسەر ئەوەی، ئەم ئەرکانە دەکەونە سەر چ کەسانێک، بە ڕاستی سەختە. نموونەی ئەم مافانە، مافی کارکردنە؛ (٢) مافە نەرێنیەکان، کە پێوەندییان بە بابەتێکی تایبەتەوە نییە و بە پێی ئەم مافانە کۆمەڵێک ئەرک دیاری کراون.

## مۆڕاڵی سوودگەرایی

دوای سەردەمی ڕۆشنگەری، جۆرێک لە ئەنجامگەرایی لە فەلسەفەی مۆڕاڵیدا هاتە کایەوە، کە گرنگترین شەقڵی بریتییە لە: (سوودگەرایی)* . هەڵبەت لەم قوتابخانەیەشدا بیروڕای جیاواز هەن. تیۆریی سوودگەرایی لە دوو بنەمای سەرەکی پێک هاتووە: بنەمای ئەنجام، کە پێداگری لەسەر تایبەتمەندیی ئاکام-سەنتەریی ئەم تیۆرییە دەکات و بنەمای سوود، کە جەخت لە سەر بەستێنی چێژ-سەنتەریی ئەم تیۆرییەیە دەکاتەوە. بە گشتی بە پێی بنەمای ئەنجام، ڕەوابوون و ناڕەوابوونی کردەوەیەک، پێوەندییەکی پتەوی لەگەڵ شوێنەوار، ئەنجام و لێکەوتەکانی ئەم کردەوەیەدا هەیە. لێرەدا پەیامی کردەوەکان زۆر گرنگن. بۆ بەدەستهێنانی پێگەی ڕەوابوون یان ناڕەوابوون ڕۆڵێکی بەرچاو دەگێڕن. بنەمای سوودگەرایی جەخت لەوە دەکاتەوە: تەنیا شتگەلێک لە بنەڕەتەوە باشن، کە چێژ و دابینکەری ئاسایشن. ئامانجی زۆرترین چێژ و ئاسایش، کەمترین ئازار و ژان. بۆ گەیشتن بە پێگەی ڕەوابوونی مۆڕاڵی (کردەوەکەمان) یارمەتیمان دەدات. لە سەرەتاوە ئاماژەی پێ کرا کە دیارترین تیۆریی ئەنجام-سەنتەری، سوودگەراییە. ئەم تیۆرییە یەکێک لە دیارترین تیۆرییەکانی مۆڕاڵ، کە پێوەری بۆ هەڵە یان درووستبوونی کردەوە ئەوەیە، ئایا کردەوەکە چەندە سوود و چەندە زیانی هەیە. سوودگەرایی، وەکوو وانەیەکی فەلسەفی لە سەرەتادا بە چالاکییە هزرییەکانی هاچسۆن و هیوم

---

* Utilitarianism

دەستی پێ کرد، پاشان لە نووسراوەکانی میل و بێنتامدا گەشەی سەند. (دباغ، ١٣٨٨: ١٥١)

ئەم تیۆرییە تەنیا پشتیوانی لە بنەمایەکی سەرەکیی مۆڕاڵ دەکات، ئەویش (سوود)ە. واتا کردەوەکانی ئێمە دەبێت ئەفزەڵیەتی سوود بدەن بە سەر زیاندا، هەر بەم پێیەش ئەفزەڵیەتی خێر بدەن بە سەر شەڕدا. درووشمی سوودگەرایی ئەمەیە: زۆرترین سوود و کەمترین ئێش و زیان بۆ زۆرینە. بە واتایەکی تر، دانانی باشە لە سەرەوەی خراپە، چێژ لە سەرەوەی ئازار و بەختەوەری لە سەرەوەی چارەڕەشی بۆ ژمارەیەکی زۆرتر لە مرۆڤەکان. سوودگەرایی، ئامانجێکی هاوبەش دەداتە هەموو بکەرەکان؛ هەر بکەرێک دەبێت بۆ بەدەستهێنانی سوودی زیاتر هەوڵ بدات، بە کردەوەکانی ئەمە بسەلمێنێت و گەرەنتیی بکات.

لێرەدا پێویستە کەمێک زیاتر گرنگی بە فەلسەفەی مۆڕاڵ و کارکردەکەی بدرێت. کاتێک چییەتیی بابەتێک دەخەینە بەر باس و لێکۆڵینەوەوە، ڕووبەڕووی ڕاستیی نوێ دەبینەوە، کە پێش لێکۆڵینەوە لێیان بێئاگا بووین. بۆ وێنە توێژینەوەی زانستی زیندەزانی ڕاستیی نوێمان لەبارەی زیندەوەرە سرووشتییەکانەوە بۆ دەر دەخات. بە خوێندنەوەی زانستی ئابووریش پرۆسەکانی چۆنیەتیی وەگەرخستنی بازاڕمان بۆ ڕوون دەبێتەوە. لە کاتێکدا مۆڕاڵ شتێکە کە زۆرینەی ئێمە، تەنانەت پێش لێکۆڵینەوەی ئەکادیمییانەش پێی ئاشناین. هەموو کۆمەڵگەکان خاوەنی کۆمەڵێک پێوەری مۆڕاڵین و زۆربەی خەڵکی، پێش ئەوەی بگەنە تەمەنێکی گەورە، ئاگاداری ئەم

پێوەرە مۆڕاڵییانەن. لە سەرچاوەکانی مۆڕاڵی ناو کۆمەڵگەوە وەکوو دایکوباوک و مامۆستاکانمان، فێر دەبین کە نابێت کەسێکی بێگوناهـ بکوژین و دزی و درۆ بکەین. (پیک حرفە، ١٣٩٠، ٢٤) کە واتە بە تێپەڕبوونی کات هەمیشە ئەم پرسیارە دووبارە دەبێتەوە: موتالاکردنی فەلسەفەی مۆڕاڵ چ سوودێکی هەیە؟ فەلسەفەی مۆڕاڵ چ شتێکمان فێر دەکات کە لەناو کۆمەڵگەدا نەبێت؟ بۆچی دەبێت کۆڵینەوەیەکی فەلسەفی لەبارەی مۆڕاڵەوە بکەین؟ دەتوانین وەڵامی ئەم پرسیارە بەم جۆرە بدەینەوە:

(یەکەم،) فەلسەفەی مۆڕاڵ دەتوانێت تێفکرینی ئێمە لەبارەی مەسەلە بنچینەییەکانی ژیانەوە بە تەواوی بگۆڕێت و بە وردبوونەوەیەکی زیاترەوە ڕووبەڕووی مەسەلەکانی ژیان ببینەوە. هەڵبەت ئەگەر بێت و بەها و سوودە زانستییەکانی ئەم فەلسەفەیە لە بەرچاو نەگرین، ئیتر ناتوانین کەسێکی تێگەیشتوو و پێگەیشتوو بدۆزینەوە؛

(دووەم،) کاتێک قۆناغی گەشەی عەقڵی و ئاوەزی وردە وردە تێدەپەڕێنین، گەورەکان: (باوان، مامۆستایان، دۆستان و کۆمەڵگە) چاکوخراپیی کارەکانمان بۆ دیاری دەکەن، پێمان دەڵێن چی بکەین و چی نەکەین؟ لە کۆتاییدا دەبێت ئەم بەها کۆمەڵایەتییانە ڕیزبەند بکەین و باوەڕەکانمان لەم بەستێنەدا گەشە پێ بدەین. بەڵام چۆن دەتوانین ئەم کارە بە باشترین و ژیرانەترین شێوە بکەین؟

(سێیەم)، فەلسەفەی مۆڕاڵ فێری ئەوەمان دەکات، چۆن بە باشترین شێوە بیر لە مەسەلە مۆڕاڵییەکان بکەینەوە. بەو مانایەی کاتێک بڕیارێکی مۆڕاڵ دەدەین، بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ ڕێبازە مۆڕاڵییەکانمان لە پێشچاو گرتووە. بێ گوێدانە ئەوەی ئەم ڕێبازە باشە یان خراپە. ئەوە گۆشەنیگایەکی فیکری و کردەییمان دەخاتە بەردەست، چ بتوانرێت پاساوی بۆ بهێنرێتەوە، یان نا! لە لایەکی ترەوە، فەلسەفەی مۆڕاڵ دەتوانێت شێوازی تێڕوانینمان باش و گونجاوتر بکات و ئاستی بیرکردنەوەمان لەبارەی بابەتە مۆڕاڵییەکانەوە فراوان بکات. (گنسلر، ١٣٩٠، ٧-٨)

دەتوانین بڵێین مەبەست لە خوێندنەوەی فەلسەفەی مۆڕاڵ، وردبینیکردنی پرۆسە گشتییەکانی بیرکردنەوەیە لە ئانوساتی فەلسەفەکاریدا، هەروەها فێری لێهاتوویی عەقڵانیی زۆر گرنگ دەبین، کە چۆن لەبارەی مەسەلە بنچینەییەکانەوە بە وردی بیر بکەینەوە. تێڕوانینە جیاوازەکانیش هەست پێ بکەین و هەڵیانسەنگێنین، هەروەها بیرەکانمان بە ڕۆشنی دەر ببڕین و بە وردی بەڵگەکاری بکەین. ئەم لێهاتووییانە لە ژیانێکی ڕاستەقینەدا گرنگیی زۆریان هەیە؛ فەلسەفە زیاتر لە هەر شێتکی تر، دەتوانێت یارمەتیی گەشەکردنی بدات.

## چەمکی مۆراڵی جێبەجێکاری، بنچینە و پێشینە

مرۆڤ بەبێ ئەوەی بە زمانی دەری ببڕێت، هەمیشە خۆی لە کۆتوبەندی مۆراڵدا دەبینێتەوە، بۆیە خاوەن مۆراڵگەلێکە*. فەلسەفەی مۆراڵ لەو کاتەدا سەر دەر دێنێت، کە مرۆڤێک لە بابەتە مۆراڵییەکان ورد بێتەوە و تێڕامان بکات. هۆلمز لەبارەی چۆنیەتیی پەیدابوونی تێگە مۆراڵییەکانەوە دەڵێت: "مرۆڤەکان هەمیشە پێویستیان بە خۆراک، گەرما، خانوو و پێوەندیی سێکسی هەیە. ئەو شتانەش کە ئەم پێویستییە بنەڕەتییانەمان بۆ دەستەبەر دەکەن، لە لای ئێمە دەبنە جێگەی بایەخ. لەم ڕووەوە لە نێوان ئێمە و ئاژەڵەکانی تردا هیچ جیاوازییەک نییە، بەڵام ئێمەی مرۆڤ لە قۆناغێکی دەرکەوتن و گەشەکردندا وردە وردە ئەم شتانە بە نرخ لە قەڵەم دەدەین. ئیدی لێرەوە کاری چەمکسازی دەستی پێ کردووە و چەمکی (چاکە) یان (خێر)* هاتووەتە کایەوە." (هولمز، ١٣٨٥، ٢٦) هەر ئەم گۆڕانکارییەش ئێمە لە ئاژەڵان جیا دەکاتەوە.

---

* Morals
* Goodness

تێفکرێن لە هاتنەکایە و چۆنیەتیی درووستبوونی تێگە مۆڕاڵییەکان و بناغە فیکرییەکان، خۆی لە خۆیدا دەبێتە یەکەم هەنگاوی فەلسەفەی مۆڕاڵ، کە بە هۆی پێوەندیی توندوتۆڵی بابەتە مۆڕاڵییەکانەوە لەگەڵ ژیانی کۆمەلایەتی و ئابووریدا، ئیتر مرۆڤ چاوی لەسەر چۆنیەتیی بەکارهێنانی بنەما مۆڕاڵییەکانی ئەم سنوورە پان و بەرینەیە. بە هەر حاڵ، بە هۆی تێڕامان و تیۆریداڕێژەرە جۆرەبەجۆرەکانی بەشەکانی فەلسەفەی مۆڕاڵەوە، سەرەتا پێویستمان بە دیاریکردنی ڕاستی و درووستیی چەمکی مۆڕاڵی جێبەجێکاری و جیاکردنەوەی لە بوارە هاوشێوەکانی دەبێت، هەتا لەم ڕێگایەوە لە تێکەڵبوونی لەگەڵ تێگە هاوشێوەکانیدا ڕێگری بکەین و وێنەیەکی ڕوونترمان لەبارەیەوە دەست بکەوێت.

لە پێناسەکردنی مۆڕاڵی جێبەجێکارییشدا قسەوباسی زۆر کراوە؛ هەندێک بە بەکارهێنانی تیۆرییەک لە چارەسەرکردنی مەسەلەیەکدا یان چەند مەسەلەیەکی مۆڕاڵیدا لێکیان داوەتەوە. (اسلامی، ١٣٨٩، ٤٨) پێناسەگەلی دیکەش هەن، کە لە خوارەوە بە شێوەیەکی زیاتر ڕوونیان دەکەینەوە. بە شێوەیەکی گشتی، دەتوانین ئەم پێناسەیەی مۆڕاڵی جێبەجێکاری قبووڵ بکەین، کە پێی وایە "بەکارهێنانی بنەما و پێوەرەکانی بڕیاری گریمانەیی * (بەهاداوەری)ی مۆڕاڵی، کە بنەماکانی بڕیاری گریمانەیی لە (میتا-مۆڕاڵ)*(و پێوەرەکانی بڕیاری گریمانەیی لە مۆڕاڵی

---

* Value judgment

* Meta ethic

دەستووریدا)* دەخرێنە بەر باس و لێکۆڵینەوەوە." (شریفی، ١٣٩٠، ٨٣) سەرەڕای لایەنە چاکەکانی پێناسەی ورد و دیاریکراوی بابەتی لێکۆڵینەوە، پێویستە هەمیشە ئاگاداری مەترسییەک بین، کە لێرەدا خۆی حەشار داوە. واتا نابێت ڕێگە بە پێناسە ورد و درووستەکانی بابەتی بەرباسی لێکۆڵینەوەی مۆڕاڵی بدەین، کە تەنیا لایەنێکی تیۆرییان هەبێت و خۆیان لە واقیعیەت و دیالێکتی شاراوەی ناو بابەتەکان دوور بخەنەوە، چونکە بابەتە مرۆییەکان پێکەوەگرێدراون و لە پانتایی مێژوودا بەردەوام لە ڕووداندان. ئەم کارەش پرۆسەیەکی وەستاو نییە، بەڵکوو بەرەو پێش دەڕوات و لەسەر توێژەری بابەتە مۆڕاڵییەکانیشە، کە لەکاتی توێژینەوەکانیدا ئاگاداری ئەم مەسەلەیە بێت.

مێتا-مۆڕاڵ جیاوازترین بەشی فەلسەفەی مۆڕاڵە و لە بوونناسی، مەعریفەناسی (ئپستمۆلۆژیا) و بەڵگەناسیی مۆڕاڵی پێک هاتووە. سرووش دەباغ لە پێناسەی ئەم سێ بوارەدا دەڵێت: "باسەکە لە گەڕان بە دوای بوون و نەبوونی سیماتەکانی شێوەی مۆڕاڵی* لە شێوەی چاکە، خراپە، دەبێ و نابێ و... لە جیهانی دەوروپشتمان و چۆنیەتیی دەستنیشانکردنیان لە بوونناسیی مۆڕاڵیدا دەست پێ دەکات. جا باسەکانی ڕاستودرۆبوونی بانگەشە مۆڕاڵییەکان لە مەعریفەناسیی مۆڕاڵیدا دەخرێنە بەر باس و دیاریکردنی سەرچاوەکانی

---

* Normative ethic

* Thin more properties

مەعریفەناسیی مۆراڵی و چۆنیەتیی پاساودانی بانگەشە مۆراڵییەکانیش دیسانەوە لە مەعریفەناسیی مۆراڵیدا لێک دەدرێنەوە. جگە لەمانە، دیاریکردنی سنووری ماناکانی تێگە مۆراڵییەکان لە بەڵگەناسیی مۆراڵیدا قسەوباسیان لەبارەوە دەکرێت." (دباغ، ١٣٨٨، ٤-٥)

ئێستا پاش باسکردنی ڕەگەزە پێکهێنەرەکانی مۆراڵی جێبەجێکاری، پێویستە بە شێوەیەکی کورت باس لە چەمکی مۆراڵی جێبەجێکاری بکەین. ئەگەر وەکوو زانا موسڵمانانەکان چەمکی مۆراڵ بە (ئەدەبی مەقام) پێناسە بکەین، ئەو کاتە زۆر بە ئاسانی بۆمان دەر دەکەوێت، کە تەنیا تیۆریی داڕشتن لەبارەی چاکە و خراپە و بنەمای بەهاکانەوە ناتوانن بۆ ژیانی ڕۆژانەمان بەس بن. بۆیە لە کۆی سەردەمە جۆرەجۆرەکانی مێژوودا هەست بە گرنگی و پێویستیی مۆراڵی جێبەجێکاری دەکرێت. هەڵبەت پێویستە ئاماژە بەوەش بکەین، کە فەیلەسووفانی مۆراڵ و ئەو کەسانەی لە بواری مۆراڵی جێبەجێکاریدا کار دەکەن، پێشینەیەکی دووریان بۆ مۆراڵی جێبەجێکاری دەستنیشان کردووە، بۆیە پیتەر سینگەر لە قسەکانیدا لەبارەی مۆراڵی جێبەجێکارییەوە وشەی (زیندووبوونەوە)ی بە کار هێناوە و لەم بارەیەشەوە دەڵێت: من وشەی زیندووبوونەوە بە کار دەهێنم، چونکە مۆراڵی جێبەجێکاری بۆ فەلەسەفە شتێکی نوێ نییە. وتارەکانی دەیڤد هیوم و جۆن ستیوارت میلیش لێرەدا بە شێوەیەکی زۆر گونجاو لە پەنای نووسینەکانی سەردەمی خۆماندا دادەنرێن؛ ئەم

فەیلەسووفانە لە سەدەکانی هەژدە و نۆزدەدا بە قەد ئەمڕۆ مژوولی مۆڕاڵی جێبەجێکاری بوون. تەنانەت دەتوانین زیاتر بۆ دواوە بگەڕێینەوە و چەند نموونەیەکی گرنگیدان بە مۆڕاڵی جێبەجێکاری لە لای فەیلەسووفانی قوتابخانەی ئیسکۆلاستیزم (سەدەکانی ناوەڕاست) بدۆزینەوە، یان لە لای هەر کام لە دوانزدە نووسەرە کلاسیکەکە. فەیلەسووفانی مۆڕاڵ لە پاش پلاتۆن، ڕووبەڕووی چەند مەسەلەیەکی کردارییی وەکوو: خۆکوشتن، ڕەشوڕووتیی منداڵان، چۆنیەتیی هەڵسوکەوتکردن لەگەڵ ژنان و مامەڵەی درووستی دەسەڵاتداراندا بوونەوە. (سەرکەوت،١٣٩٢،٢٤)

بەم پێیە، هەندێک لە توێژەران پێشینە و بەستێنی مێژووییی مۆڕاڵی جێبەجێکاری بۆ سەردەمی کۆن دەگەڕێننەوە و لە مێژووی فەلسەفەشدا هەندێک نموونەی جیاوازیان لەبارەی دەرکەوتنی ئەم فەلسەفەیەوە دۆزیوەتەوە. بۆ نموونە، خاتوو خوزاعی بڕوای وایە: "ڕەتدانەوەکانی سۆکرات لەبارەی سزای ئەو کەسانەوەی شایستە نەبوون، بەرگرییەکانی جۆن لۆک لە تۆلێرانس و قبووڵکردنی ئایینە جیاوازەکان، تێڕوانینی هیوم لەبارەی خۆکوشتنەوە، بەڵگەکاریی کانت لەبارەی نادرووستیی درۆکردنەوە، تەنانەت بە مەبەستی ڕێگری لە کەوتنەوەی زیانێک، بەرگرییەکانی ڕاسڵ لە خۆپیشاندانی خەڵک دژی درووستکردنی چەکی ئەتۆمی، تێڕوانینی بێنتام لەبارەی مافەکانی مرۆڤەوە، بەرگرییەکانی جۆن ستیوارت میل لە یەکسانیی ژنان و پیاوان و دژایەتیی سارتەر لەگەڵ

قەلاچۆکردنی ڕەگەزی لە ڤێتنام، کە هەموو ئەمانە بەڵگەن لەسەر پێشینەی گرنگیدان بەم بوارە." (خزاعی، ١٣٨٩، ١٨)

جگە لە نموونە مێژووییەکان، دەبێت بڵێین ڕووداوەکانی سەدەی بیستەم هۆکارێکی گرنگ بوون بۆ گرنگیدانی زیاتر بە بابەتەکانی مۆڕاڵی جێبەجێکاری، بە ڕادەیەک دەتوانین بڵێین ئەم مۆڕاڵە سەرەنجامی ئەم ڕووداو و کتێبانەیە، کە لەبارەی شیکاری مۆڕاڵیی ئەو ڕووداوانەوە نووسراون. لەبارەی ئەمەشەوە پۆشنگەر لە وتارێکیدا بە ناوی (مۆڕاڵی جێبەجێکاری)یەوە دەڵێت: "لە نیوەی دووەمی دەیەی ١٩٦٠دا گۆڕانکارییەک لە گۆشەنیگاکان و لە چۆنیەتیی کارکردندا هاتە ئاراوە. لەوانەیە فێرخوازان و زانستخوازانی زانکۆکانی ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمەریکا گرنگترین هۆکاری کۆمەلایەتیی دەرکەوتنی مۆڕاڵی جێبەجێکاری بووبن. مەسەلەگەلێکی وەکوو: یاسای شارستانی، مۆڕاڵی سێکسی، مۆڕاڵی جەنگ و مۆڕاڵی زیندەیی بوون بە بابەتە گەرموگوڕەکانی توێژینەوە کۆمەلایەتییەکان و کۆمەڵگەش وردە وردە بۆ بەرەکانی پاریزگاران، توندئاژۆکان، ڕەهاییەکان و ڕێژەییەکان دابەش بوو." (پوشنگر، ١٣٨٣، ١٥١) پاش دووەمین جەنگی جیهانی (١٩٤٥) و کارە قێزەونەکانی پزیشکە نازییەکان لە ڕێگەی تاقیکردنەوەی چەندان جۆر نەخۆشی لەسەر بەندکراوەکانی شەڕ، ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان وەک دەنگی ناڕەزایی هەموو خەڵکی دژایەتی و بێزاریی خۆیان لەم کارانە ڕاگەیاند و دەستیان دایە دادگاییکردنیان، کە بە دادگای نۆرمبێرگ ناسرا. لە

سەروبەندی ئەم ڕووداوانەدا چاوی خەڵکی چووە سەر مۆڕاڵی پزیشکی، کە "لە ئەنجامی ئەم دادگاییەشدا ڕاگەیەنراوی مۆڕاڵی نۆرمبێرگ یان ١٠ بنەماکە هاتە ئاراوە و تا ساڵانی ١٩٥٠ و ١٩٦٠ کاریان پێ دەکرا." لە بواری مۆڕاڵی جەنگیشدا، شەڕی ڤێتنام بووە هۆکارێک بۆ ڕاکێشانی سەرنجی توێژەران لەبارەی مەسەلەکانی مۆڕاڵی جەنگەوە و ئێستاکەش شەڕی ڤێتنام (١٩٦٤) و ئەنجامەکانی لە ئەمەریکادا بوونەتە هۆکاری توێژینەوەی جۆربەجۆری مۆڕاڵی جێبەجێکاری وەکوو: خۆپیشاندانی مەدەنی، ئەرکی هاونیشتمانی بەرانبەر بە ویژدانی خۆی یان کۆمەڵگە، وەکوو دوو سەرچاوەی مۆڕاڵ. ئەمەش بووە هۆی دامەزراندنی ڕێکخراو و میدیای تایبەت بە مەسەلە فەلسەفی و سیاسییەکان." (اسلامی و همکاران، ١٣٨٦، ٥١) یەکێکی دیکە لە هۆکارەکانی گرنگیدان بە مۆڕاڵی جێبەجێکاری بۆ فەزای بیرکردنەوەی لیبراڵی بۆ دەیەکانی ١٩٧٠ و ١٩٨٠ دەگەڕێتەوە، کە بە پێی ئەو فەزایە بنەمای (خۆسەری) گەلاڵەکراو بووە. یەکێک لە خاڵەکانی جیاوازیی نێوان پزیشکی کۆن و تازە، لە بەشی داهاتوودا بە شێوەیەکی کورت لەبارەیەوە دەدوێین.

بە کورتی پێویستە باس لەوە بکەین، کە باسەکانی پێوەندیدار بە پێناساندنی مردن لە ڕوانگەی پزیشکییەوە لە دەیەکانی ١٩٦٠دا خۆی لە خۆیدا ئاماژە بە گرنگیدانە مۆڕاڵییە شاراوەکان دەکات. گۆڕانکارییەکی دیکە کە کاریگەریی زۆر گەورەی بەسەر مۆڕاڵی جێبەجێکارییەوە بە جێ هێشت، (ڕای دادگای باڵای

ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا* بوو لەبارەی لەباربردنی کۆرپەلە لە ساڵی ١٩٧٠). دوای ساڵێک، جۆن ڕاوڵزی فەیلەسووفی سیاسی و تیۆریداڕێژەری بواری دادپەروەری لە سەدەی بیستەمدا لە ڕێگەی بڵاوکردنەوەی کتێبی تیۆرییەک لەبارەی دادپەروەرییەوە* بووە هۆکاری گرنگیدان بە توێژینەوەکانی دادپەروەری لە قانوون و ئابووری و سیاسەتدا.

لە ڕووی بەکارهێنانی تێگەکانیشەوە لە دەیەکانی ١٩٧٠ بە دواوە تێگەکانی مۆراڵی جێبەجێکاری و مۆراڵی کرداری بە کار هاتن. لە کتێبی (مۆراڵی جێبەجێکاری: گرفتەکان و لێکۆڵینەوە نوێیەکان لە مۆراڵی جێبەجێکاریدا) لەم بارەیەوە نووسراوە: (لە دەیەی ١٩٧٠دا ئەو کاتەی فەلسەفەی مۆراڵ گرنگیی بە مەسەلەگەلێک لە بواری مۆراڵی پێشکەوتوو و مەسەلە کۆمەلایەتییەکانی وەک: کوشتنی ڕزگارکاران، مامەڵەکردن لەگەڵ ئاژەلان، ڕەگەزنامە و نەتەوە، سزای لەسێدارەدان، بەرپرسیاریەتیی پاراستنی ژینگە و جیاکاریی پۆزەتیڤ، کە یەکێکە لەو مەسەلانەی فێمێنیستەکان جگە لە باوەڕبوونیان بە جیاوازیی ژن و پیاو، بۆ دەستەبەرکردنی زەمینە و بەستێنێکی لە باری گەشەکردنی توانەکانی ئافرەتانەوە هێنایانە کایەوە.) چەمکەکانی مۆراڵی جێبەجێکاری* و مۆراڵی کردەیی* هاتنە

---

* Supreme Court of the United States
* A theory of Justice
* Applied ethic
* Practical ethic

ئاراوە. (محمد تقی اسلامی و همکاران، ١٣٨٦، ٥١-٥٢) لێرەدا نابێ جیاوازیی نێوان مۆراڵی جێبەجێکاری و مۆراڵی کردەییمان لێ ون ببێت، چونکە مۆراڵی جێبەجێکاری بە پێچەوانەی مۆراڵی کردەییەوە (کە فۆکەسی بە تەواوی لەسەر بابەتە بەشەکییەکانە)، گرنگیش بە بابەتە هەمەکییە فەلسەفی و مۆراڵییەکان دەدات و هەوڵ دەدات بە ئاوێتەکردنی (تیۆری) و (کردار) لە ساتە جیاوازەکاندا دەسگرۆییی مرۆڤەکان بکات. هەرچەندە پیتەر سینگەریان بە دامەزرێنەری مۆراڵی جێبەجێکاری داناوە (کە لە ساڵی ١٩٧٥دا کتێبێکی بە ناونیشانی ئازادیی ئاژەڵ بڵاو کردەوە و بە دەستپێکی خستنەرووی بابەتە مۆراڵییەکان لە بواری مۆراڵی کرداریدا لە قەڵەم دەدرێت)، تێبینیی ئەوە دەکرێت، کە پێش ئەویش، هێنری سیجویک* بە نووسینی پەڕاوی مۆراڵی کردەیی، بۆ ئاوێتەکردنی تیۆریی مۆراڵی و کردار، بە شێوەیەکی ناهۆشیارانە توێژینەوەی پێکدادانە مۆراڵییەکان دەکات، کە دواتر بە مۆراڵی جێبەجێکاری ناسرا.) (خزاعی، ١٣٨٩، ١٩) پاش ئەم کورتەباسەی لەبارەی چەمکی مۆراڵی جێبەجێکارییەوە کرا، هەوڵی خستنەرووی پێناسە باوەکان و سنوورەکانیان بە شێوەیەکی وردتر دەدەن.

---

* Henry sidgwick (١٨٣٨-١٩٠٠)

## پێناسەکانی مۆڕاڵی جێبەجێکاری

گێرت پێی وایە مۆڕاڵی جێبەجێکاری یان مۆڕاڵی کردەیی، هەوڵێکە بۆ جێبەجێکردن، ناوزەدکردن و کارکردن بە بنەما و تیۆرییەکانی مۆڕاڵی هەمەکی لە ژیانی ڕۆژانە و مەسەلە تازەکاندا. (سەرکەوت، ١٣٩٣،٢٦) بەڵام بە پێی پێناسەی باو و تا ڕادەیەک کەموکورتی مۆڕاڵی جێبەجێکاری بە (بەشێک لە مۆڕاڵی نۆرماتیڤ)یان زانیوە، بە واتایەکی دیکە، مۆڕاڵی جێبەجێکارییان بە خودی مۆڕاڵی نۆرماتیڤ لە قەڵەم داوە. (شریفی، ١٣٨٤، ٢٨) بە پێی ئەم پێناسەیە، مۆڕاڵی جێبەجێکاری بەکارهێنانی هەمان ئەو نۆرمانەیە کە مۆڕاڵی نۆرمی لە بەشە پسپۆڕییەکاندا ئەنجامی دەدات. هەڵبەت مەبەست لە بەشە پسپۆڕییەکان لێرەدا تەنیا بابەتە زانستییەکان نییە، بەڵکوو زیاتر مەبەست شێوەی ژیانی ڕۆژانە و هەڵسوکەوتی مرۆڤەکانە. هەر بۆیە سەرەڕای ئەوەی ئەم بەشەی فەلسەفەش وەکوو زۆرێک لە بەشەکانی دیکە، دەکرێ ڕەگوریشەیەکی لە سەردەمانی کۆنەوە بۆ بدۆزرێتەوە، بەڵام سەرەڕای ئەمانەش هەتا کۆتاییی دەیەی ١٩٦٠ هیچ فەیلەسووفێک بە درێژاییی مێژووی فەلسەفەی مۆڕاڵ بەڵگە یان شێوەیەکی بۆ فراوانکردنی مۆڕاڵی جێبەجێکاری بە شێوەیەکی ڕوون و تایبەت نەخستووەتە ڕوو.

هەروەکوو چۆن لە شیکاری چەمکی مۆڕاڵی جێبەجێکاریدا ئاماژەمان پێ دا، دەکرێت ئەم مۆڕاڵە لەگەڵ مۆڕاڵی نۆرماتیڤدا پۆلێنبەندی بکرێت، بەڵام ئەم پێناسە ساکارەی مۆڕاڵی

جێبەجێکاری دەتوانێت مانا ڕاستەکەیمان لێ ون بکات، بۆیە پێویستی بە شیکردنەوەی زیاتر هەیە. لە هەندێک خوێندنەوەدا ئەم مۆڕاڵەیان لە میتا-مۆڕاڵی جیا کردووەتەوە و گشت ڕوویەکی فەلسەفییان لێ دوور خستووەتەوە و خستوویانەتە ڕیزی بوارە بەرتەسکە پیشەییەکان، کار و کەسابەت و بابەتەکانی ژیانی ڕۆژانەوە. جا ئەم کارەش هەمدیسان هەڵەیەکی ترە، چونکە مۆڕاڵی جێبەجێکاری لە مانا نوێیەکەیدا بە شێوەیەک لە شێوەکان هەڵقوڵاوی بێدەسەلاتیی تیۆرییە مۆڕاڵییەکانی بوارە کردەییەکانە.

ڕاستییەکەی گرنگترین ڕەخنەیەک کە لە تیۆرییە مۆڕاڵییەکان دەگیرێت، بریتییە لە لاوازیی ئەو تیۆرییانەی کە لە شێوەی گونجان و جێبەجێکارییاندا لەگەڵ بابەتە نێوبەشەکییەکان لە مانا و ناوەڕۆک خاڵین. ڕەخنە بەناوبانگەکەی فۆرمالیزمی خاڵیی* هێگڵ، کە بە شێوەی گشتی لە تیۆرییە مۆڕاڵییەکان و بە تایبەتی لە تیۆریی مۆڕاڵیی کانت دەیگرت، ئەوەیە کە تیۆرییە مۆڕاڵییەکان ناتوانن لایەنە نێوبەشەکییەکانی کردار لە بەرچاو بگرن. بەو مانایەی لە دۆخە تایبەتەکاندا بە هانامانەوە نایەن و تەنیا باسی پێوەرەکان و بنەما گشتییەکانمان بۆ دەکەن. بۆ نموونە، دەتوانین ئاماژە بە ڕێسا گشتییەکەی کانت بکەین، کە پێی وایە (دەبێت وا ڕەفتار بکەیت، ئاواتەخوازی ئەوە بیت شێوەی هەڵسوکەوتت ببێتە شێوەیەکی باوی ناو کۆمەڵگە.) ئەم ڕێسایە خۆی لە خۆیدا ناوەڕۆک و شێوەیەکی دیاریکراوی نییە.

---

* Empty formalism

هەر ئەم ناکارامەییەی ئەو تیۆرییە مۆڕاڵیانەیە، بووەتە هۆی ئەوەی سەرنجی بوارە بچووکەکانی دیکە و چۆنیەتیی لابردنی دژیەکییە مۆڕاڵییەکانیان بدرێت. دەکرێت مۆڕاڵی جێبەجێکاری لە ڕەهەندی جۆربەجۆرەوە پێناسە بکرێت. بەڵام لەوانەیە باشتر وا بێت سەرەتا بە شێوە نەرێنییەکەی پێناسە بکرێت و بە ڕوونکردنەوەی ڕوخسارە تایبەتەکانی لە سنوورەکانی مۆڕاڵ و فەلسەفەی مۆڕاڵ بگەینە پێناسەیەکی ئەرێنی و درووست.

زۆربەی فەیلەسووفانی مۆڕاڵ، مۆڕاڵی نۆرماتیڤ و میتامۆڕاڵ، مۆڕاڵی جێبەجێکارییان وەکوو بەشێکی فەلسەفەی مۆڕاڵ قبووڵ کردووە، بەڵام چەند بەشێکی دیکەش هەن، کە فەیلەسووفان لە هەمبەر قبووڵکردنیان وەک یەکێک لە بەشەکانی فەلسەفەی مۆڕاڵ، جیاوازییان لە نێواندا هەیە؛ یەکێک لەو بەشانە دەروونناسیی مۆڕاڵییە. (پێک حرفە، ١٣٩٠، ١٩) میتامۆڕاڵ بەستراوەتەوە بە باسەکانی بوونناسی، مەعریفەناسی و بەڵگەناسی و مۆڕاڵی نۆرماتیڤیش سەرقاڵی پێناسەکردنی (دەبێت) و (نابێت)ەکانە، بە شێوەیەکی گشتی، دەتوانین بڵێین مژوولی نۆرمە مۆڕاڵییە گشتییەکانە.

مۆڕاڵی جێبەجێکاری لەم دوو بوارە جیایە و دەتوانین بڵێین ّمۆڕاڵی جێبەجێکاری، بەشێکە لە مۆڕاڵی نۆرماتیڤ، کە گرنگی بە بابەتە ئۆبجێکتڤ/هەستپێکراو و هەندەکییەکان دەدات و هەوڵی توێژینەوە و چارەسەری گرفتە مۆڕاڵییەکان لە گرفتە میتامۆڕاڵییەکان دەدات. لەم ڕووەوە لە تیۆرییە نۆرماتیڤەکان

جیا دەکرێتەوە." (خزاعی، ١٣٨٩، ١٨) لەم سۆنگەیەوە پێویستە مۆراڵی جێبەجێکاری لە مۆراڵی پیشەییش جیا بکەینەوە.

مۆراڵی نۆرماتیڤ لەو جێگایانەدا دێتە مەیدانەوە، کە بەها و نۆرمەکانمان تووشی جیاوازی و جۆرە دژیەکییەک بووبن. ئەم جەختکردنەوەیە لەسەر (دژیەکی و جیاوازی) یەکێکە لە خاڵە جیاوازەکانی مۆراڵی جێبەجێکاری و مۆراڵی پسپۆڕی. لەگەڵ پێشکەوتنی زانستەکان، تەکنەلۆژیا و فراوانبوونی بازنەی چالاکییەکانی پیشە و بوارە کۆمەڵایەتییەکاندا، جیاوازیگەلێک لەنێو بەها و نۆرمەکاندا درووست دەبێت، کە دەرگا بە ڕووی هاتنەکایەی مۆراڵی جێبەجێکاریدا دەکاتەوە.

لە دەلاقەی ئەم باسانەوە، دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە مۆراڵی جێبەجێکاری، تەنیا سەرقاڵی دەستنیشانکردن و بەدەستەوەدانی نۆرمە گشتییەکان نییە، بەڵکوو پێویستی بە توانی لێزانین هەیە بۆ چارەسەرکردنی دژبەیەکیی بەهاکان، کە بە پسپۆڕیەتی* ناو دەبرێت. بە واتایەکی تر، هونەری مۆراڵی پسپۆڕی بە بەراورد لەگەڵ لێزانینی تەکنیککارێک هاوشێوەی سەمای کەسێکی سەماکەرە کە بە پێی ئاوازی مۆسیقاکە خۆی دەجووڵێنێ و دەگونجێنێ. ڕاستییەکەیشی، مۆراڵی جێبەجێکاری "بەکارهێنانی تیۆرییەکی مۆراڵییە لەبارەی مەسەلەیەک یان چەند مەسەلەیەکی مۆراڵییەوە." (سەرکەوت،١٣٩٣،٢٣)

ئێستا کە پێناسە نەرێنییەکە و جیاوازیی مۆراڵی جێبەجێکارمان لە بەشەکانی تر بۆ دەر کەوت، کاتی خۆیەتی

---
* Professionalism

پێناسەیەکی ئەرێنی لەم جۆرە مۆڕاڵە بخەینە ڕوو. دەکرێت پێناسەیەکی سنووردار و دانەیەکی فراوانیش بخەینە ڕوو. لە پێناسە سنوردارەکەدا دەگوترێت: "مۆڕاڵی جێبەجێکاری، بریتییە لە بەکارهێنانی تیۆرییە مۆڕاڵییە هەمەکییەکان لە مەسەلە مۆڕاڵییەکاندا و بە شێوەیەکی بێلایەنانە لە چارەسەرکردنیاندا." پێناسە فراوانەکەشی بریتییە لە "هەر جۆرە بەکارهێنانێکی ڕەخنەییانەی میتۆدە فەلسەفییەکان بۆ هەڵسەنگاندنی بڕیارە کردەییە مۆڕاڵییەکان و ڕووبەڕووبوونەوەی مەسەلەکان، ڕەفتارەکان و سیاسەتە مۆڕاڵییەکان لە پیشەکان، تەکنەلۆجیا و حوکوومەت و... هتد."

توێژەران بڕوایان وایە مۆڕاڵی جێبەجێکاری لە سێ شێوەدا دەر دەکەوێت؛ یەکەم شێوەی دەرکەوتنی بریتییە لە "بەکارهێنانی مۆڕاڵ یان تیۆرییەکی مۆڕاڵی کۆن لە بوارێکی نوێدا." (اسلامی و همکاران، ١٣٨٦، ٦٢). ئەم گۆشەنیگایە بە فێندەمێنتالیزم و میتۆدەکەشی بە بەراوردکاری/قیاسی ناو دەبرێت. گۆشەنیگای دووەم لە سەر لایەنی بەشەکی جەخت دەکاتەوە. ئەم گۆشەنیگایە بە هاووێنەگەرایی (قرینەگرایی) یان بەڵگەکاریی پێوەست بە حاڵەتەکەوە یان بەکارهێنانی شێوازی لێکەڕانی ناو دەبرێت. گۆشەنیگای سێهەم بڕوای بە تێکەڵکردنی نۆرمە گشتییەکان و ئەزموونە بەشەکییەکان هەیە، کە بە سوودوەرگرتن لە جۆن ڕاولز بە هاوسەنگیی بیرمەندانە یان

هاوسەنگیی تێڕامانی* ناو بردووە. شێوەیەکە لە تیۆریی گونجاندن.

کەسێکی وەک برێندا ئالمۆند*یش شێوازی سێهەم بە شێوازی هێگڵی دەچوێنێت کە تێیدا بە پێی پێکهاتە دیالێکتیکییەکە بە تێپەڕبوون لە هەمەکیبوونی ئەبستراکتەوە بۆ بەشەکیبوون و لەوێشەوە دەگەینە تاکایەتی، تاکایەتییش بواری پێکەوەگرێدانی هەمەکی و بەشەکییە یان ناکۆتا و کۆتاهاتوو.

ئەو لەم بارەیەوە دەڵێت: "لەم شێوازەدا چەند لێکچوونێکی شێوازی هێگڵی لە بەڵگەکاریی دیالێکتیکیدا هەن، هەروەها تا ڕادەیەک هاوشێوەی ئەو هاوسەنگییە تێڕامانییەیە کە ژمارەیەک تویژەری هاوچەرخی وەک ڕاوڵز (١٩٧١) باسیان لێوە کردووە. لەم شێوازەدا، ئەو شتانەی کە لە ئەنجامی پەرچەکردارێکدا دەر دەکەون، بە پێی بنەمای تایبەت دەپێورێن؛ ئەمەش دەبێتە هۆی دووبارەپێداچوونەوە بە بینراوەکان و جارێکی دیکە پێشزەمینەکان و هەنگاوە پێشوەختەکانی ڕوودانی ئەو کارانە لێک دەدرێنەوە. بە پێی ئەم تێڕوانینە، مۆراڵی جێبەجێکاری، نە بە تەواوی بەراوردکارییە، نە بە تەنیایش لێکەڕانییە. (آلموند، ١٣٨٦، ٢١٩) گۆشەنیگای یەکەم ڕووبەڕووی ئەم ڕەخنەیە دەبێتە، کە زۆر ئەبستراکت و نەگونجاوە و نۆرمە باوەکانی کۆمەڵگە و دابونەریت و عورفە کۆمەڵایەتییەکان لە پێشچاو ناگرێت. گۆشەنیگای دووەمیش پێی وایە گشت ڕەفتارەکان بە

---

* Reflective equilibrium

* Brenda Almond

پێی گرێبەستێک بە ڕێوە دەچن و بەم هۆیەشەوە ڕێگە لە هەر جۆرە چاکسازییەک دەگرێت. تەنیا لە گۆشەنیگای سێهەمدایە، کە لە نێوان کار و ڕەفتارە هەمەکی و بەشەکییەکاندا جۆرە پێوەندییەک درووست دەکرێت، بۆیە هەوڵی ئەوە دەدات دوو گۆشەنیگاکەی پێشوو پێکەوە گرێ بدات و بە پێی ئەزموونی خۆی لە کەموکورتییەکانی گۆشەنیگاکانی پێش خۆی دوور کەوێتەوە.

لە پێشەوە ئەوەمان ڕوون کردەوە، کە مۆڕاڵی جێبەجێکاری لە ڕووی پێگە و شوێنەوە دەکەوێتە خانەی مۆڕاڵی نۆرمییەوە، بەڵام لەم ڕووەوەش لە مۆڕاڵی نۆرمی جیا دەکرێتەوە، کە تەنیا باس لە نۆرمەکان بە شێوەیەکی گشتی ناکات، بەڵکوو هەوڵ دەدات لە بەر ڕۆشنایی کارە بەشەکییەکاندا ئەو نۆرمانە لێک بداتەوە. مادام مۆڕاڵی جێبەجێکاری گرنگی بە کارە بەشەکییەکانیش دەدات، دەتوانین وەکوو بەشێکی نێوەندگیر لە قەڵەمی بدەین، کە پێوەندیی لەگەڵ کۆمەڵناسی، زانستە سیاسییەکان، مێژوو، یاسا، هونەر، ئەدەب و هاوشێوەکانیدا هەیە، هەوڵ دەدات لە پێوەندیی لەگەڵ هەر یەکێک لەو زانستانەدا مەسەلە مۆڕاڵییەکانی هەڵقولاوی هەر یەکێک لەوانە لێک بداتەوە. بۆ نموونە دەتوانین ئەوە بخەینە ڕوو، کە چۆن مۆڕاڵی جێبەجێکاری لە پێوەندیی لەگەڵ زانستە سیاسییەکاندا شەنوکەوی مەسەلە پێوەستەکانی وەک: هێز، دەسەڵاتدارێتی، بەشەکانی ئازادی، ڕەوایەتیی دەسەڵاتدارێتی و دادپەروەری دەکات، یان لە بواری یاسادا توێژینەوەی مەسەلە مۆڕاڵییەکانی هەڵقولاوی یاساکان دەکات.

هەرچەندە لە کۆتاییەکانی دەیەی ١٩٦٠ و سەرەتاکانی ١٩٧٠دا لەگەڵ دەستپێکی شیکردنەوەی بابەتە نوێیەکانی کۆمەڵگە و مۆڕاڵی پێشکەوتووی وەک: لەباربردنی کۆرپەلە، ئۆتۆنازی، پاراستنی کەرەستە مرۆیی و ئاژەڵییەکان لە توێژینەوەکاندا و

توندڕەویی ڕەگەزی*، لە لایەن فەیلەسووفان و توێژەرانەوە، بوارێکی دیکە لە فەلسەفەی مۆڕاڵ هاتە کایەوە، کە بە مۆڕاڵی جێبەجێکاری یان مۆڕاڵی کردەیی* ناسراوە. (پیک حرفه، ۱۳۹۰، ۱۸) بەلام لە ئێستادا مۆڕاڵی جێبەجێکاری مژوولی بابەتگەلێکی ڕەنگاڵە دەبێت، وەک: مۆڕاڵی ژینگە، مۆڕاڵی بازرگانی، مۆڕاڵی کۆمپیوتەر، مۆڕاڵی پزیشکی، مۆڕاڵی زاوزێ، مۆڕاڵی ڕەگەزی و هاوشێوەکانی. (پوشنگر، ۱۳۸۳، ۱٤۹)

لەگەڵ ئەمەشدا، دەبێت دان بەوەدا بنێین، کە بە هۆی چییەتیی مۆڕاڵی جێبەجێکارییەوە، ناتوانین بوارەکانی چالاکیی ئەم مۆڕاڵە بژمێرین، بەڵکوو هەوڵ دەدەین پۆلێنبەندییەکی گشتی لە مەیدانی چالاکییەکانی مۆڕاڵی جێبەجێکاریدا پێشکەش بکەین. ئەگەر ئەم پۆلێنبەندییەش لە ڕووی بابەتەکانی لێکۆڵینەوەوە بکەین. لە کتێبی مۆڕاڵی جێبەجێکاریدا ئەم مۆڕاڵە بە سەر چوار بەشی سەرەکیدا دابەش کراوە، کە لێرەدا دەیانخەینە ڕوو:

۱. بابەتە کولتووری و ڕۆشنبیرییەکان، کە مۆڕاڵەکانی پێوەست بە پەروەردە و فێرکردن، هەڵسوکەوتەکانی لەگەڵیەکترژیان، دینداری، پێوەندییە سۆزدارییەکان، زانیارییەکان و کۆمپیوتەر، بابەتە زانستییەکان، فێرخوازییەکان، هونەری و میدیاکان، وەرزشی و گەشت و سەیرانەکان، کەیف و خۆشی، مۆڕاڵی فێمینیزم، مەعنەویەت

---

* sexism

* Practical ethics

و مۆڕاڵ، مۆڕاڵەکانی بانگەواز و دوورخستنەوەی خەڵکی لە کاری خراپ؛

٢. بابەتی سیاسی، ئاسایشی و دادگاییەکان: ئەو بابەتانەی لەم بەستێنەدا دەخرێنە ڕوو، بریتین لە مۆڕاڵی هێز، مۆڕاڵی ڕابەرایەتی، مۆڕاڵی نوێنەرایەتی، مۆڕاڵی حیزبیبوون، مۆڕاڵی ئاسایش و دامەزراوەکانی زانیاری، مۆڕاڵی پێوەندییە نێودەوڵەتییەکان و مۆڕاڵی دادوەری؛

٣. بابەتە ئابوورییەکان: لە بواری ئابووری و بابەتە پێوەستەکانیدا، وەکوو مۆڕاڵی بژێوی، مۆڕاڵی بازرگانی، مۆڕاڵی بازاڕ، مۆڕاڵی ئەندازیاری و مۆڕاڵی بەڕێوەبەرییەتی؛

٤. بابەتەکانی پاکژی و سەلامەتیی مرۆڤ، ئاژەڵ و ژینگە: مۆڕاڵی زیندەیی، ژیانی تەندرووست، مۆڕاڵی ژینگە، مۆڕاڵی هەڵسوکەوت لەگەڵ ئاژەلان و... هتد.

دەبێت ئاگاداری ئەوەش بین، کە مۆڕاڵی جێبەجێکاری بەردەوام پەلوپۆی لێ دەبێتەوە و بواری نوێ لەژێر سێبەری خۆیدا کۆ دەکاتەوە. ڕاستییەکەی لە هەر جێگەیەکدا گردبوونەوە و دژبەیەکیی مۆڕاڵی کۆ ببێتەوە، مۆڕاڵی جێبەجێکارییش دەر دەکەوێت. گردبوونەوە و دژبەیەکیی مۆڕاڵی بە شێوەیەکی ڕاست و درووست بریتییە لە: "ڕەفتارێک، کە لە ڕووی مۆڕاڵییەوە ناشیرینە و وازلێهێنانیشی لە لایەکی دیکەوە نادرووستە. لەم کاتەدا تاکی سەوداسەری مۆڕاڵی، هەست بە سەرلێشێواوی دەکات." بۆیە دەبێ مۆڕاڵی جێبەجێکاری بە هانایەوە بێت و بە وردبینییەوە دەستگرۆیی بکات. بۆ

ڕوونکردنەوەی ئەم بابەتە و گرێدانی بە بەشی دواتری نامەکەوە کە تایبەتە بە مۆڕاڵی پزیشکی، نموونەیەک لە بەدەمەوەهاتنی مۆڕاڵی جێبەجێکاری دەخەینە ڕوو.

لەگەڵ پێشکەوتنی زانستە زیندەزانییەکانی پێوەست بە ئادەمیزادەوە، ئاژەڵ و ڕووەکەکان، هەندێک گرفت و دژبەیەکی هاتنە ئاراوە، کە وردە وردە خزانە ناو بواری مۆڕاڵی پزیشکییەوە. مۆڕاڵی پزیشکی لە سەرەتادا تەنیا گرنگیی بە ڕێکخستنی جۆرەکانی پێوەندیی پزیشک و نەخۆش دەدا، بەڵام دوای پێشکەوتنی زانست و بوونی پلەیەکی کۆمەڵایەتی لەناو کۆمەڵگەدا، پێشکەوتنی تەکنەلۆژیای پزیشکی و سەرکەوتنی لە پاراستنی ژیانی نەخۆشەکان، پێی لەم هەنگاوە سەرووتر نا و کەوتە ناو جەنجاڵی و گردبوونەوەی هەمەچەشنەوە، کە بۆ چارەسەرکردنیان، چەند دەستە و گرووپێک لە فەیلەسووفانی مۆڕاڵ، لیژنەکانی پسپۆڕییە پزیشکییەکان و یاسادارێژەرانیش هاتنە مەیدانەکەوە. پاش دووەمین جەنگی جیهانی و ئەو کارەساتانەی پزیشکانی نازی بە هۆی تاقیکردنەوە جۆربەجۆرەکانیانەوە لەبارەی مرۆڤەکانەوە لە شێوەی کەرەستەیەکی تاقیگەییدا دەیانکرد، مشتومڕی ئەم بابەتانە زیاتر پێویستی کرد و هەستیاریی زۆرتری بە دوای خۆیدا هێنا. مرۆڤێک کە زانستی خستبووە ناو چنگییەوە لە جاڕزکەرێکی سەرخۆش کە چەقۆیەکی پێ بێت، مەترسیدارتر بوو و زیاتر لە جاران پێویستی بە مۆڕاڵ بوو. هەرچەندە خۆی دانی بەمەدا نەدەنا، بەڵام کەسانێک وێنەی ڕاچڵەکێنەری داهاتووی ئەو

کارەیان دەبینی و هەوڵیان دا بە درووستکردنی بەربەستی مۆراڵی چالاکییە هەوسارپچڕاوەکانی ئەم بوارە کۆنترۆڵ بکەن.

هاتنەناوەوەی فەیلەسووفانی مۆراڵ، تەنیا لە سنووری بابەتە فەلسەفییەکاندا تایبەت بە مۆراڵی جێبەجێکاری نییە، بەڵکوو هەوڵیان داوە چەند کتێبێک لەم بارەیەوە بنووسن و هاتوونەتە ناو مەیدانەکەوە و هاوکاریی ئەو دامەزراوانەشیان کردووە، کە توێژینەوەی مەیدانییان کردووە.

فەیلەسووفانی مۆراڵ لە گۆشەنیگای جۆربەجۆر و بە پێی ڕوانگەی مۆراڵیی هەمەچەشن توێژینەوەیان لەبارەی مۆراڵی جێبەجێکاری لە بوارە جۆربەجۆرەکاندا کردووە. هەندێک جار ڕێژەگەرایی و هەندێک جاریش هزریخوازی (سەبجێکتیڤ)ی و سوودگەراییان بە ڕێدۆز و ڕێگایەکی ئایینییانە تێکەڵ کردووە. برێکیشیان هەڵوێستێکی سێکۆلارییانەیان وەرگرتووە و لەگەڵ سوودگەراییدا تێکەڵیان کردووە. بۆ نموونە، پیتر سینگەری ئوسترالی و جۆناتان گلۆڤەر*ی فەیلەسووفی ئۆکسفۆرد، لە بواری مۆراڵی پزیشکیدا کتێبی تایبەتیان نووسیوە. ڕ. م. هێر*یش لە کتێبی بیرکردنەوەی مۆراڵیانەدا* تیۆریی پەسنگەرایی گەلاڵە دەکات، کە سوودگەرایی، لەگەڵ گشتاندنی کانتیدا هەلاوێر دەکات. فێمینیستەکانیش بە خستنەڕووی

---

* Jonathan Glover
* R. M. Hare
* Moral Thinking

بابەتەکانی مۆراڵی چاودێر* هەوڵیان داوە کاریگەریی تێڕوانینە سێکسییەکان لە بوارە جێبەجێکارییەکاندا بخەنە ڕوو. جۆن پاسمۆر*ی فەیلەسووفی ئیتاڵیاییش بە تێڕوانینێکی لیبراڵانەوە باسی مۆراڵی زیندەزانیی کردووە. جۆن ڕالزیش، بە تایبەتی لە کتێبی تیۆریی دادپەروەریدا، مانای هاوسەنگیی تێرامانی وەردەگرێت و شوهوودگەرایی و گرێبەستگەرایی لەبارەی تیۆریی دادپەروەرییەوە تێکەڵ دەکات و بە دوای لێکۆڵینەوەی بوارە ئابووری و سیاسییەکانەوە دەبێت. سیسێلا باک*یش لە کتێبی درۆکردن؛ بژاردە مۆراڵییەکان لە ژیانی گشتی و تایبەتیدا* (١٩٧٨) و لە کتێبی نهێنییەکاندا* لەبارەی پێکهاتەی لاستیکیی مەسەلەکانی ژیانی گشتییەوە قسەی کردووە. ماری میجیلی*یش لە کتێبی گیانلەبەر و مرۆڤدا* (١٩٧٨) و لە شوێنی دیکەشدا، پێوەندیی نێوان مرۆڤ و گیانلەبەرەکانی ڕوون کردووەتەوە. ئۆنۆرا ئۆنیل*یش مۆراڵی کانتی بە مەسەلەکانی قاتوقڕی و هەژارییەوە بەستووەتەوە.

---

* Care Ethics/Ethics of Care
* John Passmore
* Sissela Bok
* Lying: Moral Choices in Public and Private Life
* Secrets
* Mary Midgley
* Beast and Man
* Onora Oneil

دەکرێت باسەکانی نێوان کۆمەڵگەگەرایان*و لایەنگرانی ئازادیی تاکەکەسییش لەبارەی مۆراڵی سەرمایەداری و رۆڵی خۆشگوزەرانییەوە وەک بەشێک لە مۆراڵی تاک لە قەڵەم بدرێن. یۆرگن هابەرماسی فەیلەسووفی ئەڵمانی، کە لە تیۆریی رەخنەییدا نێوبانگی هەیە، مانایەک لە کۆدەنگی *بە دەستەوە دەدات: "لەم بارەیەوە لە کتێبی کۆمەڵگەگەرایان و هەڵسەنگاندنی لیبراڵیزمدا کە کۆمەڵەوتارێکی نووسەرانی وەک: سەندل، مەکئینتایەر، تایلۆر و واڵزەرە، بە دووروودرێژی باس کراوە، "کە مەبەستی هابەرماس تیۆرییەکە کە لە کرداردا دەر دەکەوێت و بابەتەکانی دیکەش وەکوو ئاوەزمەندیی پێوەندی و هاوشێوەکانی، دەخرێنە چوارچێوەی بواری کرداری و جێبەجێکارییەوە." (آلموند، ١٣٨٦، ٢٢٥-٢٢٦).

---

* Communitarians
* Consensus

## ئامانج و ئەرکەکانی مۆڕاڵی جێبەجێکاری

مۆڕاڵی جێبەجێکاری هەوڵ دەدات "توێژەر فێری ئەوە بکات کە بە چ شێوەیەک ڕێگاکانی گۆڕینی گرفتێک بۆ مەسەلەیەک بە کار دەهێنێت و لە ڕێگەی تەکنیکەکانی چارەسەرکردنی مەسەلەکانەوە، ئەو دژبەیەکییە سەرەتاییەی لە بنەما مۆڕاڵییەکاندا دەر دەکەوێت، چارەسەر دەکات." (اسلامی و دیگران، ١٣٨٩، ٥٤) مۆڕاڵی جێبەجێکاری چییەتی و تایبەتمەندییەکی وەهای هەیە، کە دەکەوێتە نێوان بەشە جۆربەجۆرەکانەوە و بە هۆی ئەم تایبەتمەندییەشەوە، لەگەڵ بەشەکانی یاسا، زانستە سیاسییەکان، پزیشکی، کۆمەڵناسی، ئەدەبیات، هونەر و زانستەکانی دیکەدا پێوەندییەکی توندوتۆڵی هەیە. لەم ڕووەوە، ئەو کەسەی لە بواری مۆڕاڵی جێبەجێکاریدا توێژینەوە دەکات، لای کەم پێویستە ئاگاداری مۆڕاڵ و بەشە تایبەتییەکەی و مەوداکانی کارکردنی مۆڕاڵ بێت لەو بەشەدا، هەروەها پێویستە سوود لە شارەزایان و کەسانی پسپۆڕی ئەو بەشەش وەربگیرێت.

بۆ نموونە، ئەو کەسەی بە شێوەیەک لە شێوەکان دەیەوێت لەبارەی مەسەلەکانی مۆڕاڵی پزیشکییەوە قسە بکات، پێویستە هەم لە زانست و فەلسەفەی مۆڕاڵدا شارەزا بێت و هەم شارەزاییەکیشی لە زانستی پزیشکی و گۆڕانکارییە ناوەکییەکانیدا هەبێت. پیاوێکی ئایینی بێننە پێشچاوتان، کە دەیەوێت لەبارەی لەباربردنی کۆرپەلەوە فەتوا بدات، بێ گومان

دەبێت هەم شارەزای بابەتە مۆڕاڵییەکانی پێوەست بەم کارەوە بێت و هەم تا ڕادەیەکیش شارەزای بابەتەکانی پێوەست بەم کارەوە لە زانستی پزیشکیدا بێت. بۆ نموونە ئاگاداری پێناسەی زانستی پزیشکی بێت لەبارەی ژیان و مردنەوە، پێوەرەکانی هەڵسەنگاندنی ژیان و هاوشێوەی ئەمانە.

توێژەری بواری مۆڕاڵی جێبەجێکاری سەرقاڵی شەنوکەوکردنی تیۆرییە بنچینەییەکەی مۆڕاڵە، بە تایبەتی ڕێچکەی ڕەسەنایەتیی سوود و قازانج، تیۆریی یاسای لیبڕاڵ، فەلسەفەی مۆڕاڵی فەزیلەتگەرایی، هەروەها لێکدانەوەی تیۆریی بەرپرسیاریەتی و قازانجخوازی لە پێوەندییان لەگەڵ مەسەلە جۆرەبەجۆرەکانی پیشەکان و پێوەندیی مرۆڤەکان لەگەڵ مرۆڤەکانی دیکە: ئاژەڵ، سرووشت و ژینگە...

بە شێوەیەکی گشتی، مۆڕاڵی جێبەجێکاری لەئەستۆگری تاوتوێکردنی بابەتە مۆڕاڵییەکانە لە سێ بواری تایبەتی، گشتی و پیشەییدا. بابەتەکانی ناو چوارچێوەی بوارە تایبەتییەکە بریتین لە: (بابەتەکانی پێوەست بە خێزانەوە، چۆنیەتیی پێوەندیی دۆستانە و ئەندامان لەگەڵ یەکتریدا، چاودێریی بەساڵاچووان و خاوەنپێداویستیی تایبەت، پەروەردەکردنی هەرزەکاران، بە تایبەت ئەو دەمەی لەگەڵ بابەتە مۆڕاڵییەکاندا لێک دەدرێنەوە، هەروەها مەسەلەکانی تایبەت بە مۆڕاڵی تاکەکەسییەوە لە شوێنی کارکردندا.) لە چوارچێوەی بوارە گشتییەکەشدا: (هەڵسەنگاندنی بەرنامەڕێژی بۆ کۆمەڵگە لە بەر ڕۆشنایی پێشکەوتنە تەکنەلۆژییەکانی بواری زیندەپزیشکی، یان

لێکۆڵینەوەی پەیماننامەکان و ئەرکە نێودەوڵەتییەکان لە هەمبەر نەوەکانی داهاتوو بە ڕەچاوکردنی مەسەلە ژینگەییەکان، هەروەها بابەتەکانی کۆمەڵگەی فرەڕەنگ و نەتەوە و شوناسی جیاواز، کە پێوەستن بە مەسەلەکانی جیاوازیی ڕەگەز، لێکتێگەیشتنی کولتووری و بوونی گیانی لێبوردەیی، فراوانتر لەمانەش هەر لە بەستێنی بواری گشتیدا، دەتوانین ئاماژە بە مەسەلەکانی فەلسەفەی سیاسی، وەک تیرۆر و مۆڕاڵی جەنگ بکەین.) (آلموند، ١٣٨٦، ٢١٦) لە بواری مۆڕاڵی پیشەییشدا، گرنگی بە مەسەلە و جەنجاڵییەکانی هەڵقوڵاوی نێو پێوەندیی کرێکار و وەستای پیشە جۆربەجۆرەکان دەدات و هەوڵ دەدات لە بەر ڕۆشنایی بنەما مۆڕاڵییەکانی وەرگیراو لە تیۆرییە مۆڕاڵییەکان، پێگە و ڕەفتارەکان شی بکاتەوە، بۆیە هەندێ جار لە شەنوکەوی بابەتێکی بچووکیشدا زۆر ڕۆ دەچێت، بۆ نموونە: لە مۆڕاڵی پزیشکیدا هێندە دەچێتە خوارێ کە عەودالی زانیارییەکانی ناو تاڵە موویەک و DNAی ناو مووەکەیە، کە چەندان ساڵ لەوەپێش بە جێ ماوە.

لە کۆی ئەمانەدا، دەبێت ئەوە بڵێین، کە مۆڕاڵی جێبەجێکاری خۆی بە پەروەردەکردنی پسپۆڕیی تایبەتەوە سەرقاڵ ناکات و بانگەشەی پسپۆڕیەتی لە بوارە هەمەجۆرەکاندا ناکات، بەڵکوو زیاتر مەبەستی ئەوەیە بە هاوکاریی پسپۆڕەکانی بوارە جۆربەجۆرەکان ڕاگۆڕینەوە بکات و لە دەلاقەی تێڕامانە مۆڕاڵییەکانی خۆیەوە بتوانێت دەستی لە بنیاتنانی سیاسەتەکان و یاسا مۆڕاڵییەکاندا هەبێت. ئەم کارەش لە هەندێک وڵاتدا

کراوه. بۆ نموونه: (ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا کۆمسیۆنێکی سەرۆکایەتیی کۆماریی هەیە، کە ڕاستەوخۆ مەسەلەکانی مۆڕاڵی ژینگەیی بە سەرکۆمار ڕابگەیەنن، لە بەریتانیاش ئەنجوومەنێکی نیشتمانیی مۆڕاڵیی ژینگەیی هەیە، کە لە دەوڵەت جیایە و بە شێوەی سەربەخۆ کار دەکات. هەمدیسان لە فەڕەنساش ئەنجوومەنی میللی فەڕەنسا لەبارەی بابەتە مۆڕاڵییەکانی بواری گشتییەوە کار دەکات. لە ساڵی ١٩٨٥دا ئەنجوومەنی ولاتانی ئەورووپا لیژنەیەکی چەندبواریی لە کۆمەڵێک پسپۆڕی جیاوازی سەر بە ولاتانی یەکیەتیی ئەورووپا پێک هێنا، کە لە ئێستادا بە ئەنجوومەنی بەرپرسی مۆڕاڵی ژینگەیی دەناسرێت.) (آلموند، ١٣٨٦، ٢٢٧) هەروەها دەتوانین ئاماژە بە گرووپی دیکەی هاوشێوەی ئەمانە لە ولاتانی وەک کەنداو، پەرلەمانی ئەورووپا و ناوچەکانی دیکەی جیهان بکەین. لەسەر ئەم ڕێچکەیەش، بەشێکی زۆری ئەو فەیلەسووفانەی لە بواری مۆڕاڵی جێبەجێکاریدا کار دەکەن، لە لایەن دامەزراوە نێودەوڵەتییەکانەوە ئەرکی کۆکردنەوەی داتاکان، ڕێژە و شیکاری ڕاپۆرتەکانیان، تایبەت بە بوارەکانی مۆڕاڵی پزیشکی، نەخۆشییەکانی وەک (ئایدز) مۆڕاڵی ژینگەیی، ژینگە، مەسەلەکانی پێوەست بە پەروەردە و فێرکردن، مردنی ئاسان و چەندان ئەرکی دیکەیان لە ئەستۆدایە و لە ئێستاشدا ئێمە قەرزداری ماندووبوون و زانیارییەکانی ئەوانین.

هەر لەم بارەیەوە، لە هەندێک ولاتدا چەند ڕێکخراوێک دامەزراون، سیمینار و کۆنفرانس ساز دەکەن. سەنتەری

هاستینگز* لە نیۆیۆرک (١٩٦٩) نموونەی ئەم جۆرە ڕێکخراوانەیە. لە کۆتاییی ئەم بەشەدا ئاماژە بە هەندێک گرفت دەکەین، کە دەستەویەخەی مۆڕاڵی جێبەجێکارین. یەکێک لەو ڕەخنانەی لەم مۆڕاڵە دەگیرێت ئەوەیە، کە ئەبستراکت و پەتییە و ناوەرۆکێکی ئەوتۆی نییە. لەم تێگەیشتنەدا مۆڕاڵی جێبەجێکاری، جیاوازیی ئەوتۆی لەگەڵ بوارەکانی دیکەی فەلسەفەی مۆڕاڵدا نییە و هاووێنەی ئەوان تووشی یەکلایەنەڕوانیی فەلسەفییە، کە لەگەڵ بوارە کردەییەکەدا مەودایەکی زۆریان لە نێواندایە. لە بەرانبەردا ژمارەیەک لە ڕەخنەگران دان بەو گۆڕانکارییەدا دەنێن، کە لە مێتامۆڕاڵ و مۆڕاڵی نۆرمیدا ڕووی داوە، بەڵام لە هەمان کاتیشدا دان بەوەدا دەنێن کە ئەم گۆڕانکارییەش کارکرد و سوودێکی ئەوتۆی نییە.

کرێت بایزەر بڕوای وایە: "مۆڕاڵی جێبەجێکاری، مەیدانی فەلسەفەی بە شێوەیەکی دراماتیکی و خراپ شێواندووە؛ بەبێ ئەوەی بتوانێت هیچ وەڵامێکی گونجاو بۆ پرسیارەکانی خۆی لە فەلسەفەی نەریتیدا بدۆزێتەوە. بەڵگەکاریی مۆڕاڵی تایبەتمەندیی گشتیی خۆی لە دەست داوە و ڕووەو پڕاگماتیزم و کردەگەرێتی کەوتووەتە ڕێ." کاس*یش بڕوای وایە: "بەکارهێنانی تیۆرییەکان لە لایەن فەیلەسووفانەوە بووەتە هۆی ئەوەی لایەنە ئۆبجێکتیڤ و دیاردەکان وە لاوە بنرێن و ڕەچاوی بکەرە ڕاستەقینەکانی مۆڕاڵیش نەکەن، چونکە بە بڕوای فەیلەسووفان

---

* Hastings Center

* Kass

هەموو بکەرە مۆڕاڵییەکان کەسانێکی ژیر و خاوەنئاوەزن، کە لە ئانوساتی ڕووبەڕووبوونەوەیان لەگەڵ گرفتەکاندا زۆر بە باشی دەتوانین بە پێی تیۆرییە گشتییەکان حوکمی مۆڕاڵیی کارەکەیان دەستنیشان بکەن." (خزاعی، ١٣٨٩، ٣٩)

یەکێکی دیکە لەو ڕەخنانەی کە پیجامپ و ڕەخنەگراتی تر ئاڕاستەی مۆڕاڵی جێبەجێکارییان کردووە، ئەوەیە کە ئەم مۆڕاڵە هەمان ئەو کارە دەکات، کە بەشە فەلسەفییەکانی تر دەیکەن، بەو مانایەی تێڕوانینی خۆیان وەک بنەمایەک لە قەڵەم دەدەن و بە زۆر بەسەر واقیعدا دەیسەپێنن. بۆیە (کەسانی وەک پیجامپ پێشنیاری ئەوە دەکەن، کە جیاکردنەوەی مۆڕاڵی جێبەجێکاری و مۆڕاڵی تیۆری بە هوشیارییەوە بکرێت.) هەروەها دەکرێت لە ڕوانگەیەکی پۆزەتیڤیستی و ئەزموونگەرایانەوە ئەم ڕەخنەیە ئاڕاستەی مۆڕاڵی جێبەجێکاری بکەین، کە (فەلسەفە لەبارەی مەسەلە جێبەجێکارییە نائاساییەکانەوە شتێکی بۆ وتن پێ نییە.) ئالمۆند بنەمای تیۆریی ئەم بەڵگەکارییە لە سەر دوو کۆڵەکەی فەلسەفەکەی هیوم و تیۆریی بەهەڵەداچوونی سرووشتئامێزانە*ی مۆر* بنیات ناوە و دەڵێت: "ئەم تێڕوانینە لە دوو بەشی بەڵگەکاریی فەلسەفی پێک هاتووە: (یەکەم،) ڕەتدانەوەی هیوم بۆ ئەو بەڵگە پوختە لۆژیکییانەی لە پاش هەڵێنجانی (دەبێ)یەک لە (بوو)یەک دێنە بەرهەم؛ (دووەم،) پاژەی مۆر لەو بارەیەوە، کە ئەگەر بێت و

---

* Naturalistic Fallacy
* Geroge Edward Moore

سیفەتە مۆڕاڵییەکانی لەگەڵ سیفەتە (سرووشتی)یەکان، یان سیفەتە (ئەزموونی)یەکاندا وەک یەک سەیر کردن، ئەوا کەوتنەداوی (بەهەڵەداچوونی سرووشتئامێزانە)یە." (آلموند، ١٣٨٦، ٢١٩) مەک ئەنتایەری فەیلەسووفی چاکەخوازی مۆڕاڵی* هاوچەرخ لەو باوەڕەدایە، کە "مۆڕاڵی جێبەجێکاری لەسەر بنەمایەکی هەڵەیە و تاکە ئەنجامێکی ئەم مۆڕاڵە، ئەوەیە کە پشتگیری هێزی ناوەکیی پیشەکان دەکات. بە بڕوای ئەو، مۆڕاڵی جێبەجێکاری لەسەر کۆمەڵێک ڕێسای نادیار کار دەکات، کە خاوەن پیشەکان بە هۆی وتووێژ لەبارەی ئەو ڕێسایانەوە گەیشتوونەتە جۆرێک کۆدەنگی. ئەمە لە کاتێکدایە ئەم مۆڕاڵە بانگەشەی پشتیوانیی مۆڕاڵی کۆن و نەریتی لە خۆی دەکات، کە مۆڕاڵی کۆن خاوەنی بنەما و ڕێسای تایبەت و ڕوونە." (خزاعی، ١٣٨٩، ٣٧) ئەو لە وتارێکدا بە ناونیشانی (ئایا مۆڕاڵی جێبەجێکاری لەسەر بنەمایەکی هەڵەیە؟) بانگەشەی ئەم ڕەخنەیە دەکات و دەڵێت پێویستە هەموو خاوەنئاوەزەکان لەسەر مۆڕاڵ کۆدەنگییان هەبێت.

بەڵام ڕاستییەکەی ئێمە ئەم جۆرە کۆدەنگییە بەرفراوانە لەبارەی چییەتیی یاسا مۆڕاڵییەکانەوە نابینین، بۆیە چاوەڕوانی ئەوەش دەکرێت، کە ئەم جیاوازییە لە بواری مۆڕاڵی جێبەجێکارییشدا خۆی بنوێنێت، کە لە ئەستۆگری بەکارهێنانی یاسا مۆڕاڵییەکانە بە چەندان جۆر شێوە و نموونەی جۆربەجۆر لە بواری کۆمەڵایەتیدا. بێ گومان بۆ هەندێک مەسەلەش ئەم

---

* Virtue Ethics

شته زۆر به ڕاست دەگەڕێت، بۆ نموونه له بواری مشتومڕەکانی لەباربردنی کۆرپەلەدا.

به وتەی مەک ئەنتایەر ڕێسا مۆڕاڵییەکانی ئێمه ناوەرۆکیان نییه. بۆ نموونه، وەک شتێکی باو له ناوماندا، ئێمه له سەرەتادا و به شێوەیەکی سەربەخۆیانه یاساگەلێک لەبارەی ڕاستگۆییەوە به شێوەیەکی گشتی دادەڕێژین، پاشان به شێوەیەکی جیا له ڕێسا دیبین له چۆنیەتیی جێبەجێکردنی ڕێساکه دەکۆڵینەوە، وەک ڕاستگۆیی نێوان پزیشک و نەخۆشەکەی یان ڕاستگۆیی نێوان یاساناس لەگەڵ سەردانکەرانیدا. بەڵام ناکرێ بەم شێوەیه یاسا مۆڕاڵییەکان به دەست بهێنین؛ ئەو بڕوای وایه یەکێک له ڕێگه و شێوەکانی بەدەستهێنانی یاسا مۆڕاڵییەکان له ئانوساتی کردنی کارەکاندایه. (یاسا مۆڕاڵییەکان تەنیا لەکاتی بەکارهێنانیاندا بوونیان هەیه و مێژووی ڕێسا مۆڕاڵییەکانیش تا ڕادەیەکی زۆر مێژووی گۆڕانکارییانه له بەکارهێناندا. چەمکی مۆڕاڵ، چەمکێکه که به پێی ئەم تێگه بەها مۆڕاڵییەکان له شێوەی دیاردە کۆمەڵایەتییەکاندان، که هەر یەکێکیان مێژووی گەشەسەندن و گۆڕانکاریی تایبەت به خۆیان هەیه، مێژووی فێربوون و شکستی خۆیان هەیه، بەڵام گرفتی تیۆریی مۆڕاڵی جێبەجێکاری لەوەدایه، که بنچینه و بناغەی ئەم مۆڕاڵه لەسەر شته مۆڕاڵییەکان نییه، بەڵکوو لەسەر سیستەم و تیۆرییه مۆڕاڵییەکانه.

ڕاستییەکەی مەک ئەنتایەر ڕەخنەی له هەبوونی کات و مێژووی ڕێسا مۆڕاڵییەکان نییه، بەڵکوو خۆڕاگری و مانەوەیانه

بە درێژاییی کات. بەو مانایەی ڕێسا مۆڕاڵییەکان بە درێژاییی مێژوو شکستیان نەخواردووە و ماونەتەوە و لە تیغی ڕەخنە و مەیدانخوازییەکانیش دەربازیان بووە. ئەنتایەر ئەوەش ڕەت ناکاتەوە کە بناغەی ڕێسا مۆڕاڵییەکان لەنێو مێژووی بەکارهێنانیاندا دەپارێزرێت. هەر بۆیە تێبینیی ئەوە دەکرێت ڕێسا مۆڕاڵییەکان لەکاتی جێبەجێکردندا هەمیشە بۆ دەربازبوونیان بە دەستەواژەی (شتی دیکە) بە کۆتا دەگەیەنرێن و بەمەش ڕێگەیەک بۆ دەرچوونیان لە ساتە تایبەتەکان بە کراوەیی دەهێڵنەوە. ئەنتایەر لەم بارەیەوە دەڵێت: "ئەمە شتێکی ئاساییە، کە لەوانەیە چەندان جۆر حاڵەت بژمێررێت، کە ئەم بنەما مۆڕاڵییانە تێیاندا ڕاست نەبن، بەڵام ئەم حاڵەتە لە کۆتاییدا بە دەستەواژەی (شتی دیکە) کۆتاییان پێ دێت. بۆیە ڕادەی هەڵاوێرەکان لەوانەیە هیچ کاتێک نەتوانێت بە تەواوی ڕوون و دیار بێت." (سەرکەوت،١٢،١٣٩٣-١٤) لە یەک ڕستەدا دەتوانین بڵێین مەک ئەنتایەر بڕوای وایە مۆڕاڵی جێبەجێکاری نە بەو شێوازەیە و نە دەشتوانێت بەو شێوازە بێت کە خۆی بانگەشەی بۆ دەکات.

لە سەدەی هەژدەدا بواری پزیشکی بوو بە چالاکییەکی پسپۆڕانەی پڕ داهات، پزیشکانیش پلەی کۆمەڵایەتیی تایبەت بە خۆیان لە کۆمەڵگەدا بە دەست هێنا. مۆراڵی کلاسیکیی پزیشکی لە بەرانبەر مۆراڵی شیکاریی سەدەکانی دواتر و هاوچەرخدایە، بە شێوەیەک لە شێوەکان سەوداسەری بەرپرسیاریەتییە بنەڕەتییەکانی پزیشکە بەرانبەر بە نەخۆش، کە زیاتر جەخت لە زیاننەگەیاندن بە نەخۆش و سوودوەرنەگرتن و پاراستنی نەخۆش دەکاتەوە. پێوەندیی باوکسالارانەی پزیشک لەگەڵ نەخۆشدا هەتا ناوەڕاستی سەدەی بیستەم وەک نۆرمێکی مۆراڵی لە جیهانی پزیشکیدا ڕۆڵی دەگێڕا، بە ڕادەیەک مۆراڵی پزیشکی کەمتر گرنگیی بە بیروبۆچوونی ئازادانەی نەخۆش داوە. ئەو نۆرمانەی لە مۆراڵی پزیشکیی کلاسیکدا جەختیان لەسەر دەکرایەوە، لەسەر بنەمای سوێندێکی[1] هیپۆکراتیسی

---

١ - دەقی سوێندەکە: "لە بەردەم خوای خۆم، لە بەردەم خانەوادەکەم، مامۆستاکەم و هاوپیشەکانمدا سوێند دەخۆم و بە پێی توانا و بڕیاردانی خۆم، ئەم سوێند و بەڵێننامەیە دەپارێزم. بۆ هەموو ئەو کەسانەی ئەم سوێندەیان لا گرنگە، هەموو ئەو کەسانەی منیان فێری ئەو هونەرە بەنرخە کرد، کە بۆ من وەک دایکوباوک وایە، بە هەمان ڕۆحییەت بۆ پێشکەشکردنی زانیاری لەبارەی هونەری پزیشکییەوە بۆ کەسانی تر.

من بەردەوام دەبم لە هەوڵ و تێکۆشان بۆ دانەبڕانم لە بەرەوپێشچوونەکانی بواری تەندروستی. بۆ هەموو ئەو کەسانەی پێویستیان بە یارمەتیی منە و

چارەسەریان دەکەم و مامەڵەیان لەگەڵدا دەکەم، بە بێ جیاوازی، بە مەرجێک چارەسەری کەسانی تر بکەم بە بێ ئەوەی ڕێککەوتن لە نێوانماندا هەبێت. هەوڵ دەدەم لە بواری پزیشکیدا ڕاوێژ بە کەسانی تر بکەم، بە ئامانجی سوودگەیاندن بە نەخۆشەکەم. من بەردەوام دەبم لەسەر ئەو ڕێگەی چارەسەرکردنانەی کە لە ئاستی توانا و بڕیاردانی خۆمدان، ڕەچاوی ئەم سوودانە دەکەم بۆ نەخۆشەکەم و ڕێگا نادەم بە هیچ شێوەیەک زیانی پێ بگات، من بە هیچ شێوەیەک پشتگیریی ڕەچەتەی دەرمانی کوشندە ناکەم و هیچ بڕێک بۆ هیچ نەخۆشێکم نانووسم، تەنانەت ئەگەر لەسەر داوای نەخۆشەکە خۆیشی بێت. هەروەها بەوپەڕی توانامەوە ڕێزی ژیانی هەموو کەسێک دەگرم، لە سەرەتای دروستبوونیەوە تاوەکوو مردنێکی سرووستی و بۆ پاراستنی ژیانی خەڵکی هەموو لەباربردنێکی ئارەزوومەندانە ڕەت دەکەمەوە. من زانست و هونەرەکەم بە پاکی و پیرۆزی و بەخشندەییەوە بە کار دەهێنم، ژیانم بە سەربەرزی بە سەر دەبەم و کار بە زانست و هونەرەکەم دەکەم. جگە لەو حاڵەتە مەترسیدارانەی پێویستیان بە ڕاستکردنەوە و وردبینی هەیە، من بە هیچ شێوەیەک لێکۆڵینەوە لەو ئەو نەخۆشانە ناکەم کە خۆیان ڕازی نین. هەروەها پێویستە ڕەزامەندی و تێگەیشتن لەبارەی زانستی لێکۆڵینەوەی بابەتەکەوە هەبێت و مەبەست لێی بەهێزکردن و پتەوکردنی تاک بێت. ئەو نەخۆشە لە دۆخێکدا بێت توانای داخڵبوونی هەبێت بۆ نێو لێکۆڵینەوەکە. ئامانجم باشترکردنی تەندروستیی نەخۆشەکە بێت، ڕێگە بە خۆم نادەم هیچ کارێکی خراپ و زیانبەخش بکەم. پێویستە نهێنی و تایبەتمەندیی نەخۆش بپارێزم، ئەگەر حاڵەتەکەی پێوەندیی بە کارەکەمەوە هەبێت یان نا، لە شوێنە گشتییەکاندا چاوپێکەوتنیان لەگەڵ نەکەم و بە درێژاییی ژیانم ئەو نهێنییانە بپارێزم.

بۆ پاراستن و پابەندبوون بەو سوێندەی خواردوومە، هەمیشە هەوڵ دەدەم هیچ سەرپێچییەک لە ژیانمدا نەکەم، هەروەها ئەم سوێندە ببێتە مایەی دڵنیاییم لە جێبەجێکردنی ئەو زانست و هونەرەی کە لەکاتی کارکردنمدا فێری بووم بە پشتیوانیی خوای گەورە، ئەگەر کارکردنم بە پێچەوانەی ئەو

بوو، کە هیچ جۆرە شیکردنەوەیەکی پێویست و گونجاو لە دۆخە نوێیەکەی پێشکەوتنی زانستی پزیشکیی لە لا نەبوو.

لەمڕۆدا مۆراڵە پزیشکییە کلاسیکییەکان بە مۆراڵ لە قەڵەم نادرێن، بەڵکوو زیاتر وەک ئەتەکێتی مامەڵەکردنی مرۆڤەکان لەگەڵ یەکدیدا لە قەڵەم دەدرێن. لەم سۆنگەیەوە، ئەتەکێت* زیاتر هەڵگری (شێوەکانی ڕاوێژکردن، ڕەفتاری گونجاوی پزیشک لەگەڵ نەخۆشەکان و کەسانی تردا، تێڕوانینی گونجاو بۆ پسپۆڕانی پزیشکی، هەروەها چوارچێوەیەک بۆ بانگەشەی بواری پزیشکی و...هتد)ن.

ماوەی دوای دووەمین جەنگی جیهانی بە خاڵی وەرچەرخان لە پێشکەوتنی مۆراڵی پزیشکیدا لە قەڵەم دەدرێت. لەم ماوەیەدا هۆکارگەلێک بوونە هۆی درووستکردنی گۆڕانکاری لە مۆراڵی پزیشکیدا؛ وەک تاوانەکانی پزیشکانی نازی، گۆڕانکاری لە تێڕوانی کۆمەڵگەکان و گرنگیدان بە تاککەرایی، بڕوابوون بە مافی ئازادی و سەربەخۆیی لە بڕیارداندا، جەختکردنەوە لەسەر مافەکان و دیاریکردنی چارەنووسی خۆیی، فرەکولتووریی کۆمەڵگەکان و هەندێ شتی دیکە... لە لایەکی دیکەشەوە، پێشکەوتنەکانی زانستی پزیشکی وەک ڕۆڵی ئەم زانستە لە بەرزکردنەوەی ئاستی تەمەن لە ڕێگەی تەکنەلۆژیای نوێوە،

---

سوێندەوە بێت کە خواردوومە، ئەوا ئامادەم لە بەردەم خوای گەورە و هاوپیشەکانم و خانەوادەکەم و کۆمەڵگەکەمدا، لێپێچینەوەم لەگەڵدا بکرێت و سزا بدرێم.

* Etiquette

دەستکاریکردن لە شێوەکانی دووگیانی و زاوزێ، پیتاندنی دەستکرد و کارەکانی پێوەست بەو جۆرە پیتاندنەوە، پیشکەوتنەکانی زانستی بۆماوەیی و هەستکردن بە هەنگاونان لە مۆڕاڵی کلاسیکەوە بۆ مۆڕاڵی شیکاریی پزیشکی، هەموو ئەمانە ڕۆڵیان لە ڕوودانی ئەو وەرچەرخانەدا هەبوو.

بۆیە مۆڕاڵی پزیشکی لە ئێستادا ئیدی تایبەت نییە بە پزیشکەکان، هەروەک کەندییش دەڵێت: مۆڕاڵی پزیشکی لەمڕۆدا "بەشێکە لەو سیستەمە مۆڕاڵییە گەردوونییەی کە ئێمە ڕۆژ لەدوای ڕۆژ لە کردەوەکانماندا" ڕەنگ دەداتەوە و لەگەڵیدا دەژین.

لە سێیەمین کۆڕبەندیی جیهانیی پزیشکیدا، کە لە ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩٤٩دا لە لەندەن بەسترا، یاساگەلێک بە ناوی "یاسا نێودەوڵەتییەکانی مۆڕاڵی پزیشکی"یەوە پەسەند کران، کە ئاماژە بە دوو جۆری ئەرکی سەرشانی پزیشکان دەکەن. یەکێکیان، ئەرکە گشتییەکانن؛ ئەوی دیکەشیان ئەرکە تایبەتییەکانی پزیشکە بەرانبەر بە نەخۆشەکان. هەر یەکێک لەمانە تێبینیی مۆڕاڵی تایبەت بە خۆیان لەسەرە، کە دەبنە هۆی ڕێکوپێککردنی یاسا مۆڕاڵییەکانی پیشەی پزیشکی. بۆ نموونە، لە بەشی ئەرکە گشتییەکاندا باس لەوە دەکرێت، کە "نابێت هیچ کاتێک پزیشک کارە پزیشکییەکان بۆ سوود و قازانجی تاکەکەسیی خۆی جێبەجێ بکات." (جعفری، ١٣٨٦، ٨)

بۆیە لەم پێناوەدا هەر جۆرە پرۆپاگەندەیەکی نایاسایی، قۆرغکاریی زیانهێن بۆ پیشەی پزیشکی، وەرگرتنی حەقدەستی

که لەگەڵ ئەو کارەدا نەیەتەوە و... هتد،

بارەی چۆنیەتیی پێوەندیی پزیشکییشەوە

، خۆیدا، دەتوانین ئاماژە بە پاراستنی نهێنیی

لەخۆبووردەیی پزیشک لەپێناو چارەسەری

انی هەموو ئامێر و توانەکانی، ڕەچاوکردنی

ە بەرانبەر پزیشکانی دیکە و دوورکەوتنەوە

ودمەندی پزیشکانی دیکە،) ڕێنماییکردنی

لای پزیشکی شارەزا لەکاتی کەمتواناییی

چارەسەرکردنی نەخۆشییەکەدا و... هتد.

## پێناسەکانی مۆڕاڵی پزیشکی

لەم سالآنەی دواییدا، مۆڕاڵی پزیشکیی نوێ گۆڕانکاریی گەورەی بە خۆیەوە بینیوە، کە لە مۆڕاڵی پزیشکیی کۆن جیای دەکاتەوە. مۆڕاڵی نوێ هەوڵ دەدات بابەتە مۆڕاڵییەکان بە شێوەیەکی جێبەجێکاری لە مەیدانی کارکردنی پزیشکەکان و تیمی پزیشکی و بڕیاردانە مۆڕاڵییەکانی ناو بواری پزیشکیدا جێ بکاتەوە. بەم پێیە، ئیدی مۆڕاڵی پزیشکی، تەنیا ژماردنی ڕەوشتە مۆڕاڵییە گونجاوەکانی پزیشکەکان، یان شێوازی مامەڵەکردنی پزیشک لەگەڵ نەخۆشدا نییە، تەنانەت نووسین و ڕێکخستنی یاسا پێشکەوتووەکانی شێوازی ڕەفتار و ڕەوێڵی پزیشکەکان نییە لە بواری پزیشکایەتی و تەنیا باسی دیوە ئایینییەکان و هەستە مرۆییەکان ناکات.

چەندان پێناسە بۆ مۆڕاڵی پزیشکی خراونەتە ڕوو، بە پێی یەکێک لەو پێناسانە مۆڕاڵی پزیشکی،* بریتییە لە بەشێکی جێبەجێکاری لە مۆڕاڵ یان فەلسەفەی مۆڕاڵ، کە هەوڵ دەدات لەبەر ڕۆشنایی شیکارێکی فەلسەفیانەدا، ڕاست و هەڵە لە بواری کارکردە پزیشکییەکان و چاودێریکردنی تەندرووستانەدا

---

* Medical Ethics

زۆر بە شێوەیەک کە لەگەڵ ئەو کارەدا نەیەتەوە و... هتد، قەدەغە کراوە. لەبارەی چۆنیەتیی پێوەندیی پزیشکییشەوە لەگەڵ نەخۆشەکانی خۆیدا، دەتوانین ئاماژە بە پاراستنی نهێنیی نەخۆشەکان بکەین. لەخۆبووردەیی پزیشک لەپێناو چارەسەری نەخۆش و بەکارهێنانی هەموو ئامێر و توانەکانی، ڕەچاوکردنی ڕێسا مۆڕاڵییەکان لە بەرانبەر پزیشکانی دیکە و دوورکەوتنەوە لە (ڕاکێشانی ناسوودمەندی پزیشکانی دیکە،) ڕێنماییکردنی نەخۆش بۆ چوونە لای پزیشکی شارەزا لەکاتی کەمتوانایی پزیشکەکە خۆی لە چارەسەرکردنی نەخۆشییەکەدا و... هتد.

## پێناسەکانی مۆڕاڵی پزیشکی

لەم ساڵانەی دواییدا، مۆڕاڵی پزیشکیی نوێ گۆڕانکاریی گەورەی بە خۆیەوە بینیوە، کە لە مۆڕاڵی پزیشکیی کۆن جیای دەکاتەوە. مۆڕاڵی نوێ هەوڵ دەدات بابەتە مۆڕاڵییەکان بە شێوەیەکی جێبەجێکاری لە مەیدانی کارکردنی پزیشکەکان و تیمی پزیشکی و بڕیاردانە مۆڕاڵییەکانی ناو بواری پزیشکیدا جێ بکاتەوە. بەم پێیە، ئیدی مۆڕاڵی پزیشکی، تەنیا ژماردنی ڕەوشتە مۆڕاڵییە گونجاوەکانی پزیشکەکان، یان شێوازی مامەڵەکردنی پزیشک لەگەڵ نەخۆشدا نییە، تەنانەت نووسین و ڕێکخستنی یاسا پیشکەوتووەکانی شێوازی ڕەفتار و ڕەوێڵی پزیشکەکان نییە لە بواری پزیشکایەتی و تەنیا باسی دیوە ئایینییەکان و هەستە مرۆییەکان ناکات.

چەندان پێناسە بۆ مۆڕاڵی پزیشکی خراونەتە ڕوو، بە پێی یەکێک لەو پێناسانە مۆڕاڵی پزیشکی،* بریتییە لە بەشێکی جێبەجێکاری لە مۆڕاڵ یان فەلسەفەی مۆڕاڵ، کە هەوڵ دەدات لەبەر ڕۆشنایی شیکارێکی فەلسەفیانەدا، ڕاست و هەڵە لە بواری کارکردە پزیشکییەکان و چاودێریکردنی تەندرووستانەدا

---

* Medical Ethics

ڕوون بکاتەوە. بە واتایەکی ڕوونتر، مۆڕاڵی پزیشکی مۆڕاڵێکە لە مەیدانی کاری پزیشکیدا."

بە پێی پێناسەیەکی نوێی تر: "مۆڕاڵی پزیشکی چالاکییەکی شیکارانەیە کە بە پێی ئەو شیکارییە بیرکردنەوەکان، بیروباوەڕەکان، پابەندبوونە کۆمەڵایەتییەکان، شێوەکانی ڕەفتار، هەست و نەستەکان و بەڵگەهێنانەوەکان لە کاتە جیاوازەکانی بڕیاردانی مۆڕاڵی لە پزیشکیدا لە شێوەی ڕێکارێکدا بڵاو دەکرێنەوە." (لاریجانی، ١٣٨٣، ١٧)

هەندێ جاریش مۆڕاڵی پزیشکییان تەنیا بە لەبەرچاوگرتنی چۆنیەتیی بڕیاردان لە پرۆسەی چارەسەرکردندا پێناسە کردووە و وتوویانە: (مۆڕاڵی پزیشکی ڕێکاری بەڵگەهێنانەوەی مۆڕاڵییە بۆ بڕیاردانی پزیشکی.) بڕیاردانی مۆڕاڵی پزیشکی لە مەیدانی پزیشکیدا، شتە بەڵگەنەویست و بەهاکان، باش و خراپ، ڕاست و ناڕاست و کردنی ئەو کارەی پێویست دەکات، بۆمان دیاری دەکات. لە شوێنێکی تردا بەم شێوەیە ناساندوویانە، کە "مۆڕاڵی پزیشکی لقێکی جێبەجێکارییە لە مۆڕاڵ یان فەلسەفەی مۆڕاڵدا، کە هەوڵ دەدات لە بەر ڕۆشنایی شیکارە فەلسەفییەکاندا، شتە ڕاست و ناڕاستەکان لە ئانوساتی جێبەجێکردنی کارە پزیشکییەکان و چاودێریکردنی تەندرووستانەدا لێکدی جیا بکاتەوە."

هەندێ کەس لە بواری پزیشکیی کلینیکیدا سنوورداریان کردووە و وتوویانە: "مۆڕاڵی پزیشکیی کلینیکی، گۆشەنیگا و تێڕوانینێکی تایبەت لە بواری کرداری پزیشکیدا درووست

دەکات، کە ئامانجی باشترکردنی پرۆسەی چاودێریکردنی نەخۆشە لە ڕێگەی ناسین، شیکردنەوە و چارەسەرکردنی گرفتە مۆراڵییەکانەوە کە لەکاتی جێبەجێکردنی لایەنە پزیشکییەکاندا دەر دەکەون. مۆراڵی کلینیکی زاراوەیەکی پزیشکییە، کە ڕێکارە ڕێکخراوەکان بۆ یارمەتیدانی پزیشک لە شیکاری و شیکردنەوەی مەسەلە مۆراڵییەکان لە پزیشکی کلینیکیدا فەراهەم دەهێنێت." (هەمان سەرچاوە، ٢٠-١٩)

پێناسەیەکی گشتگیرتری مۆراڵی پزیشکی ئەوەیە کە تەنیا باس لە بابەتە کلینیکییەکان ناکات، بەڵکوو جەخت لەسەر هەر جۆرە فۆرمێکی پێوەندیی نێوان پزیشک و نەخۆش، پزیشک و هاوکارەکانی خۆی و پزیشک و چۆنیەتیی مامەڵەکردنی لەگەڵ نەخۆشییەکان دەکاتەوە. لێرەدا ئاماژە بەوە دەکرێت، کە مۆراڵی پزیشکی زۆر جار هەڵگری بەرپرسیاریەتیی گەڕانە بە دوای وەڵامگەلێکی مۆراڵی کە شیاوی قبووڵ بن و بەڵگەی پێویستیان بۆی هەبێت، بۆ ئەو کاتانەی سەوداسەرییەکان و بەرژەوەندییە لەپێشینەکان دژبەیەکییان لە نێودا درووست ببێت. لێرەدا لەوانەیە مۆراڵی پزیشکی بەو پرۆسەیەوە پێوەست بێت کە بڕیارێکی لێ بە دەست بێت، بە هەمان شێوە کە پێوەندیی بە خودی بڕیارەکەوە هەیە، تەنانەت لەو کاتانەشدا کە بنەما و نۆرمە مۆراڵییە پەسەندکراوەکان هاوشێوەی یاساگەلێکی مۆراڵیی نووسراو یان ڕێبەری چالاکییە چاکەکان لە قەڵەم دەدرێن. کێشەکانی پێوەست بە کارە تەندرووستییەکانیشەوە

زیاتر پێوەندییان بە هەڵێنجانی ڕێسا گشتییەکانەوە هەیە بۆ دۆخە ڕیزپەڕەکان.

لە کۆی ئەم قسانەدا، دەتوانین بڵێین مۆڕاڵی پزیشکی، بابەتێکی بەرفراوانە کە دوو لایەنی تیۆری و کردەیی هەیە. لایەنە تیۆرییەکەی مۆڕاڵی پزیشکی لە خەمی شیکردنەوەی بنەما و تێگە بنیاتنەرەکانی ئەم زانستەیە، هەروەها شیکردنەوە و توێکاریی تیۆرییە مۆڕاڵییەکان و پێوەندییان لەگەڵ کولتوورەکان، ئایینزا و دابونەریتە جۆرەبەجۆرەکانی کۆمەڵگەکاندا، بەڵام لایەنە کردەییەکەی بە پشتبەستن بە بنەما تیۆرییەکان باس لە مەسەلە و گرفتەکان و بابەتە بەردیدە مۆڕاڵییەکان دەکات، لە چوارچێوەی کاری پزیشکی و چاودێریکردنی تەندرووستانەدا و چوارچێوەیەکی کردەییی گونجاویش بۆ چۆنیەتیی بڕیاردان لە دۆخە قەیرانییەکاندا دەخاتە ڕوو. لەم پێناسەیەدا، مۆڕاڵی پزیشکی پێوەندییەکی توندوتۆڵی لەگەڵ فەلسەفەی مۆڕاڵ، مافە مرۆییەکانی تاک و کۆمەڵگە و ڕێسا شارستانییەکاندا هەیە.

کە واتە گرنگترین جیاوازیی نێوان مۆڕاڵی پزیشکی کلاسیک و نوێ، یەکێکە لەو بابەتانەی کە پانتاییەکی بەرفراوانی لە ناو کایەی مۆڕاڵی نوێدایە. ئەمەش وای کردووە گفتوگۆیەکی زۆری لەبارەوە بکرێت. پێش ئەوەی بچینە ناو شیکارکردنی بوارەکانی مۆڕاڵی پزیشکی، پێویستە چوار بنەماکەی مۆڕاڵی پزیشکی نوێ، کە ڕێبەر و ڕێنیشاندەری کاری پزیشکانن، بخەینە ڕوو.

## چوار بنەماکەی مۆڕاڵی پزیشکی

بە پێی ئەو گۆڕانگارییە سیاسی، کۆمەڵایەتی و تەکنەلۆژییە پزیشکییانەی لە سەردەمی نوێدا هاتوونەتە کایەوە، بۆ یەکەمین جار (جەیمز چیلدرس و تۆم بیۆچامپ، بنەماکانی مۆڕاڵی پزیشکیی نوێیان نووسییەوە، کە ئێستا زۆربەی وڵاتان جێبەجێیان دەکەن.) بە پێی ئەم بنەمایانە، پزیشک لە هەر کۆمەڵگە و کولتوورێکدا بێت، دەبێت ڕەچاوی ئەم بنەمایانە بکات و لە سێبەری ئەوانەدا تیماری نەخۆشەکەی بکات؛ ئەو بنەمایانەش بریتین لە:

١. بنەمای ڕێزگرتن لە سەربەخۆیی* نەخۆش لە بڕیارداندا؛
٢. بنەمای پێشکەشکردنی خزمەتگوزاریی چاک و سوودمەند (بنەمای سوودمەندبوون؛)
٣. بنەمای ڕێگریکردن لە زیان (بنەمای زیاننەگەیاندن؛)
٤. بنەمای دادپەروەری.

---

* Autonomy

## بنەمای سەربەخۆییی نەخۆش لە بڕیارداندا

هەندێک کەس ئەم بنەمای سەربەخۆبوون و ڕێزگرتن لە بڕیاری (نەخۆش)ەیان بە شێوەیەکی هەڵە لێک داوەتەوە و پێیان وایە ئەو مانایە دەگەیەنێت کە دەڵێت: (چیمان بۆ خۆمان پێ خۆشە، بۆ خەڵکیش ئەوەمان پێ خۆش بێت.) لە کاتێکدا ڕێزگرتن لە سەربەخۆییی نەخۆش بە مانای ڕێزگرتن لە بڕیاری خودی نەخۆشەکە دێت. لەوانەیە لە حاڵەتێکدا، بە هۆی نەبوونی بیروباوەڕێکی ئایینییەوە، پزیشکێک لەباربردنی کۆرپەلە بە درووست بزانێت، بەڵام ئافرەتە دووگیانەکە لە ڕوانگەی بیروباوەڕی ئایینییەوە بە کارێکی نەشیاوی بزانێت، بۆیە لێرەدا ناتوانین بنەمای سەربەخۆبوونی نەخۆش لە بڕیارداندا لەگەڵ (ئەوەی بۆ خۆت پێت خۆشە، بۆ ئەوانی دیکەش پێت خۆش بێت.) گوزارشت لێوە بکەین.

مەسەلەی سەربەخۆبوونی نەخۆش تەنیا ڕێزگرتن لە ڕای نەخۆش نییە، بەڵکوو ئەم بابەتە پانتاییەکی فراوان و تێبینیی پێوەست بە کاری پزیشکی لە خۆ دەگرێت. لەگەڵ پێشکەوتنی لایەنی ئابووری و زانستی پزیشکیدا، هەروەها پێشکەوتنی کۆمەڵگەش، بوونە هۆکارێک کە بنەما کلاسیکییەکانی مۆڕاڵی پزیشکی گۆڕانکارییان بەسەردا بێت، بە شێوەیەک وەڵامی پێویستییەکانی سەردەمیان بە تەواوی نەدەدایەوە. هەر بۆیە کەسێکی وەک ئەی. هاڤی مۆریەم* پێی وایە: "لەوانەیە بەهێزترین بەڵگەی سەرهەڵدانی گۆڕانکاری لە ئابووریی

---

* E. Haavi Morreim

پزیشکیدا ئەوە بێت، کە جگە لە ڕێکوپێککردنی بوارە ماددییەکانی پزیشکی، پێویستمان بە دووبارە-لێکدانەوە و داڕشتنەوەی بڕێکی زۆر لەو بنەمایانەیە، کە هەر لە کۆنەوە بە شێوەیەکی فراوان بڕوامان پێیان هەبووە. لە سەرەتادا وا دێتە بەرچاو، کە ئەرکەکانی پزیشک لەو دڵسۆزییەوە*سەرچاوە دەگرێت، کە نەخۆشی، مرۆڤەکە تووشی زیان و ئازار دەکات. نەخۆشی، تێکچوون، بێئاگایی و لەنگی لە هاوسەنگی هێز و توانا لە پێوەندیی نێوان پزیشک و نەخۆشدا، دەبنە هۆی هاتنەکایەی بەرپرسیاریەتییەکی توندوتۆڵی بە ئەمەکانە و دڵسۆزانەی کەسی و پیشەیی پزیشک.

بەڵام پاش سەرهەڵدانی پێشکەوتنی نوێ لە زانستی پزیشکی و هاتنەکایەی مۆراڵی زیندەییدا، تێڕوانینی کۆن لە لایەن سەربەخۆبوونی نەخۆش لە بڕیارداندا بە تەواوی گۆڕانکاریی بەسەردا هات و کامڵ کرا. لە تێڕوانینی مۆراڵی پزیشکیی نوێدا، بە پێچەوانەی پێوەندیی باوکسالارانەی پزیشکەوە لەگەڵ نەخۆشدا لە مۆراڵی پزیشکیی کۆندا، جەخت لە سەر بڕیاردانی سەربەخۆیانەی نەخۆشە خاوەنئاوەزەکان لە چۆنیەتیی وەرگرتنی چارەسەرەکانیان دەکاتەوە. لە کاتێکدا لە پزیشکیی کۆندا تەنیا پزیشکەکە بەرژەوەندیی ئایندەی نەخۆشەکەی دیاری دەکرد و چارەسەری دەکرد.

لە مۆراڵی زیندەیی و پزیشکیی نوێدا، دڵسۆزی، پشتبەستوو بە سەربەخۆبوونی نەخۆش، لەسەر شانی پزیشکی فەرز دەکات

---

* fidelity

کە بە پێی بیروڕای نەخۆشەکە بەرژەوەندییەکانی دەستەبەر بکات. مۆراڵی پزیشکیی نوێ لە هەوڵی ئەوەدایە سەربەخۆبوونی نەخۆش بە پێی ئازادی پێناسە بکات و لەم دەلاقەیەوە هەم ئازادیی دەروونی و هەم ئازادیی دەرەوەی نەخۆش مسۆگەر بکات. ئەمەش یەکێکی ترە لە جیاوازییەکانی مۆراڵی پزیشکیی نوێ و مۆراڵی پزیشکیی کۆن، کە لە کۆندا پزیشکی هەوڵی دەدا بە پێی تێڕوانینی ئەرەستۆیی لەپێناو خۆشبەختیی ئەودا کارەکە بکات، کە بە بڕوای خۆی لە بەرژەوەندیی نەخۆشدایە و خۆشبەختیی بۆ فەراهەم دەهێنێت. (سەرکەوت، ١٣٩٣، ٥٣)

بەڵام ئێستاکە پزیشکەکان ئازادیی نەخۆش وەک شتێکی بەهاداری بێ مەرج* لە قەڵەم دەدەن و بە پێی ئەوەش بڕیاری چارەسەرکردنی نەخۆشەکە دەدەن. ئەم تێگەیشتنە لە ئازادیی نیشاندەری پاشخانە فیکرییەکانی مۆراڵی نوێیە لە ئەورووپا و ئەمەریکادا، کە تێیدا لەسەر بەهاکانی وەک تاکیەتی، مافەکان، ئەرک*، سەربەخۆیی، ژیانی تاکەکەس و... هتد جەخت

---

* Categorical

*ئەرک لای کانت بە هیچ شێوەیەک ئەرکێکی دەرەکی نییە کە پێوەندیی بە ڕووداوێک یان دۆخێکی کۆمەڵایەتی یان سایکۆلۆژیاوە هەبێت، چونکە ئەوەی لەو دۆخانەدا دەکرێت، ناچێتە چوارچێوەی ئەرکەوە، بەڵکوو پێداویستییەک یان دەسپێکی سایکۆلۆژی و کۆمەڵایەتییە، مرۆڤ بە کردنی ناچار دەکات. جێبەجێکردنیشی لە خۆیدا بۆ خۆی نییە، بەڵکوو لەپێناو ئامانجێکی دیکەی دیاریکراودایە و بەمەش ئەو کردەیەی لە دۆخە کۆمەڵایەتییەکەدا وەک ئەرک نیشان

دەکرێتەوە، لەوانەشە بناغەی ئەم تێگەیشتن و تێڕوانینە لە مۆڕاڵی (کانت)یدا بدۆزینەوە.

مەبەست لە ئازادیی دەروونی، بایەخدانە بە بیروباوەڕ و تێڕوانینە جیاوازەکانی نەخۆشەکان. ئەرکی سەرشانی پزیشکەکان ئەوەیە کە هاوکاریی نەخۆشەکان بکەن بۆ ئەوەی بەسەر لایەنە سۆزدارییەکانیاندا زاڵ بن و بتوانن بڕیارێکی ڕوون و درووست لەبارەی چۆنیەتیی چارەسەرکردنی نەخۆشییەکانەوە بدەن. بەڵام هێنانەدیی ئەم کارە گرنگە، پێویست بەوە دەکات پزیشکەکان لەکاتی بڕیارداندا نەخۆشەکان لە دڵەخورپەی تێچوونە پزیشکی و دەرمانییەکان ڕزگار بکەن. ئەگەر بێت و نەخۆشەکە بە هۆی بارودۆخی ئابوورییەوە بژێرەکانی خۆی کەم بکاتەوە، یان بڕیارەکەی بگۆڕێت، ئەمە لە خۆیدا نیشانەی سنووردارکردنی ئازادییە و لێرەشدا پێشێلی بنەمای سەربەخۆبوونی نەخۆش لە بڕیارداندا دەکرێت. (تەنانەت وێنا و تێڕوانینی ئێمە لە سەربەخۆبوونی نەخۆش وەک ئازادییەکی تاکەکەسی ئەوەمان پێشان دەدات، کە دەبێت

---

دەدرێت، ئەرک نییە و ناچارییەکی دەرەکییە کە مرۆڤ دەبێت بیکات. بەڵام ئەمە بە مانای جیهانیی ئەرک نایەت، چونکە ئەرک کاتێک گوێ لە داخوازیی عەقڵ گیراوە بەوەی کردەیەکی فەرمانی لە ئارادایە و داوای جێبەجێکردنی دەکرێت بەبێ ئەوەی بیر لە هیچ ئەنجامێکی دیکە یان هیچ جۆرە بەرژەوەندییەک لە کردنیدا بکرێتەوە. کاتێک کردە بەم جۆرە کرا، ئەو کاتە دەتوانرێت بگوترێت ئەرکێکی ئاکاری جێبەجێ کراوە.

نەخۆشەکان لە دەست ئەو هۆکارە کۆمەڵایەتییانەش ڕزگاریان بێت، کە بە شێوەیەکی نەخوازراو هەڕەشە لە بڕیارەکانیان دەکەن.)

لە زۆر حاڵەتدا تێبینیی ئەوە کراوە، کە نەخۆشەکان لە ترسی لەدەستدانی کارەکەیان یاخود زیادبوونی تێچوونی نەخۆشخانەکان، کە بیمەکان لە ئەستۆیان ناگرن، خوازیاری دەرچوونی پێشوەختەن لە نەخۆشخانە، بۆیە جەختکردنەوەی پەتی و ڕووت لەسەر ئازادی لەکاتی بڕیارداندا بەبێ ڕەچاوکردنی بارودۆخە کۆمەڵایەتییە کاریگەرەکان لە پرۆسەی چارەسەرکردندا، نیشانەی تێگەیشتنێکی کورتبینانەیە لە بنەمای سەربەخۆبوونی نەخۆش. کە واتە ئەرکی سەرشانی پزیشک و دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکانە، کە زەین و بیری نەخۆش لە گشت هۆکارە کەسی و کۆمەڵایەتییەکان ڕزگار بکەن، کە وا لە نەخۆش دەکەن لە جێی بیرکردنەوە لە تەندروستیی خۆی خەیاڵی کارەکانی لەسەردا بێت. بەڵام دەبێت ئاگاداری ئەوەش بین، کە جەختکردنەوە لە بنەمای سەربەخۆبوونی نەخۆش بەبێ گوێدانە تێگە هاوپێچەکەی، واتا بەرپرسیاریەتی، شتێکی ناماقووڵە. ئەوەی هەڵبژاردنی مرۆڤ لە هەڵبژاردنی ئاژەڵەکان جیا دەکاتەوە، توانی مرۆڤە لەسەر بیرکردنەوە و ڕامانی لەبارەی هەڵبژاردنەکەی و ئەو بەها و باوەڕانەی بۆ دیاریکردنی هەڵبژاردنەکەی پاڵی پێوە دەنێن. ڕاستییەکەی، هەڵبژاردن و ئازادی لە یەک کاتدا توانی خۆدیاریکردنی مرۆڤ دەر دەخەن. مرۆڤ لەکاتی هەڵبژاردنی بڕیارەکەیدا کەسایەتیی خۆیشی

دیاری دەکات، بە پێچەوانەی ئاژەڵەوە. لەم سۆنگەیەوە، ئازادیی پێشمەرج و پێویستیی هاتنەدیی سەربەخۆیی نەخۆشە و دەبێت لایەنە لۆژیکییەکەی ئەم مەسەلەیە هەنگاوێک بۆ دواوە بگێڕینەوە، تاوەکوو بزانین ئایا نەخۆشەکە خۆی دەیەوێت ئەم ئازادییەی هەبێت یان نا؟ واتا ئایا دەیەوێت خۆی بڕیار بدات یان نا! ڕاستییەکەی، ئازادی، لە هەمان کاتدا ئازادییە لە هەڵبژاردنی ئازادییشدا.

لە کۆتاییدا، دەتوانین بڵێین لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا، چەمکی سەربەخۆیی نەخۆش لە پێوەندیی لەگەڵ جیهانی پڕ پێچوپەناکەی ئەمڕۆدا، پێی لە بەستێنی پێوەندیی نێوان پزیشک و نەخۆش سەرووتر ناوە و چەندان هۆکاری زەمینەسازیی وەک بارودۆخی دەوڵەتەکان، جۆری بیمەکان، خاوەنپیشە و چەندان شتی دیکە لە خۆ دەگرێت.

### دووەم: بنەمای سوودمەندبوون

پزیشک و گرووپی پزیشکان دەبێت گشت هەوڵ و تێکۆشانیان بۆ سوودگەیاندنی هەرچی زیاتری نەخۆش تەرخان بکەن. ئەم کارەش پێویستی بە هەندێک پێداویستی و پێشزەمینە هەیە، وەک: لێهاتوویی و زانیاریی پێویست، بوونی پێداویستیی پزیشکی و چاودێری، تێکۆشانی بێوچان لەپێناو چاکبوونەوەی نەخۆشییەکەدا. بە سەرنجدان لە جیاوازیی تاکەکەسیی نەخۆشەکان، دەبێت پزیشک لەوە دڵنیا بێتەوە کە (ئەو کارەی بۆ نەخۆش دەیکات، ئەنجامی سوودبەخشی دەبێت و پێویستە

ڕادەی سوودمەندبوونی کارەکەشی بە پێی نەخۆشەکان بە جیاواز لەوانی تر هەڵسەنگێنێت. بە واتایەکی دیکە، لەوانەیە چارەسەرێک بۆ نەخۆشێک کاریگەریی باشی هەبێت، لە کاتێکدا هەمان چارەسەر بۆ نەخۆشێکی دیکە سەرەنجامێکی نەرێنی و زیانی جەستەیی و دەروونیی لێ بکەوێتەوە.)

بۆ دەستنیشانکردنی دەرمانی گونجاویش، پێویستە پزیشک لەسەر بنەمای تاقیکردنەوە، شیکاری نەخۆشی، وێنەگرتنی پزیشکی و وەرگرتنی نموونەی پێویست، جۆرە دەرمانێکی بۆ دەستنیشان بکات کە زۆرترین سوودی بۆ نەخۆش هەبێت. پزیشکەکان دەتوانن لە ڕێگەی خستنەڕووی زانیاری و ڕێنماییپێدانی پێویست بە نەخۆشەکان کەشێکی گونجاوی خۆپارێزی و چاودێریکردنی خودی لە لایەن نەخۆشەوە ئامادە بکات و لەم ڕێگەیەوە نەخۆشەکە بۆ چاودێریکردنی خۆی ساز بکات.

### سێیەم: بنەمای زیاننەگەیاندن

ئەم بنەمایە دوو دیوی هەیە، دیوێکیان ئەوەیە کە پزیشک لە پرۆسەی چارەسەرکردنی نەخۆشدا هەوڵ دەدات ئەو زیانانەی بەر نەخۆشەکە کەوتووە، چارەسەریان بکات و زیان و ئازاری نوێیش لە نەخۆشەکە دوور بخاتەوە؛ دیوی دووەمی ئەوەیە، کە لە پرۆسەی چارەسەرکردندا شتێک، کە لە داهاتوودا زیانی بۆ نەخۆشەکە هەبێت. بێ گومان خۆدانە بەر نەشتەری چەقۆی پزیشکی، لەکاتی سەلامەتیدا کارێکی گەمژانەیە و لەکاتی

نەخۆشییشدا یەکێکە لە مەرجەکانی بەدەستهێنانی تەندرووستی.

بۆیە پێویستە پزیشک پێش هەر جۆرە چارەسەرکردنێک، ئیدی نووسینی دەرمان، نەشتەرگەری، یان جێبەجێکردنی هەندێک تاقیکردنەوەی پزیشکی بێت، کە زیانیان لێ دەکەویتەوە، وەکوو هەندێک تاقیکردنەوەی پزیشکی لەسەر ئافرەتانی دووگیان و هاوشێوەکانی، سوود و زیانەکانی کارەکەی بە جوانی هەڵسەنگێنێت و ئەگەر بە باشی زانی، ئەوجا هەنگاو بۆ هەر جۆرە چارەسەرێک هەڵبگرێت. هەر بۆیە (فێرکردنی زانستییانە کردارێکی پێویست و کاریگەرە، هەم لەپێش و هەم لەپاش چوونەناو-ژیانی-پزیشکیی پێشەییەوە، هەروەها وەرگرتنی ئەزموونی پێویست لەبارەی سوود و زیانەکانی دەستوەردانە پزیشکییەکان لەسەر شانی پزیشکەکان پێوست دەبێت.) (لاریجانی، ١٣٨٣، ٧٧)

### چوارەم: بنەمای دادپەروەری

بنەمای دادپەروەری، بۆ سێ ئاڕاستە دەستنیشان کراوە، کە بە پێی ئەو ئاڕاستانە دادپەروەری لە مانا ئەبستراکت و گشتییەکەی خۆی دێتە دەرەوە و ڕەهەندی هاوپێچی وەردەگرێت، ئەو سێ ئاڕاستەیەش ئەمانەن:

١. دابەشکردنێکی گونجاوی ئەو سەرچاوە و کەرەستانەی کە سنووردارن (دادپەروەریی کۆمەڵایەتی؛

٢. ڕەچاوکردنی بنەمای ڕێزگرتن لە مافەکانی خەڵک (دادپەروەری لە مافەکاندا؛

٣.پاراستنی بنەمای ڕێزگرتن لەو یاسایانەی لە ڕووی مۆڕاڵییەوە پەسەند کراون (دادپەروەریی یاسایی.)

هەندێک توێژەر دادپەروەرییان بە پێی بنەمای یەکسانی و هەندێکی دیکەشیان بە پێی پێویستی پێناسەیان کردووە. بە پێی پێناسەی یەکەم، دادپەروەری، پێویستە پێداویستییەکانی چارەسەرکردن بە یەکسانی بخاتە بەر دەستی نەخۆشەکان. بە پێی پێناسەی دووەمیش، دادپەروەری، پێویستە بۆ هەر تاکێک بە پێی بارودۆخی نەخۆشییەکەی و لایەنە مۆڕاڵییەکانی مەسەلەکە، بە ڕادەی پێویستی چارەسەکردنەکە پێداویستییەکانیش بخاتە بەردەستی. لە هەر لایەنێکدا چەند گرفتێک دێنە پێشەوە، هەروەها ئەم دوو پێناسە لەناو خۆیشیاندا گرفتی لۆژیکییان هەیە. هەندێ جاریش دژبەیەکیی وەها دێتە کایەوە، کە وێنا سەرەتایی و ڕۆشنەکەی ئێمە لە دادپەروەریدا تێک دەدات.

با وا دابنێین، کە چەند نەخۆشێکمان هەیە و هەمووشیان پێویستیان بە چاندنی دڵ هەیە: یەکێکیان پیاوێکی ٦٥ساڵانە، یەکێکی دیکەشیان مێردمنداڵێکی ١٨ساڵانە و کەسی سێهەمیش کۆچبەرێکە. ئێستا ئەگەر ئێمە تەنیا یەک دڵمان بۆ چاندن هەبێت، دەبێت بە پێی کام پێناسەی دادپەروەری و بە پێی کام پێوەر یەکێک لەم سێ نەخۆشە هەڵبژێرین؟ ئەگەر دەرمانێک لە وڵاتێکدا کەم بێت و خەڵکانێکی زۆر لە چین و توێژە جیاوازەکان بە پیشە و پلەی کۆمەڵایەتیی جیاوازەوە توانی کڕینی ئەم دەرمانەیان هەبێت و هەمووشیان پێویستیان پێی بێت، دەبێت

یەکەمایەتی بۆ کامیان بێت؟ دوای بڵاوبوونەوەی ڤایرۆسی کۆرۆنا* و زۆریی خواستی ئۆکسجین و کەمی بوتڵی ئۆکسجین، هەڵبژاردنی نەخۆشەکان لەسەر بنەمای گەنجی و پیری، تا چەند کردەیەکی مۆراڵییە؟ بابەتی لەم چەشنە بابەتگەلێکی ئاڵۆزن، کە خۆیەکلاکردنەوە تێیاندا بە پشتبەستن بە تیۆرییە مۆراڵییەکان، کارێکی زۆر دژوار دەبێت. دەیڤد ڕاس بۆ ڕاستکردنەوەی شێوازی وەرگرتنی بنەما گشتییەکانی کانت، بڕوای بە حەوت بەرپرسیاریەتی هەیە، کە بە بڕوای ئەو بەهای ئەم بەرپرسیاریەتییانە لە چاو بەرپرسیاریەتییەکانی ڕۆژانەدا زیاتر و لەپێشترە. بۆ نموونە، بەڵێنمان بە دۆستێکمان داوە، کە لە جێگەیەکدا یەکدی ببینین، بەڵام کتوپڕ دایکمان نەخۆش دەکەوێت و دەبێت بۆ نەخۆشخانەی ببەین. لێرەدا ڕزگارکردنی گیانی دایکمان لەپێش بەڵێنبردنەسەرەکەمانەوە دادەنێین. بەڵام لەبارەی ئەو نموونەیەوە کە پێشتر باسمان کرد، تەنانەت بنەما مۆراڵییەکانی (ڕاس)یش گرێی گرفتەکەمان بۆ ناکەنەوە. لێرەدایە، کە بۆمان دەر دەکەوێت، ئەو دوو پێناسەیە لە دادپەروەریدا هیچ کامیان کارکردیان نییە.

لە لایەکی تریشەوە، قەتیسکردنی دادپەروەری لە سنووردارکردنی پێداویستییە پزیشکییەکاندا جۆرێک تاکلایەنیی تێدایە. لەم بوارەدا مۆراڵی پزیشکی بۆ پزیشکەکان پێشنیاری ئەوە دەکات، کە بە پێی باوەڕە کەسییەکانی خۆیان لەگەڵ نەخۆشەکاندا ڕەفتار نەکەن و لە هەڵسوکەوتەکانیاندا گرنگی بە

---

* Covid-١٩

سامان و پلەی کۆمەڵایەتی و تایبەتمەندییەکانی دیکەی نەخۆش نەدەن، یان پێوەرەکەیان ئاستی بژێوی و پشتگیرییەکانی بیمەیەکی تایبەت لە نەخۆشەکە نەکەن و لەبارەی هەموو ئەم مەسەلانەوە هەوڵی بێلایەنی و خاڵیبوونەوە بدەن. لە ڕێککەوتننامەی جنێفیشدا لەم بارەیەوە باس لەوە دەکرێت، کە پزیشک ڕێگە بەوە نادات لایەنی ئایینی، نەتەوە و ڕەگەز، یان پلەوپایەی کۆمەڵایەتی کاریگەرییان لەسەر پزیشک و چارەسەرکردنی نەخۆشەکە هەبێت. (اعتمادیان، ١٣٤٢، ٢٩)

مادام پێوەندیی نێوان پزیشک و نەخۆش بەستێنێکی فراوانی مەسەلە جۆربەجۆرەکان لە خۆ دەگرێت، دیاریکردنی سنوور و مەودای ڕەفتاری دادپەروەرانە، کارێکی ئاسان نابێت. بۆ نموونە، دادپەروەری لە مەسەلەی لەباربردنی کۆرپەلەدا چی بە باش دەزانێت، یان لە چاندنی ئەندامەکاندا یان ئۆتۆنازی یان بەکارهێنانی چارەسەری بۆماوەیی، هەر یەکێک لەمانە لەگەڵ چەندان مەسەلەی دیکەدا پێوەندیی هەیە. لە لایەکی تریشەوە، دەبێت ڕێگری لە هەندێ ڕووداویش بکرێت، کە سیمای ڕەفتارێکی دادپەروەرانە دەشێوێنێت. بۆ نموونە، نابێت پزیشک لەبەر خاتری پێوەندیی بە سەنتەرێکی چارەسەرکردنەوە، ئیتر نەخۆشەکانی تەنیا بۆ ئەو سەنتەرە بنێرێت، یان بەرتیلوەرگرتن لە نەخۆشەکان سیمای ڕەفتاری دادپەروەرانە دەشێوێنێت.

## پەروەردە و فێرکردن و مۆڕاڵی پزیشکی

فێرکردنی مۆڕاڵی پزیشکی بە پزیشکەکان، لە گرنگترین بوارەکانی پەروەردە و فێرکردنی کاری پزیشکییە. هەڵبەت ئەوەشمان لە یاد نەچێت، بۆ پزیشکێکی باش و سەرکەوتوو تەنیا فێرکردنی مۆڕاڵی پزیشکی بۆ گەشەکردنی توانە پزیشکییە پێویستەکان بەس نییە، بەڵکوو بە ڕادەیەکی زۆر پەی بە پێویستی فێرکردنی مۆڕاڵی پزیشکی بۆ پزیشک و کارمەندانی بواری تەندرووستی دەبرێت، بۆیە وا دێتە بەرچاو، کە بۆ جێکردنەوەی بابەتە مۆڕاڵییەکان لە بەستێنی سیستەمی فێرکردنی پزیشکیدا، زۆربەی وڵاتانی جیهان و کوردستانی عێراقیش بە تایبەتتر کاتەکە گونجاوە. ئەم کارەش دەبێت بە شێوەیەک بێت، کە لە هەموو ئاستەکانی خوێندنی پزیشکیدا فێرکردنی مۆڕاڵی پزیشکی جێگەی شیاوی خۆی هەبێت. لەم بەشەدا هەوڵ دەدەین بۆ گەیشتن بەم ئامانجانە، میتۆد و ڕێبازە گونجاوەکان بە پێی ئاستە جیاوازەکان و نموونە زانستییە لەبارەکان لە مۆڕاڵی پزیشکیدا وەکوو ڕێنیشاندەر بخەینە ڕوو و جگە لەمەش، کورتەیەک لە چۆنیەتیی پێوەندیی نێوان پزیشک و نەخۆشیش باس دەکەین.

دەتوانین ئەم تەوەرە بۆ دوو بەش دابەش بکەن: "مۆڕاڵ لە فێرکردنی پزیشکیدا" و "فێرکردنی مۆڕاڵی پزیشکی." لە بەشی یەکەمدا، باس لەو بابەتە مۆڕاڵییانەی فێرکردن دەکرێت، کە لە هەر پسپۆڕییەکدا پێویستن، کە بریتین لە: توانستی زانستیی پسپۆڕان، نوێبوونەوەی زانیارییەکانیان، سوودوەرگرتن لە شێوازە نوێیەکانی فێرکردن، توانی گەیاندنی زانیارییەکان بە فێرخواز و مامۆستایان. لە بەرانبەریشدا فێرخوازان بەرپرسیاریەتیی مۆڕاڵییان بەرانبەر بە فێرکاران و مامۆستایانیان هەیە، وەک: نواندنی ڕێزو قەدرزانین، پاراستنی ئارامی و هێمنی، ئامادەکردنی توێژینەوەی زانستی (بە بەردەوامی،) هەوڵ و تەقالا بۆ بەدەستهێنانی زانیاری و ئەزموونی پزیشکی.

فێرکردنی مۆڕاڵی پزیشکییش، کە لایەنێکی جێبەجێکاریی هەیە، بەشێکە لە مۆڕاڵی جێبەجێکاری و گرنگییەکی زۆری هەیە. یەکێک لە درووشمەکانی زانستی پزیشکی ئەوەیە، کە: "خۆپاراستن لە (خۆ)چارەسەرکردن باشترە." هەر بۆیە گەیاندن و فێرکردنی مۆڕاڵی پزیشکی بۆ فێرخوازان و مامۆستایانی ئەم بەشە، بۆ ڕێگریکردنە لەو کێشە و گرفتانەی، کە بە هۆی بێئاگایی یان هەژاریی مۆڕاڵییەوە لەوانەیە ڕوو بدەن.

پزیشک پارێزەری گیان و ناموسی نەخۆشەکانە، بۆیە پێویستە پزیشک خۆی بە مۆڕاڵە جوانەکان برازێنێتەوە و بنەما مۆڕاڵییەکان لە بەرچاو بگرێت، وەک: نهێنیپارێزی، ڕاستگۆیی، ئەمانەتداری، ڕەچاوکردنی دادپەروەری و دڵسۆزی.

له ڕابوردووشدا پزیشکیان وەک نێرراوێکی خودایی و تەنانەت هەندێ جار وەک نیوەخودا سەیر کردووە. ئەمەش لەو ڕوانگەیەوە بووە کە پزیشک هەندێ جار ژیانێکی نوێی بە نەخۆش بەخشیوە، لە کاتێکدا لە گیانەلادا بووە. فێرخوازانی ئەم بوارە دەبێت هەم ئاگاداری بابەتە مۆڕاڵییەکان بن و هەمیش شارەزای یاساکانی ئەم بوارە بن، چونکە "بابەتە مۆڕاڵییەکان لە بواری پزیشکیدا، جگە لەوەی کاریگەرییان لەسەر درووستبوونی یاساکان دەبێت، لەسەر حاڵەتە کلینیکی و چاودێرییەکانیش کاریگەری درووست دەکەن." (لاریجانی، ١٣٨٣، ٦٤) گرنگیی ئەم فێرکارییە هێندە زۆرە، کە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا جارێکی دیکە مۆڕاڵی پزیشکی فێری کادیرانی بواری پزیشکی دەکرێت.

زۆر جار باسی فێرکارییەکانی پزیشکە کۆنەکانمان لەبارەی بنەماکانی مۆڕاڵی پزیشکییەوە کردووە و باسمان لەوەش کردووە کە ئەوان زانستیان بەبێ مۆڕاڵ بە ناتەواو زانیوە. لە ڕۆژگاری ئەمڕۆشماندا "فێرکردنی مۆڕاڵی پزیشکی لە هۆڵەکانی خوێندندا جێی خۆی داوەتە مۆڕاڵی پزیشکی کلینیکی لە ساتە دژوارەکاندا." (هەمان سەرچاوە، ٩٢)

هەوڵ و تێکۆشانی مۆڕاڵی پزیشکی بۆ پاراستنی مافەکانی نەخۆشە کە بە درێژایی پرۆسەی چارەسەرکردن، مادام لە ئێستاشدا گۆڕانکاریی ئێجگار زۆر لە بواری فێرکارییەکانی چۆنیەتیی مامەڵەکردنی پزیشک و نەخۆش و چۆنیەتیی کارکردنی سیستەمەکانی چارەسەرکردندا ڕووی داوە،

فێرکردنی مۆراڵی پزیشکی، گرنگیی زۆری پەیدا کردووە و پێویستی بە لێوردبوونەوەی پزیشکانی کلینیکی و پسپۆڕییەکانی دیکە هەیە لەکاتی بڕیارداندا. ئەم گۆڕانکارییانە، هەم لە بواری دامەزراوە مەدەنییەکاندا گرنگییان پێ دەدرێت و هەم لە بواری پێشکەوتنەکانی زانستی پزیشکیدا، وەک: مەسەلە مۆراڵییەکانی هاوکاریکردن بۆ دووگیانی، بواری بۆماوەیی، زانستەزانیاریی* بواری تەندرووستی، تەکنەلۆژیاکانی زیادکردنی تەمەن، ئۆتونازی، بەڕێوەبردنی چەندان جۆر شیکاری و تاقیکردنەوە لەسەر منداڵدان و کۆرپەلە و چەندان بابەتی دیکە.

لە لایەکی تریشەوە، بە پێچەوانەی ڕابوردووەوە، فێرکردنی پزیشکی تەنیا لە نێوان مامۆستا و فێرخوازی پزیشکیدا نەماوەتەوە، بەڵکوو لە کۆلێژەکانی پزیشکیدا بووەتە وانەیەکی فێرکاری و تایبەتمەندیی پێویستی خۆیشی هەیە. هەوڵدان بۆ گونجاندنی چەند یەکەیەکی مۆراڵی پزیشکی لە وانەکانی خوێندنی پزیشکیدا، بووەتە هۆی ئەوەی ئەنجوومەنەکانی وەک "ئەنجوومەنی جیهانی پزیشکی و لیژنەی جیهانی فێرکردنی پزیشکی" سوپاسنامەی تایبەتیان بۆ بنێرن. (انجمن جهانی پزشکی، ۲۰۰۵، ۱۱)

مۆراڵی پزیشکی چەند بنەمایەکی سەرەکی و چەند بنەمایەکی لاوەکیی هەیە. ڕێزگرتن لە نەخۆشەکان، ڕەزامەندیی ئاگایانەی نەخۆش، پاراستنی نهێنی لە نێوان پزیشک و نەخۆش و ڕەچاوکردنی مافەکانی مرۆڤ بەشێکن لە بنەما سەرەکییەکانی

---

* Informatics

مۆڕاڵی پزیشکی. جا بۆ ئەوەی فێرکردنی مۆڕاڵی پزیشکی بە شێوەیەکی بەبرشت بێتە دی، دەبێت پێداویستییەکانی بۆ بێتە دی.

سەرەڕای ئەوەی فێرکردن و مانەوەی بابەتەکان لە یادگەی مرۆڤدا لە سالانی سەرەتادا شتێکی ڕوونە، بەلام لەبارەی زانستی مۆڕاڵی پزیشکییەوە پێویستە ئاماژە بەوە بکەین، کە "فێرکردنی ئەم زانستە دەبێت لە هەموو قۆناغەکانی خوێندنی پزیشکیدا هەر لە خولەکانی فێرکردن، فێربوونی خوێندکار، یاریدەدەری پزیشکی و خوێندنی بەردەوامدا هەبێت." (زاهدی، ١٣٨٦، ٥٥) لەم سۆنگەیەوە، بەشێکی زۆری زانکۆکان لە سەرانسەری جیهاندا لەسەر نوێکردنەوەی زانیارییە پزیشکییەکان لە بواری مەسەلەکانی پزیشکی، مۆڕاڵی و یاسایی ئەم بوارەدا جەخت دەکەنەوە. لەنێو ئەم زانکۆیانەشدا دەتوانین ئاماژە بە زانکۆی مالبۆرنی ئوسترالیا بکەین. ئەم حالەتە بە شێوەیەکە، کە لەم زانکۆیەدا نوێکردنەوەی زانیارییەکانی ئەندامانی ئەنجوومەنی زانستی بە ئیمتیازێکی تایبەت لە قەلەم دەدرێت. (قورچیان، ١٣٩٣، ٧١٨)

مۆڕاڵ جگە لەوەی وەک سنوورێکی پارێزەر پشتگیریی سەلامەتیی پەروەردە و فێرکردنی بواری پزیشکی دەکات، بەلکوو بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆش لە پرۆسەی چارەسەرکردندا ڕۆڵ دەبینێت و بە بەشێکی سەرەکیی ئەو پرۆسەیەش لە قەلەم دەدرێت. فێرکردنی مۆڕاڵی پزیشکی، تەنیا فێربوونی چاکە مۆڕاڵییەکان نییە، بەلکوو چوونە ناو بازنەی

ئاڵۆزی چارەسەرکردن و هەوڵدانە بۆ دۆزینەوەی ڕفتاری مۆڕاڵیی گونجاو لە ساتەوەختەکانی چارەسەرکردندا. ˚چونکە ڕێکارە پزیشکی و یاساییەکانی پاراستنی مافی نەخۆش، بەردەوام لە گۆڕاندایە. کارکردی سیستەمەکانی چاودێریی تەندرووستی لە چاو ڕابوردوودا گۆڕاوە و لەمڕۆشدا پزیشکی کلینیکی بڕیاری درووست و مۆڕاڵییانە لە هەر بابەتێکی نوێدا بە گرنگ دەزانێت.˚ (زاهدی، ١٣٨٦، ٥٦) بە لەبەرچاوگرتنی گرنگیی فێرکردنی مۆڕاڵی پزیشکی، ئیتر ناتوانین تەنیا لە چەند وتار و سیمینارێکدا کورتی بکەینەوە. هەر وەک سپیندلەر* ئاماژەی پێ دەکات، دەبێت ئێستا مامۆستا و سەرپەرشتیارانی وانەوتنەوە و پێگەیاندنی پزیشکان ˚کەسایەتییەکی کولتوورییانە لە فێرخوازانی پزیشکی درووست بکەن و لە شوناسی کۆمەڵایەتییانەی فێرخوازاندا گۆڕانکاری درووست بکەن.˚ (خاقانیزادە و همکاران، ١٣٩٠، ٩٠٤) لە توێژینەوەیەکدا، کە دوکتۆر مورتەزا خاقانیزادە و هاوکارەکانی کردوویانە، ئاماژەیان بە گرفتەکانی فێرکردنی مۆڕاڵی پزیشکی لە سێ بواری: توانی پسپۆڕییانەی مامۆستایانی مۆڕاڵی پزیشکی، فێرکردنی مۆڕاڵی پزیشکی لە ڕێگەی میتۆدەکانی وانەوتنەوەی چالاکەوە و بوونی نموونەی مۆڕاڵی کردووە. هەوڵیان داوە لە توێژینەوەکەیاندا کەموکوورییەکانی ئەم سێ بوارە بخەنە ڕوو. بۆ نموونە، ئاماژەیان کردووە بە: کەمیی پسپۆڕی مۆڕاڵی پزیشکی، نەبوونی گشتگیریی توانەکانی مامۆستایانی مۆڕاڵی

* Spindler

پزیشکی، لاوازیی پێوەندیی دوولایەنانە لەگەڵ فێرخوازان، لاوازیی میتۆدەکانی وانەوتنەوە، لاوازیی لە پێشاندانی نموونەیەکی مۆڕاڵی و ڕەچاونەکردنی بنەما مۆڕاڵی و پیشەییەکان لە لایەن ژمارەیەک لە پزیشکانەوە. ئەم توێژەرانە بە شێوەیەکی کورت و پوخت ئاماژەیان بەم گرفتانە کردووە.

چوونەناوەوەی کەسانی ناپسپۆڕ بۆ بواری فێرکردنی مۆڕاڵی پزیشکی، تێڕوانینی ناپسپۆڕانە بۆ فێرکردنی مۆڕاڵی پزیشکی، پێویستی زانکۆکان بە پسپۆڕانی مۆڕاڵی پزیشکی، لاوازیی زانستی، تاکڕەهەندیی توانە پسپۆڕییەکانی مامۆستایان، نەبوونی لێزانین و کارامەیی کلینیکی، شارەزانەبوون لە بەشەکانی پێوەست بە زانستی پزیشکی و مۆڕاڵی پزیشکییەوە، پاوانکردنی فێرکردنی مۆڕاڵی پزیشکی، لاوازی لە چۆنیەتیی مامەڵەکردن لەگەڵ قوتابیاندا، وانەوتنەوە، تەنیا بە شێوەی تیۆری و گوتاری، لاوازیی بەکارهێنانی میتۆدی چارەسەرکردنی گرفتەکان، گرنگینەدان بە شێوەکانی فێرکردنی گرووپی، لاوازی لە فێرکردنی مۆڕاڵی پزیشکی لە ماوەی کلینیکیدا، بێبڕشتی لە بەکارهێنانی میتۆدی نموونەکاری، پێنەدانی نموونەیەکی مۆڕاڵ بە فێرخوازان، پێچەوانەبوونی گوفتار و کرداری مامۆستاکان، کەمیی نموونەی مۆڕاڵی گونجاو لەنێو مامۆستایانی پزیشکیدا، پابەندنەبوونی مامۆستاکان بە ڕەفتاری مۆڕاڵی و پیشەییەوە، بەدەستهێنانی پارە لە ڕێگەی غەیرمۆڕاڵییەوە، بێڕێزی بەرانبەر نەخۆشەکان، ڕەچاونەکردنی مافەکانی نەخۆش، خواردنی پشکەکانی یەکتر، بێڕێزی بەرانبەر فێرخواز و هاوکارەکان،

بەزەیینەهاتنەوە بە حاڵی نەخۆشدا، پابەندنەبوون بە کاتە دیاریکراوەکانی کارەوە، هەڵسوکەوتی ناپیشەیی، گوێنەدان بە ڕەفتاری نامۆڕاڵییانەی فێرخوازان. (هەمان سەرچاوە، ٩٠٧)

هەر یەکێک لە بابەتەکانی سەرەوە، گرنگییەکی لەڕاددەبەدەریان لە بواری فێرکردنی مۆڕاڵی پزیشکیدا هەیە. بۆ نموونە، یەکێک لە گرفتە سەرەکییەکانی ئەم بوارە، نەبوونی ئەو مامۆستایانەیە، کە شارەزای بەشە نێوەنجییەکانی زانستی پزیشکی و زانستەکانی دیکە بن. بە پێی یەکێک لەو توێژینەوانەی لە زانکۆیەکی شاری تۆرێنتۆی کەنەدا کراوە، سوود لە فەیلەسووفێکی مۆڕاڵ بۆ فێرکردنی یارمەتیدەرانی پزیشکی نەشتەرگەری وەرگیراوە کە لە ئەنجامدا "یارمەتیدەرەکان بە (کاتبەفیرۆدان) و (بە دوور لەو گرفتانەی ڕووبەڕوویان دەبێتەوە) لە قەڵەمیان داوە." (زاهدی، ١٣٨٦، ٥٦)

یەکێکی تر لە بابەتە گرنگەکانی پێوەست بە فێرکردنی مۆڕاڵی پزیشکییەوە، بەرانبەر قەرەوێڵەی نەخۆشە، چونکە مۆڕاڵی پزیشکی، ڕاستییەکەی شتێکی جێبەجێکارییە، بۆیە بە پێچەوانەی فێرکردنە تیۆرییەکانەوە دەبێت بەشێکی زۆری فێرکردنەکان لە ساتی چاودێریکردنی نەخۆشدا بە ڕێوە بچن، بۆ ئەوەی لەم ڕێگەیەوە فێرخوازان و کادیرانی دیکەی بواری تەندرووستی، کە بە شێوەیەک لە شێوەکان لە چارەسەرکردنی نەخۆشدا دەستیان هەیە، لە نزیکەوە ئاشنایی مەسەلەکانی پێوەست بە چاودێریی تەندرووستییانەی نەخۆشەکان و چۆنیەتیی

مامەڵەکردن لەگەڵ خێزانەکانیان و ڕووبەڕووبوونەوەی مەسەلە مۆڕاڵییەکانی نەخۆشەکان و شێوەی چارەسەرکردنیان بن.

دەبێت مۆڕاڵی پزیشکی لە یەک کاتدا سەرنجی دوو شتی گرنگ بدات، (یەکەم،) درووستکردنی کەسایەتیی فێرخوازان و چەسپاندنی چاکە مۆڕاڵییەکانی وەک دادپەروەری، ڕاسگۆیی، ئارامی، دڵسۆزی و میهرەبانی و... هتد؛ (دووەم،) ڕوونکردنەوەی لایەنە یاساییەکانی چارەسەرێکی پزیشکی، وەکوو پاشهاتە یاساییەکانی لەباربردنی کۆرپەلە و بەکارهێنانی داتا بۆماوەییەکان بۆ مەبەستێکی تایبەت و...هتد. گرێدانی مۆڕاڵ و یاساش گرنگییەکەی لەوەدایە کە لە سەردەمی نوێدا، کە دامەزراوە شارستانییەکان شوێنێکی سەرەکییان گرتووە، ئیتر سنووری ڕەفتاری کەسانی دیکە تەنیا بە پێی سەرچاوە ناوەکی و لەژێر فەرمانی بەهاکانی ناخماندا نییە، بەڵکوو سەرچاوەیەکی دەرەکییش بە ناوی یاسا و پرۆسەی یاسادانانەوە دەتوانێت چوارچێوەکانی ڕەفتاری مۆڕاڵی و نامۆڕاڵیمان بۆ دیاری بکات و لە چ شوێنێکدا یاسا مرۆییەکان پێشێل کراون و سزادان دێتە ئاراوە.

یەکێکی دیکە لە تەوەرە گرنگەکانی فێرکردنی مۆڕاڵی پزیشکی، دیاریکردنی شێوازی فێرکردنی گونجاوە. لە ئێستادا تا ڕادەیەکی زۆر کۆدەنگییەکی تەواو لەسەر ئەمە هەیە، کە یەکێک لە باشترین و گونجاوترین میتۆدەکانی فێرکردن، گیرۆدەکردنی فێرخوازانە لەگەڵ چاودێریکردنی نەخۆشەکان و بەکارهێنانی میتۆدەکانی فێرکردنی چالاکانەدا.

شتێکی دیکەش لە فێرکردنی مۆڕاڵی پزیشکیدا پشتگوێ خراوە، ئەویش ڕەفتارە نەشیاوەکانی فێرخوازەکانە، کە ڕاستییەکەی لە کەمایەسیی کەسێتی و مۆڕاڵیی فێرخوازانەوەیە، کە دەبێت پاش دیاریکردنی ئەم کەمایەسییە بە شێوەیەکی سیستماتیک چارەسەر بکرێت. بۆ نموونە، ئەو فێرخوازەی تووڕەیە یان خۆبەزلزان و لووتبەرزە، دەبێت وردە وردە ئەم سیفەتەی لێ پاک بکرێتەوە و لە جێگەیدا نەمامی میهرەبانی و ڕێزگرتنی تێدا بنێژرێت، بەبێ جیاوازیکردن لە نێوان پزیشکە هاوکارەکانی یان کادیرانی بواری تەندرووستی یان نەخۆش و یارمەتیدەرەکانیان، چونکە مرۆڤێک لە خەمی ئازاری خەڵکیدا نەبێت، ناویشی لە مرۆڤبوون دوورە*.

لەبارەی ڕۆڵی یاساشەوە، هەوڵ دەدرێت کارە نەشیاوەکانی پزیشکەکان بە پەیڕەوێکی یاسایی توندوتۆڵ کۆنترۆڵ بکرێن و بەشێک لەوانەی ئەم کارەیان بە دەست دەبێت، لە کەسانی ئاسایی ناو کۆمەڵگە بن و پزیشک نەبن، بۆ ئەوەی لەم ڕێگەیەوە پابەندبوونێکی دوور لە دەمارگیری لەسەر پزیشکان بچەسپێنرێت. هەر لەم ڕوانگەیەوە دەستنامەی ئەخلاقی پزیشکی دەڵێت: "لەم ساڵانەی دواییدا چەند هەنگاوێک بۆ هەست بە بەرپرسیاریەتیکردنی زیاتری کارمەندانی کەرتی تەندرووستی

---

*ئەمە ئاماژەیە بە دێڕە شیعرێکی سەعدی شیرازی:

تو کز محنت دیگران بی غمی
نشاید که نامت نهند آدمی

نراوه، بۆ نموونه كەسانى ئاسايى و غەيرە پزيشك وەك بەرپرسى برياردان لەم بوارەدا دانراون، هەروەها پابەندبوون بەو راپۆرتانەی لەبارەی سستى و رەفتارى نەشياوى ياريدەدەرانى پزيشكەكانەوە بەرز دەكرێنەوە و لە ياسا شارستانييەكانى مۆراڵى پزيشكييشدا چەسپێنراون. راگەيەنراوى نێودەوڵەتيى ئەنجوومەنى جيهانيى پزيشكى (WMA)* لەبارەی مۆراڵى پزيشكييەوە دەڵێت: "پێويستە پزيشكەكان باسى ئەو پزيشكانە بكەن، كە لە روانگەی كەسێتى يان پسپۆرييەتييانەوە كەموكوورييان هەيە، هەروەها خەڵكى لەو پزيشكانە هوشيار بكەنەوە، كە دەستيان داوەتە چەتەيى و خراپبەكارهێنانى پيشەكانيان." (انجمنى جهانى پزشكى، ٢٠٠٥، ٦٦)

---

* The World Medical Association

پێوەندیی نێوان پزیشک و نەخۆش سنووریێکی فراوانی پێوەندییەکان لە خۆ دەگرێت، کە دەتوانین بە کورتی ئاماژە بەمانەی خوارەوە بکەین:

١.پێوەندیی نێوان پزیشک و نەخۆش؛

٢.توانستی زانستی و کرداری پزیشک؛

٣.ڕەزامەندیی نەخۆش؛

٤.نهێنیپارێزیی پزیشک و ڕاستگۆیی؛

٥.گرنگیدان بە بیروباوەڕی نەخۆش؛

٦.پێوەندییە داراییەکانی پزیشک و نەخۆش.

لە باسەکانی پێشەوەدا باسمان لەوە کرد، کە مۆراڵی پزیشکیی کۆن لەبارەی پێوەندیی پزیشک و نەخۆشەوە بڕوای وا بوو پزیشک تا ڕادەیەک پلەوپایەیەکی موقەددەس و باوکانەی هەیە، بەڵام لەمڕۆدا باس لە پێوەندیی نێوان پزیشک و نەخۆش دەکرێت، کە تێیدا سەربەخۆییی نەخۆش لە بڕیارداندا"* پارێزراو بێت، "بۆ ئەم مەبەستەش لەجیاتی چەمکی (نەخۆش)*[٢] چەمکی (سەردانکەر)* بە کار دەهێنرێت و پێوەندیی نێوان پزیشک و نەخۆش لە شێوەی بەڵێنێکی دوولایەنەدا دەبێت." (همان،٢٤) هەڵبەت ئەمە پێچەوانەی ئەوەش ناوەستێتەوە، کە

---

* Autonomy
* Patient

* Client

سەربەخۆبوونی نەخۆش و هەڵبژاردنی جۆری چارەسەرەکەی بە پێی ڕێنماییەکانی پزیشک دەبێت. بۆ بڕیاردانیش، نەخۆش خۆی دەداتە دەستی پزیشک و قسەکانی دوکتۆر لە خەمی تەندروستیی خۆیدا دەبینێتەوە، هەر بۆیە لە دێرزەمانەوە بۆ ڕێگریکردن لە کەڵکاوەژوویی و ڕەچاوکردنی بنەماکانی مۆڕاڵی پزیشکی، چەند سوێندنامەیەکی پزیشکی ئامادە کراون، کە بە ناوبانگترینیان سوێندنامەی هیپۆکریتۆسە.*

لە ڕابوردوودا تەنیا سوێندەکەی هیپۆکریتۆس نەبووە، کە بەڵێنی لە پزیشکان وەرگرتووە بۆ ئەوەی ڕەچاوی بنەماکانی مۆڕاڵی پزیشکی بکەن، بەڵکوو دەتوانین ئاماژە بە یاساکانی حامووڕابی بکەین، کە "سەرەڕای ئەوەی لەم یاسایەدا ئاماژە بە بنەما مۆڕاڵییەکانی پیشەی پزیشکی نەکراوە و تەنیا حەقدەست و پارەی نەشتەرگەری و سزای پزیشکەکان دیاری کراوە، لەبارەی لەباربردنی کۆرپەلەشەوە یاسای تێدایە و لە شارستانیەتیی ئاشووری و بابلییشدا لەباربردنی کۆرپەلە بە تاوانێک دژ بە وڵات و مۆڕاڵ لە قەڵەم دراوە و سزای بکەرانی دراوە." (اعتمادیان، ١٣٤٢، ١٠)

دەتوانین لە نموونەی سوێندنامەکانی تریش ئاماژە بە سوێندنامەکەی مۆن پیلیە بکەین*. ئامۆژگارینامەی پزیشکی بەناوبانگ، عەلی کوڕی عەبباسی مەجووسیی ئەهوازی، سوێندنامەی عەساف و چەندانی دیکە. هەروەها "بەڵێننامە یان

* Hippocratic Oath
* Montpelier Oath

ڕاگەیەنراوی جنێفی سویسراش کە لەساڵی ١٩٤٨دا ڕاگەیەنرا و لە ساڵی ١٩٦٨دا هەموار کرایەوە." (لاریجانی، ١٣٨٣، ٢٥)

سوێندنامەی هیپۆکریتۆس کاتێکی زۆری بەسەردا ڕۆیشتووە و پێویستی بە نوێکردنەوە هەیە. بۆ ئەم مەبەستە، ئەنجوومەنی پزیشکانی جیهان (WMA) کە لە ساڵی ١٩٤٧دا دامەزرا، هەوڵی دا بۆشاییە مۆڕاڵییەکانی دەرهاویشتەی پێشکەوتنی کۆمەڵگەکان و بواری زانست و تەکنەلۆژیا پڕ بکاتەوە. ئەنجامی نوێکردنەوەی سوێندنامەکەی هیپۆکریتۆس "ڕاگەیەنراوی جنێف بوو، کە لە دانیشتنی دووەمی ئەنجوومەنەکەدا لە ساڵی ١٩٤٨دا پەسەند کرا. ئەرکی دووەمی ئەم ئەنجوومەنە، درووستکردنی ڕێکارێکی نێودەوڵەتی بوو بۆ مۆڕاڵی پزیشکی، کە لە دانیشتنی سێیەمدا لە ساڵی ١٩٤٩دا پەسەند کرا و لە ساڵی ١٩٦٨ و ١٩٨٣دا پێیدا چوونەوە. ئەرکێکی دیکەی ئەم ئەنجوومەنە، خستنەڕووی میتۆدە مۆڕاڵییەکان بوو لە توێژینەوەکانی تایبەت بەو مرۆڤانەی کاری تاقیکاری و شیکاریی پزیشکییان لەسەر دەکرا. ئەم ڕاگەیەنراوەش، لە چاو کارەکانی دیکەی ئەنجوومەنەکەدا، کاتێکی زۆر زیاتری ویست، هەتا لە ساڵی ١٩٦٤دا پەسەند کرا و بە بەیاننامەی هێلسینکی ناسرا. ئەم ڕاگەیەنراوەش، هەموار کرایەوە و دوایین وردبینییشی لە ساڵی ٢٠٠٠ بوو." (انجمن جهانی پزشکی، ٢٠٠٥، ٢٢)

بەڵێنی مۆڕاڵی پزیشکان و گەڕانەوەیان بۆ ویژدانیان و وەڵامدانەوەیان بەرانبەر خودا، ئەو لایەنە مۆڕاڵییانەن کە لە مۆڕاڵی پزیشکیی کۆندا بۆمان ماونەتەوە. بەڵام لەمڕۆدا بە هۆی

ئەو شێوازە کۆمەڵایەتییە جیاوازەی کۆمەڵگەکان بە خۆیانەوە بینیوە، پزیشکەکان جگە لەوەی دەبێت وەڵامی ویژدانی خۆیان و خودا بدەنەوە، هەروەها دەبێت "وەڵامی نەخۆشەکان، نەخۆشخانەکان و دامەزراوە کارگێڕییەکانی چاودێریکردنی بواری تەندرووستی، بەرپرسانی پێدانی مۆڵەتی کار و زۆربەی دادگاکان بدەنەوە." (هەمان سەرچاوە ٢٠-٢١) سەرەڕای هەموو وردەکارییە یاساییەکانی ئەم بوارە، کە هەندێکیان وەکوو ڕاگەیەنراوەکانی ئەنجوومەنی جیهانی پزیشکی (WMA) ڕەهەندێکی گشتییان هەیە و هەندێکیشیان ڕەهەندی یاساییان هەیە، پزیشکەکان ڕۆڵی یەکلاکەرەوەیان لە بڕیارەکاندا هەیە، چونکە نەشتەرگەری یان چاودێریی نەخۆشەکان مەسەلەگەلێکی وەها دەخوڵقێنن، کە لە سنووری ڕێبەرییە پزیشکییەکان و ماددە یاساییەکان تێدەپەڕن. لەم سۆنگەیەوە، پێویستە هەر پزیشکێک لە پێوەندیی خۆی لەگەڵ نەخۆشدا خاوەنی کۆمەڵە لێهاتووییەک بێت لەپێناو بەدیهێنانی پرۆسەی چارەسەرکردن، لە نموونەی ئەو لێهاتووییانەش دەتوانین ئاماژە بکەین بە: "لێهاتوویی لە وەرگرتنی وردترین قسە و دۆخی نەخۆش لەبارەی نەخۆشییەکەیەوە، لێهاتوویی لە پشکنینی نەخۆشییەکەدا بە شێوەیەکی زۆر باش، لێهاتوویی لە درووستکردنی پێوەندی لەگەڵ نەخۆش، لێهاتوویی لە تێگەیاندنی نەخۆش بە پێی بەڵگە و نموونە، لێهاتوویی لە دەستنیشانکردنی درووستی نەخۆشی، هەروەها توانستی بەکارهێنانی زانستە تیۆرییەکان لە چارەسەرکردن و چاودێریکردنی نەخۆشدا. (لاریجانی، ١٣٨٣،

٢٥) جا لێرەدا دیاریکردنی هەر کەموکوورپییەک بە هۆی نەبوونی ئەم لێهاتووییانەوە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو یاسایانەی لە هەر ولاتێکدا لەم بارەیەوە هەن.

بە شێوەیەکی گشتی، سەرەڕای ئەوەی دان بەوەدا دەنێین، کە پێوەندیی نێوان پزیشک و نەخۆش لە ماوەی چارەسەرکردندا زۆر ئاڵۆزە، بەڵام دەتوانین مەسەلە مۆڕاڵیيە بنەڕەتییەکانی ئەم بوارە لەم خاڵانەدا کورت بکەینەوە: "ڕێزگرتنی دوولایەنانە، دروستکردنی پێوەندی و دەربڕینی ڕەزامەندی، بڕیاردانی درووست بۆ ئەو نەخۆشانەی خۆیان توانی بڕیاردانیان نییە یان شیاوی بڕیاردان نین، نهێنیپارێزی، مەسەلەکانی سەرەتا و کۆتاییی ژیانی نەخۆش." (انجمن جهانی پزشکی، ٢٠٠٥، ٣٠)

لەبارەی ئەم یاسا مۆڕاڵیيانەوە لە چەند ولاتێکی جیاوازدا توێژینەوەگەلێک کراون، کە دەتوانین ئاماژە بکەین بە: توێژینەوەی چۆنایەتییانە لە نەخۆشخانە حوکوومییەکانی کەتەلۆنیا، توێژینەوەیەکی مەیدانی لە لایەن فلۆرین* و هاوکارەکانیەوە لە سوید، توێژینەوەی فوتاکی* لە چوار شاری ڕووسیا، هەروەها توێژینەوەیەک، کە لە لایەن چەند توێژەرێکەوە: (عەلیڕەزا پارساپوور، کازم محەمەد، حوسەین مەلیکئەفزەلی، فەرشید عەلائەددینی، باقر لاریجانی) لە سێ نەخۆشخانەی تاراندا کراوە، لە ئەنجامدا دەر کەوتووە "بە پێی ئەم توێژینەوە چۆنایەتییە، تێڕوانین و لێکدانەوەی پزیشکەکان،

---

* Florin

* Fotaki

پەرستار و نەخۆشەکان لەبارەی مافەکانی نەخۆشەوە لە نەخۆشخانەکانی هەرێمی کەتەلۆنیا، زیاتر گرنگیی بە مافی وەرگرتنی زانیاری لە لایەن نەخۆشەکان و ڕێزگرتن لە سەربەخۆبوونی نەخۆشەکان دراوە." (پارساپور و همکاران، ٨٧-٨٨) لە توێژینەوە مەیدانییەکەی فلۆرینیشدا کە لەسەر هەشتا تیمی دووکەسی (پەرستار و نەخۆش) لە سوید کراوە، دەر کەوتووە پەرستارەکان زیاتر مەیلی ئەوەیان هەبووە نەخۆشەکان لە بڕیارەکانی چارەسەرکردنیاندا بەشداری بکەن.

توێژینەوەی لەم جۆرە زۆرن، بەڵام پرسیاری سەرەکی ئەوەیە، کە ئایا سەرچاوەی مافەکانی نەخۆش بە پێی ئاستی زانیارییەکانیان و بەئاگابوونیان لە مافەکان و خواستەکانیان هەیە، یان دەبێت سەرچاوەی ئەم مافانە لە شوێنێکی دیکەدا بدۆزینەوە و ئەم جۆرە توێژینەوانەش تەنیا لەپێناو هەڵسەنگاندنی ئاگاداربوونی نەخۆشەکان لە مافەکانیان و ئاستی هاتنەدیی ئەو مافانە بزانین؟ لە لایەکەوە ناتوانین سەرچاوەی مافەکانی نەخۆش لە بەئاگایی و بێئاگاییی نەخۆشەکان لە مافەکانیان بزانین، لە لایەکی ترەوە دەبێت ئەوە بزانین، کە پێوەندییەکی ڕاستەوانە لە نێوان پێشکەوتنی کۆمەڵگە و داواکردنی مافە نوێیەکانیاندا هەیە، بۆیە ئاستی هۆشیاری و خواستی نەخۆشەکان نیشانەی گرنگیپێدان و داواکردنی مافەکانیانە.

بە شێوەیەکی گشتی دەتوانین مافە بنەڕەتییەکانی نەخۆش لە چۆنیەتیی پێوەندیی نێوان پزیشک و نەخۆش وەک: وەرگرتنی

خزمەتگوزاری و چارەسەری پزیشکی بەبێ جیاوازی، پاراستنی سنووری شەخسی نەخۆش، مافی پرس و ڕاوێژکردن بە پزیشک یان پزیشکی دیکە، بەجێهێشتنی نەخۆشخانە بە پێی قسەی نەخۆش، مافی سکاڵاکردن لەکاتی هەڵە-چارەسەرکردنی نەخۆشییەکەیدا و هەروەها قەرەبووش بکرێتەوە. نهێنیپارێزی، دادپەروەری، مافی بڕیاردان و مافی دەستڕاگەیشتنی نەخۆش بە زانیارییەکانی نەخۆشییەکەی. لەبارەی ئەم مافەی کۆتاییەوە، پزیشکەکان لەو بڕوایەدان، کە نەخۆشەکان پەیبردنێکی درووستیان بۆ مەسەلە پزیشکییەکان نییە و هەندێ جار بڕیاردانە دەستی نەخۆشەکان لەوانەیە چارەسەرکردنەکە بە لاڕێدا ببات.

هەندێک مافی دیکەش هەن، کە بەرژەوەندییەکانی نەخۆش و پزیشک هەڵاوێر دەکەن، یان هەڕەشە لەسەر کاری پزیشکەکان درووست دەبێت. لەم حاڵەتانەدا کەمتر دەرفەتی بە دواداچوونی یاسایی هەیە. بۆ نموونە، بەدواداچوونی یاسایی، پێویستی بە ناوەندی یاسایی چالاک هەیە بۆ بە دواداچوونی مافی نەخۆشەکان. بە پێی ئەو توێژینەوەیەی پارساپوور و هاوکارەکانی بڵاویان کردووەتەوە، هۆکاری ئەم مەسەلەیە لەوەدایە، کە: "لە هەڵەیەکی قەرەبووکراوەدا لەوانەیە ئاگاداربوونی نەخۆش لەم مەسەلەیە ببێتە هۆکاری شڵەژانی هەڕەمەکی و بێمتمانەیی بە پزیشک. ئەگەر هات و قەرەبووکردنەوەی هەڵەکە پارەی بۆ نەخۆشەکە نەگێڕایەوە، شاردنەوەی هەڵەکە شتێکی ماقووڵ دەبێت، بەڵام لە هەڵەیەکدا

که چارەسەر نەکرێت، ئەوا پێویستە نەخۆشی لێ ئاگادار بکرێتەوە." (هەمان، ٨٩) لەبارەی مافی نەخۆشەوە لە وەرگرتنی زانیارییەکانی لە دۆسیەی نەخۆشییەکەیدا، مادام ئەگەری هەڵەبەکارهێنان و کاریگەریی دەروونیی زانیارییەکان لەسەر نەخۆشەکە هەبێت، ئەم مافەش بۆ نەخۆش بە ڕەوا نابینرێت.

باسوخواسی مافی یەکسانی نەخۆشەکانیش، لە خستنەڕووی بەیاننامەی مافەکانی مرۆڤی ساڵی ١٩٤٨ـەوە سەرچاوە دەگرێت کە لە یەکەم ماددەدا ئاماژە بە ئازادی و کەرامەت و مافی یەکسانیی مرۆڤەکان دراوە. دەتوانین بڵێین هەموو تێڕاونینە جیاوازەکان لەم بارەیەوە لەوەدا هاوڕان، کە پزیشکەکان "ڕێگە نەدەن، جیاوازیی تەمەن، نەخۆشی یان پیربوون، ئایین، ڕەگەز و نەتەوە، ئینتیمای سیاسی و حەزە سێکسییەکان یان تەنانەت پێگەی کۆمەڵایەتییش، کاریگەرییان بەسەر جێبەجێکردنی کارە پزیشکییەکانەوە هەبێت." (انجمن جهانی پزشکی، ٢٠٠٥، ٣١-٣٢)

پزیشکەکان مافی ئەوەیان هەیە، ڕێگە بە چوونەژوورەوەی یەک نەخۆش زیاتر نەدەن، مەگەر بینینی چەند نەخۆشێک لە یەک کاتدا وەک پێویستییەکی چارەسەرکردن بێت، کەچی لەوانەیە هۆکاری ئەم ڕێگرییەش کەمی کات یان نەبوونی توانی زانستیی پزیشک بێت لە چارەسەرکردنی نەخۆشییەکەدا. بۆ چارەسەرکردنی ئەم لایەنەش، ئەنجوومەنی جیهانیی پزیشکی، پێشنیاری کردووە کە: "پزیشک بەرانبەر نەخۆشەکە دەبێت هەموو گەنجینەی زانیارییەکانی بە کار بهێنێت؛ هەر کاتێک پشکنین و چارەسەرێک لە دەرەوەی توانی پزیشکەکەوە بێت،

دەبێت پزیشکێکی دیکەی توانا بۆ سەیرکردنی نەخۆشەکە بانگ بکات." (هەمان، ٢٠٠٥، ٣٢)

هەر وەک پێشتریش ئاماژەمان پێ دا، یەکێک لە مافە بنچینەییەکانی نەخۆش، ڕێزگرتنە لە سەربەخۆبوونی نەخۆش لە بڕیاردان و بەشدارییپێکردنی لە بڕیارە پزیشکییەکانی چارەسەرکردنیدا. ئەم بنەمایە لەسەر دوو ئەرکی دوولایەنەی پزیشک و نەخۆش ڕاوەستاوە: لە لایەکەوە، پێویستە پزیشک وەک کەسێکی پسپۆڕ نەخۆشییەکە دیاری بکات و باشترین چارەسەر بخاتە بەردەستی نەخۆشەکە و لە لایەکی تریشەوە نەخۆشەکە بە لێکدانەوەی چارەسەری پێشنیارکراوی پزیشک بە پێی هەلومەرجی دارایی، پیشەیی و دەروونیی خۆی، هاوکاریی پزیشک بکات بۆ دەستنیشانکردنی ڕێگەچارەی گونجاو و بەرەوپێشەوەبردنی پرۆسەی چارەسەرکردنی نەخۆشییەکەی. ئەو تایبەتمەندییانەی لەم بوارەدا دەخرێنە ڕوو، وەک گوێپێنەدانی پزیشک بە بڕیارەکانی نەخۆش و دەستنیشانکردنی ئەو چارەسەرەی خۆی بە لایەوە پەسەندە و پێویست بە ڕەزامەندیی نەخۆش ناکات. بەڵام لە سەردەمی ئێستادا، بە پێی ئەو بنەما لیبراڵییانەی باڵیان بەسەر کۆمەڵگەکاندا کێشاوە، "نەخۆش، مافی ئەوەی هەیە هەنگاوەکانی چارەسەرکردنی نەخۆشییەکەشی ڕەت بکاتەوە. ئەمە بنەمایەکی یاسایی و مۆڕاڵییە." (لاریجانی، ١٣٨٣، ١٥٠) بە شێوەیەکی گشتی ڕێزگرتن لە سەربەخۆبوونی نەخۆش لە بڕیاردانیدا چەند پێوەرێکی هەیە، کە لێرەدا ئاماژە بە هەندێکیان دەکەین:

متمانەکردن لە پزیشکیدا، یەکێکە لە پێوەرەکانی ڕێزگرتنی سەربەخۆبوونی نەخۆش. پابەندبوون بە بەڵێنیشەوە، یەکێکی دیکەیە لە بنەماکانی ڕێزگرتن لە کەسێتی و سەربەخۆبوونی تاکەکان و لەسەر پاراستنی گیان و بەرژەوەندییەکانی نەخۆشەکە جەخت دەکاتەوە و هەمیشە لەپێش بەرژەوەندییە کەسییەکانەوەیە. هەروەها ڕێزگرتن لە تاکەکان بە ئامادەبوون لە وادەی دیاریکراوی چاوپێکەوتنی نەخۆش، کە باشترین نیشانەی پەیمان-بردنەسەرە. یەکێکی دیکەیە لەو شارەزاییە کردەییانەی کە لە بواری ڕێزگرتنی نەخۆش و پاراستنی سەربەخۆیی نەخۆشەکان لە بواری پزیشکیدا، پزیشک دەبێت بە دەستی بهێنێت، بریتییە لە توانی درووستکردنی پێوەندی لە نێوان نەخۆش و سەردانکەرەکاندا. (زالی، ١٣٨٧، ٤١) هەستیاریی ئەم مەسەلەیە زیاتر لە بواری جوانکاریدا خۆی دەبینێتەوە. لەم جۆرە بوارانەدا خواست و ویستی سەرادانکەرەکان گرنگیی زیاتری هەیە، چونکە وەک کەسێکی نەخۆش سەیر ناکرێت، بەڵکوو بە دوای بەدیهێنانی خواستەکەیەوەیەتی، بەڵام لەم بوارەشدا هەندێک جار ئەو جوانکارییەی سەردانکەرەکە یان کەسوکارەکەی دەیانەوێت، لەگەڵ تەندرووستیی خوازیارەکەدا دژبەیەک دەبن، کە لەم حاڵەتانەشدا پێوستە پزیشک و بەخێوکار و سەرپەرشتیاری کەسەکە لە سەرەنجامەکانی نەخۆشییەکە ئاگادار بکاتەوە و بەر لە ئەنجامدانی هیچ کارێک، ڕەزامەندیی ئەوان بە دەست بهێنێت.

ڕۆڵی دادگاش لە بڕیاردانی کۆتاییدا لەو کاتانەدایە کە دەرمانێکی بێ کاریگەر یان تێنەگەیشتنێک لە نێوان پزیشک یان تیمی پزیشکیدا لەگەڵ سەردانکەر یان کەسوکاریدا درووست دەبێت. نابێت پزیشکەکانیش هەر جۆرە چارەسەرێک بە پێی خواستی سەردانکەرەکەیان ئەنجام بدەن. "لە کتێبی بەرپرسیاریەتییە یاساییەکانی پزیشکان و نەخۆشخانەکان لە کەنەدا، باس لەوە کراوە، کە ناکرێ زۆر لە پزیشکان بکرێت بۆ خستنەڕووی ئەو دەرمانانەی کاریگەرییەکی ئەوتۆیان نییە. هەروەها پزیشک هیچ بەرپرسیاریەتییەکی لە ئەستۆدا نییە، کە نەخۆش یان سەردانکەر ناچاری بکات ئەو دەرمانەی بۆ بە کار بهێنێت، کە بە بڕوای پزیشک پێچەوانەی بەرژەوەندییە باڵاکانی کەسەکەیە." (لاریجانی، ١٣٨٣، ١٥٣-١٥٤)

مادام هەر جۆرە دەرمانێکیش زیانی لاوەکیی تێدایە، کە واتە مافێکی دیکەی نەخۆشەکان دێتە کایەوە، ئەویش بەدەمەوەبوونی سوودمەندانەیە بۆ نەخۆش و ڕێگریکردن لە زیانبەرکەوتنی. دیاریکردنی ڕاددەی زیانەکان و کاریگەرییە لاوەکییەکانی دەرمانە جۆربەجۆرەکان، خۆی لە خۆیدا پێویستی بە شارەزاییی پێویست لە بواری پزیشکیدا هەیە، بیروباوەڕی ئایینی، لایەنی مەعنەوی و دۆخی نەخۆش، چونکە "ئەگەری ئەوە هەیە، چارەسەرێک بۆ نەخۆشێک سوودی هەبێت، بەڵام بۆ کەسێکی دیکە بە هەمان نەخۆشییەوە کاریگەریی نەرێنی و زیانی جەستەیی و ڕۆحیی تێدا بێت."*

---

* Picard, El, Robertson

هەندێ کاتیش پێویستە پزیشک لێکۆڵینەوەی جیا بۆ نەخۆشییەکە و کاریگەرییەکانی دەرمانەکان بۆ سەر جەستە بکات. لەوانەیە لە نەخۆشێکدا خودی نەخۆشییەکە لە چاو کاریگەرییەکانی بەکارهێنانی دەرمانەکاندا، مەترسیی کەمتری هەبێت. لەم کاتەدا بڕیاردان لەبارەی بەکارهێنانی دەرمانەکانەوە پێویستی بە ئیجتیهادی پزیشک، ڕاددەی ڕەزامەندیی نەخۆش و هەڵبژاردنی دەرمانەکەیە لە لایەن نەخۆشەوە.

بە شێوەیەکی گشتی، بۆ ئەوەی ئەم مەترسییانە بەرۆکی پزیشک نەگرن و بتوانن بەوپەڕی ئاسوودەییەوە بڕیار لە چارەسەرکردنی نەخۆشەکان بدەن، مەسەلەی وەرگرتنی ڕەزامەندی لە نەخۆش یان لە کەسوکاری نەخۆش دێتە کایەوە. بۆیە لێرەدا لەبارەی پزیشک و نەخۆشەوە دەگەینە مەسەلەیەکی زۆر گرنگ، کە ئەویش وەرگرتنی ڕەزامەندییە لە نەخۆشەکە یان لە کەسوکارەکەی. هەڵبەت هەندێک جار نەخۆشیش لە ڕووی هوشیاری، تەمەن، ڕەگەز و... هتدیەوە لە دۆخێکدایە، کە خۆی ناتوانێت ڕەزامەندی بدات. لە وەها کاتێکدا کە نەخۆشەکە لە بڕیارداندا شپرزەیە، دەکرێت وەرگرتنی ڕەزامەندییەکە لە کەسوکاری پلە یەکی نەخۆشەکە بێت، کە لە درێژەی ئەم بابەتەدا ئاماژە بە چەند نموونەیەکی تایبەتی لەم شێوەیە دەدەین.

جگە لە وەرگرتنی ڕەزامەندی، پێویستە هەر پزیشکێک لە بەرانبەر نەخۆشەکەیدا کۆمەڵێک شارەزایی و کارامەیی هەبێت، تاوەکوو بتوانێت چارەسەری گونجاوی نەخۆشییەکە بکات،

وەکوو: "لێهاتوویی لە وەرگرتنی وردترین قسە و دۆخی نەخۆش لەبارەی نەخۆشییەکەیەوە، لێهاتوویی لە پشکنینی نەخۆشییەکەدا بە شێوەیەکی زۆر باش، لێهاتوویی لە دروستکردنی پێوەندی لەگەڵ نەخۆشدا، لێهاتوویی لە تێگەیاندنی نەخۆش بە پێی بەڵگە و نموونە، لێهاتوویی لە دەستنیشانکردنی دروستیی نەخۆشی، هەروەها توانستی بەکارهێنانی زانستە تیۆرییەکان لە چارەسەرکردن و چاودێریکردنی نەخۆشدا." (لاریجانی، ١٣٨٣، ٢٥) جا لێرەدا دیاریکردنی هەر کەموکوورییەک بە هۆی نەبوونی ئەم لێهاتووییانەوە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو یاسایانەی لە هەر وڵاتێکدا لەم بارەیەوە هەن.

هەر وەک ئاماژەمان پێ دا، یەکێک لە مەسەلە گرنگەکان، وەرگرتنی ڕەزامەندیی نەخۆشەکەیە لەو کاتانەدا، کە نەخۆشەکە گرفتێکی سەرەکیی لە بڕیاردان و ڕەزامەندیی دەربڕیندا هەیە، ئیتر ئەم ڕەزامەندییە لە خۆی وەربگیرێت، یاخۆ لە کەسوکاری پلە یەکی وەربگیرێت. ئەم خاڵە ئاماژەیە بە ڕێزگرتن لە سەربەخۆبوونی نەخۆش لە بڕیارداندا. لەم سۆنگەیەوە ئەنجوومەنی گشتیی پزیشکانی ئەمەریکا، بەم شێوەیە باسیان لە مافی نەخۆش لە وەرگرتنی زانیاری لەبارەی کار و ڕەوتی چارەسەرکردنەکەیەوە کردووە. نەخۆشەکان مافی ئەوەیان هەیە لە دۆخی نەخۆشییەکەیان و هەنگاوەکانی چارەسەرکردنیدا زانیارییان هەبێت، بەڵام ئاستی ئەو زانیارییانەی بە نەخۆشەکە دەدرێن، بە پێی سرووشتی

نەخۆشییەکە، ئاڵۆزیی پرۆسەی چارەسەرکردنەکە، مەترسییەکانی دەرمانەکان و نەشتەرگەرییەکان و خواستی نەخۆشەکانیش گۆڕانکارییان بەسەردا دێت.

بەرەوپێشچوونەکانی ئەم بوارە گەیشتووەتە ئاستێک، کە دەکرێت بەدواداچوونی یاسایی بۆ پزیشک بکرێت، ئەگەر هات و ڕەزامەندیی نەخۆشەکەی وەرنەگرتبوو. ئەو سێ بنەمایەش، کە هەق بە بڕیاری نەخۆشەکە دەدەن بریتین لە:

١. زانیاریی پێویست خرابێتە بەردەستی نەخۆشەکان؛

٢. نەخۆش توانی تەواوەتی بۆ دەربڕینی ڕەزامەندی هەبێت و لە ڕووی ئاوەزییشەوە توانی وەرگرتنی زانیارییەکان و بڕیاردانی درووستی هەبێت؛

٣. دەبێت بڕیاری نەخۆشەکە لەوپەڕی خواست و ویستی خۆیدا بێت.

بەڵام لەم بوارەدا هەندێک کەیسی تایبەتیش هەن، کە وا دەکەن ئەم مەسەلەیە لە شێوە گشتی و فراوانەکەی بێتە دەرەوە و تەنیا ڕەزامەندیی دەربڕینی نەخۆشەکە جێی مەبەست بێت. بۆ نموونە، ئایا ڕەزامەندیی دایکێک لەبارەی کۆرپەلەیەکەوە کە هێشتا توانی بڕیاردانی نییە، بەسە دەبێت یان نا؟ لە هەندێک کاتدا وەرگرتنی ڕەزامەندی لەگەڵ ژیانی نەخۆشەکەدا تێکەڵ دەبێت، بۆ نموونە ٭هەندێ جار سەرەڕای مکوڕبوونی پزیشکەکان بۆ ئەنجامدانی نەشتەرگەریی خێرا، یان بڕینی ئەندامێکی جەستە، نەخۆش یان کەسوکارەکەی ڕەزامەندی دەر نابڕن و نەخۆشەکەش دەکەوێتە مەترسییەکی گەورەوە،

تەنانەت لەوانەیە ڕووبەڕووی مردنیش بێتەوە. لەم دۆخەدا پێویستە دۆخی نەخۆشەکە لە ڕێگەی پزیشکی دادوەرییەوە چاودێری بکرێت و بە پشکنینی نەخۆش ڕێگەپێدانێکی یاسایی دەر بکرێت، کە لەبەرژەوەندیی ژیانی نەخۆشەکەدا بێت و کەسوکاری نەخۆشەکە ئیتر ناتوانن ڕێگە لە کاری پزیشکەکان بگرن. ئەگەر ڕازینەبوونی دایکوباوکیش ببێتە هۆی مردن و لەناوچوونی منداڵەکە، باشتر وایە لیژنەیەکی دوو-سێ-کەسی پێک بهێنرێت و لە دادوەری گشتیدا مافی سەرپەرشتیکردن لەو دایکوباوکە بسەنرێتەوە و دادوەری گشتی، خۆی بڕیاری پێویست بدات." (دیبایی، ١٣٨١، ١٩٨-١٩٩)

لە هەندێک حاڵەتیشدا وەک ڕووداوەکانی هاتوچۆ و هاوشێوەی ئەم حاڵەتانە، کە کەسوکاری نەخۆشەکە ئامادە نین و نەخۆشەکەش لە دۆخێکدا نییە، ڕەزامەندی پێشان بدات یان نا، لەم کاتەدا "ڕای لیژنەی سێکەسیی پزیشکانی نەخۆشخانە کاری پێ دەکرێت و پێویستە ڕاپۆرتی ئەم لیژنەیە بگاتە دەستی لایەنی دادوەری و یاسایی، بۆیە نابێت لە چارەسەرکردنی برینداردا، بە بیانووی ئامادەنەبوونی کەسوکاری یان ڕەزامەندیدەرنەبڕینی خۆی، تەنانەت لە بڕینی ئەندامێکی نەخۆشەکە دوودڵی بنوێنرێت." (هەمان، ٩٨) ئەگەر هات و لە بارێکی زۆر تایبەتیشدا تەنیا یەک پزیشک لە نۆڕینگە یان لە نەخۆشخانەدا هەبوو، دەرفەتی گواستنەوەی نەخۆشەکەش بۆ شوێنێکی باشتر نەبوو، پزیشک دەتوانێت بە نووسینی بارودۆخەکە و کەسانی ئامادەبوو و وەرگرتنی واژوو لێیان (کە

دەبێ پەرستار و کادیرانی دیکەی نەخۆشخانەشی تێدا بێت) بە هێمنی و ئارامییەوە ئەرکی خۆی لە چارەسەرکردنی بریندارەکەدا جێبەجێ بکات.

بە شێوەیەکی گشتی دەتوانین بڵێین وەرگرتنی ڕەزامەندیی نەخۆش یان کەسوکارەکەی یان وەرگرتنی ڕەزامەندیی ژنومێرد بۆ یەکدی، ڕووبەڕووی چەندان دۆخی جیاواز دەبێتەوە، کە هەندێک جار وا لە پزیشکان دەکات چاوەڕێی ڕەزامەندیی نەخۆش و کەسوکارەکەی بن، هەندێ جاریش پێویستە پزیشک چاوەڕێی ڕەزامەندی نەبێت، بەڵام بە پێی یاسایەکی تا ڕادەیەک گشتگیر تەنیا لەو حاڵەتانەدا دەتوانرێ چاوەڕێی دەربڕینی ڕەزامەندی نەکرێ، کە مەترسی بۆ سەر گیانی نەخۆشەکە هەیە و پشت بە بڕیاردانی پزیشک و تیمی پزیشکی دەبەسترێت. لە هەندێ حاڵەتیشدا نەخۆشەکە خێزاندارە و پێویستە جگە لە کەسوکاری نەخۆشەکە، خێزانەکەیشی ڕەزامەندی نیشان بدات.

تەنانەت لە هەندێک حاڵەتی تایبەتیدا دەکرێت پزیشکان خۆیان لە ڕەزامەندیی هاوسەرێک ببوێرن، بۆ نموونە، ئەگەر هات و بابەتەکە پێوەست بوو بە کۆئەندامی زاوزێی ژنەوە، ئەوا پێویست دەکات مێردەکەی ڕەزامەندی پیشان بدات، بەڵام ئەگەر ئەنجامنەدانی نەشتەرگەری، مەترسیی بۆ سەر گیانی ئافرەتەکە درووست بکات، لەم کاتەدا هیچ پێویست بە وەرگرتنی ڕەزامەندیی مێردەکە ناکات و تەنیا ڕەزامەندیی ژنەکە بەسە.

لە هەندێک حاڵەتیشدا، لەپێناو بەرژەوەندیی کۆمەڵگەدا هیچ پێویست بەوە ناکات ڕەزامەندی لە نەخۆش یان خێزان و

کەسوکاری وەربگیرێت. لە نموونەی ئەم حاڵەتانەشدا وەک: پشکنینی ئەو کەسانەی گومان دەکرێت تووشی نەخۆشی گوازراوە بووبن، نەخۆشی نەخۆشخانەکانی فریاکەوتن، پشکنینەکانی پزیشکی دادوەری، پشکنینی ئەو کەسانەی لە ناوچە گومان-لێکراوەکانی دەرەوەی وڵات دەگەڕێنەوە بۆ وڵات و ئەگەری بوونی نەخۆشیی گوازراوەیان لێ دەکرێت، هەروەها "لەو حاڵەتانەدا کە باوانی منداڵی خوار تەمەن ١٦ ساڵ ڕێگە بە پشکنین و چارەسەرە پزیشکییەکانی نەخۆشخانەکانی فریاکەوتن نادەن، لەم کاتەدا بڕیاری پزیشک بە پێی ویژدانی خۆی و قانوون دەبێت." (هەمان، ٢٠١) بەڵام دەبێت ئەوەمان لە یاد نەچێت، کە کەموکورتیی پزیشک لە چارەسەرکردنی نەخۆشدا پێوەندیی بە وەرگرتن و وەرنەگرتنی ڕەزامەندییەوە نییە و هەڵەی پزیشک شایەنی سزادانە.

نهێنیپارێزیی پزیشکیش، یەکێکە لە بنەماکانی پیشەی پزیشکی. ڕاستییەکەی پاراستنی نهێنیی نەخۆشەکان بەشێکە لە ڕێزگرتن لە بڕیاردانی سەربەخۆییانەی نەخۆش و پاراستنی ڕێز و کەرامەتیان. هەر لەم بوارەدا لە سوێندنامەکەی هیپۆکریتۆسدا باس لەوە دەکرێت، کە "ئەو شتانەی لەکاتی کاری پزیشکیم و تەنانەت لە دەرەوەی کارەکەشم لەبارەی ژیانی خەڵکییەوە دەیبینم و دەیبیستم و پێویستە باسیان نەکەم، بە هیچ کەسێکیان ناڵێم، چونکە ئەم جۆرە شتانە دەبێت بخرێنە خەزینەی نهێنییەکانەوە." (اعتمادیان، وەرگیراو لە دەقی سوێندنامەکەی بوقرات، ١٣٤٢، ١٤)

پاراستنی نهێنی، دەبێتە هۆی ئاسانکاری لە پرۆسەی چارەسەرکردنی نەخۆشیدا، بەڵام لێرەدا پرسیارێک درووست دەبێت، کە: ئایا ئەم بنەمای نهێنیپارێزییە، بنەمایەکی رەهایە یان دەکرێت لە هەندێک دۆخدا کاری پێ نەکرێت؟ لە وەلامی ئەم پرسیارەدا پێویستە چەند خاڵێکمان لە بەرچاو بێت: (یەکەم،) دیاریکردنی سنوورەکانی نهێنیپارێزی لە هەر وڵات و کولتوورێکدا دەگەڕێتەوە بۆ یاسا دانراوەکانی ئەو کۆمەڵگەیە، کە ئەم یاسایانەش بە پێی مرۆڤناسی، کۆمەڵناسی و کولتووریی وڵاتەکە دیاری دەکرێن. بۆیە لە چەند حاڵەتێکدا پزیشک بە ئامانجی ڕێگریکردن لە تەشەنەسەندنی نەخۆشییەک دەتوانێت ناوی نەخۆشەکە بە مەبەستی چاودێری و چارەسەرکردنی بداتە شوێنە پێوەندیدارەکان. لە پشکنینەکانی پێش هاوسەرگیریدا ئەگەر گرفتێک لە لای یەکێک لە کوڕ و کچەکە هەبێت، ئەرکی پزیشک ئەوەیە بۆ پاراستنی هێمنی و ئارامیی ژیانیان ئەوی دیکەیان لە نەخۆشییەکە ئاگادار بکاتەوە.

نموونەیەکی دیکەی باوی ئەم بوارە، ئەو پشکنینە پزیشکیانەیە کە بە مەبەستی پێدانی مۆڵەتی کارکردنە جۆرەبەجۆرەکانە لە کۆمەڵگەدا. لەم کاتەدا پزیشک بەبێ ئەوەی پابەندی بنەمای نهێنیپارێزی بێت، دەتوانێت نەخۆشی و ناوی کەسەکە ئاشکرا بکات، تاوەکوو لەم ڕێگەیەوە بەرژەوەندییەکانی کۆمەڵگە پارێزراو بن.

هەر لەم بوارەدا، جگە لەو شتانەی باس کران، زۆربەی وڵاتەکان بە پێی کولتوور و بیروباوەڕیان سوێند دەخۆن. بۆ

نموونه له ئێراندا مەرجێکی دیکەش هەیە، کە بەم شێوەیە له سوێندنامەی وەزارەتی تەندرووستی و چارەسەر و فێرکردنی پزیشکیدا هاتووه: "من له بەردەم قورئاندا بە خودای بەرزی توانا، کە ئاگای لە هەموو شتێکە و هەموو بوونەوەرەکان لە دەسەلاتی ئەودا دێن و دەچن، سوێند دەخۆم، کە نهێنیی نەخۆشەکان -جگە لەو کاتانەی پێویستییەکی شەرعی دێتە ئاراوە- بپارێزم و لە هەموو کاتێکدا خودا بە چاودێری کارەکانی خۆم بزانم." (لاریجانی، ١٣٨٣، ٣٠)

(ڕاستگۆیی) یەکێکی ترە لەو مەسەلانەی لەگەڵ نهێنیپارێزیدا جیاوازیی هەیە، کە ئەوەیش چەند مەسەلەیەک لە خۆ دەگرێت. بۆ نموونە، لە چ دۆخێکدا دەتوانین نەخۆشییەک بشارینەوە؟ تا چ ئاستێک دەبێت ڕاستییەکان بە نەخۆش بوترێن؟ لە چ کاتێکدا دەبێت ڕاستییەکان کەم کەم و هێواش هێواش بخرێنە بەردەستی نەخۆش؟ لەگەڵ چەندان مەسەلەی دیکەی لەم شێوەیەدا. هەر وەک دیارە، بەشێکی زۆری ڕاستگۆییی پزیشک بەرانبەر نەخۆشەکە دەگەڕێتەوە بۆ ئاستی توان و درکی نەخۆشەکە لە بیستنی ڕاستییەکان و جۆری نەخۆشییەکەیدا. هەر لەم بوارەشدا لەنێو کولتوورەکان و قوتابخانە فیکرییە جۆربەجۆرەکاندا ڕادەی جیاوازیی ڕاستگۆییمان بۆ دەر دەکەوێت، بۆ نموونە "بە پێی تیۆریی ئەرک و بەرپرسیاریەتی (لە قوتابخانەی کانت) کە لایەنگریی زۆری هەیە، ئەرک لای کانت بە هیچ شێوەیەک ئەرکێکی دەرەکی نییە کە پێوەندیی بە ڕووداوێک یان دۆخێکی کۆمەڵایەتی، یان سایکۆلۆژیاوە هەبێت،

چونكە ئەوەی لەو دۆخانەدا ئەنجام دەدرێت، ناچێتە چوارچێوەی ئەركەوە، بەڵكوو پێداویستییەك یان دەسپێكی سایكۆلۆژی و كۆمەڵایەتییە، مرۆڤ بە كردنی ناچار دەكات. كردنیشی لە خۆیدا بۆ خۆی نییە، بەڵكوو لەپێناو ئامانجێكی دیكەی دیاریكراودایە و بەمەش ئەو كردەیەی لە دۆخە كۆمەڵایەتییەكەدا وەك ئەرك نیشان دەدرێت، ئەرك نییە و ناچارییەكی دەرەكییە كە مرۆڤ دەبێت بیكات، بەڵام ئەمە بە مانا جیهانییەكەی ئەرك نایەت، چونكە لە ئەركدا دەبێت گوێ لە داخوازیی عەقڵ بگیرێت، بەوەی كردەیەكی فەرمانی لە ئارادایە و داوای كردنی دەكرێت بەبێ ئەوەی بیر لە هیچ ئەنجامێكی دیكە یان هیچ جۆرە بەرژەوەندییەك لە ئەنجامدانیدا بكرێتەوە. كاتێك كردەیەك بەم جۆرە كرا، دەتوانرێت بگوترێت ئەركێكی مۆڕاڵی جێبەجێ كراوە.

كانت بە شێوەیەكی بنەڕەتییانە واتا بە چەمكی (ئەرك) دەداتەوە، بە ڕای كانت، ئەرك كۆڵەكەی پرسە مۆڕاڵییەكانە. هەموو كردەوەیەكی مۆڕاڵی ئەركە و دەبێت جێبەجێ بكرێت، هەروەها بە هۆی ئەوەی ئێمە ناتوانین خۆمان لە ئەرك دەرباز بكەین و لەو ڕووەوە ئەرك تایبەتمەندیی پێشینەیی و فەرمانی ڕەها دەبەخشێتە پرسە مۆڕاڵییەكان، باشتر وایە بۆ هەر كارێك ئەرك ببێتە بنەما بۆ حەز و ئارەزۆكانمان. بەڵام حەز و ئارەزۆ خۆی ئەركێكی پێشینەییی فەرمانێكی ڕەهایە، ئەمەش لە هەردوو كردەی سەرەكیی ژیاندا، خواردن و سێكس دوو حەز و ئارەزۆی كوشندەن و لە هەمان كاتدا گرینگترین ئەركی مرۆڤن

لە ژیاندا. بەبێ ئەم دوو حەزە ژیان مەحاڵە، واتا ئێمە وەک یاسایەکی گشتیی مۆڕاڵی چێژ لە ئەرک دەبینین. ئەو وای دەبینێت کردەوە بۆ ئەوەی بەهایەکی مۆڕاڵی هەبێت، دەبێت لەگەڵ ئەرکدا گونجاو بێت، دەبێت کردەوەکان و هەڵسوکەوتەکان لەپێناو ئەرکدا بێنە بەرهەم، وێڕای ئەمە کانت ئەو کارانە لە یەکتر جیا دەکاتەوە کە پێوەستە بە تێرکردنی ئارەزووەکانەوە و هیچ پاڵنەرێکی چاکە لە پشتیانەوە ئامادەگیی نییە و هەر بۆیەش نابنە ئەرک. ئەو پێی وایە ئەو کردارانە تەنها بە گوێرەی ئارەزوو جێبەجێ دەکرێن. ئەوە بەهایەکی مۆڕاڵییان نییە، بە پێچەوانەشەوە ئەو کردارانەی لەپێناوی ئەرکدا جێبەجێ دەکرێن، بێ ئەوەی هیچ ئارەزوویەک بۆ ئەنجامدانیان هەبێت، ئەوە ئەو کردارانە خاوەنی بەهای مۆڕاڵین، چونکە ئەرک بریتییە لە "پێویستیی بەدەستهێنانی کردەوە و ڕێزگرتن لە یاسا، ئەو هەستەش لەوەوە سەر هەڵدەدات کە لە ناخماندا هەست بە ئیرادەی چاکە بکەین بۆ ملکەچبوون بۆ یاسا بەبێ هیچ لێکدانەوەیەکی هەستەکی. ئەو ملکەچبوونەش بۆ یاسا خۆی لە خۆیدا هەستی خۆبەکەمگری دەهێنێتە ئاراوە، لەبەر ئەوەی یاسای مۆڕاڵی، بەرهەڵستیی هەستەکان دەکات و هەستی لەخۆباییبوون لاواز دەکات و وا لە مرۆڤیش دەکات کە هەمیشە هەست بە خاکیبوون و لە بەرانبەریشدا هەست بە بالایی و سەربەرزی بکات، لەبەر ئەوە لە ناخی خۆیدا درک بەوە دەکات هۆشیارییەکانی لە خودێکی ئازادەوە سەرچاوە دەگرن، نەک لەژێر هێزێک و ترسێکی دەرەکیدا." لە ئێستادا لە بەشێکی زۆری

ولاتانی وەک ئینگلیز و ئەمەریکادا جەخت لەوە دەکرێتەوە کە هەموو ڕاستییەکان بۆ نەخۆشەکە باس بکرێن." (هەمان سەرچاوە، ٢٩)

تیۆریی دیکەش هەن، کە هەڵویستی جیاواز بۆ دەربڕینی ڕاستییەکان پێشنیار دەکەن؛ بۆ نموونە تیۆریی سوودگەرایی، ئەم تیۆرییە لە دوو بنەمای سەرەکی پێک هاتووە: بنەمای ئەنجام٣*، کە پێداگری لە تایبەتمەندیی ئاکام-سەنتەر٤*یی ئەم تیۆرییە دەکاتەوە و بنەمای سوود، جەخت لەسەر بەستێنی چێژسەنتەریی ئەم تیۆرییە. بە گشتی بە پێی بنەمای ئەنجام، ڕەوابوون و ناڕەوابوونی کردەوەیەک، پێوەندییەکی پتەوی لەگەڵ شوێنەوار، ئاکام و لێکەوتەکانی ئەم کردەوەیەدا هەیە. لێرەدا پەیامی کردەوەکان زۆر گرینگن، بۆ بەدەستهێنانی پێگەی ڕەوابوون یان ناڕەوابوون، ڕۆڵێکی بەرچاو دەگێڕن. بنەمای سوودگەرایی، جەخت لەوە دەکاتەوە کە تەنیا شتگەلێک لە بنەڕەتەوە باشن، کە چێژ و دابینکەری ئاسایشن. ئامانجی زۆرترین چێژ و ئاسایش، کەمترین ئازار و ژانە. بۆ گەیشتن بە پێگەی ڕەوابوونی مۆڕاڵیی (کردەوەکەمان) یارمەتیمان دەدات. لە سەرەتاوە ئاماژەی پێ کرا، دیارترین تیۆریی ئەنجام-سەنتەری، سوودگەراییە؛ ئەم تیۆرییە یەکێک لە دیارترین تیۆرییەکانی مۆڕاڵ، کە پێوەری بۆ هەڵە یان درووستبوونی کردەوە ئەوەیە، ئایا کردەوەکە چەندە سوود و چەندە زیانی

---

* Consequentialist
* Utility principle

هەیە. سوودگەرایی، وەکوو وانەیەکی فەلسەفی لە سەرەتادا بە چالاکییە هزرییەکانی هاچسۆن * و هیوم دەستی پێ کرد، پاشان لە نووسراوەکانی میل و بێنتامدا گەشەی سەند. (دباغ، ١٣٨٨: ١٥١) لە لایەکی ترەوە ئەم تیۆرییە پێی وایە وتنی هەموو ڕاستییەکان دەبێتە هۆی دروستبوونی پێوەندییەکی بەهێز لە نێوان پزیشک و نەخۆشدا. پزیشک جگە لە پاراستنی نهێنی و وتنی ڕاستییەکان، دەبێت ڕێز لە بیروباوەڕ و هزر و بیری نەخۆش بگرێت. ئەم کارە دەبێتە هۆی باشتربوونی پێوەندیی نێوان پزیشک و نەخۆش، بۆیە لەم پێناوەدا لە کتێبێکدا، کە بۆ فێرکردن و ڕۆشنبیریی پزیشکە گشتییەکان (GP)ی سیستەمی تەندرووستی ئینگلیز (NHS) داڕێژراوە، بەشێکی کتێبەکە بۆ ناساندنی کولتوورە جیاوازەکانە. (هەمان سەرچاوە، ٣١-٣٢) ئامانج لەم کارەش ئاشنابوونی پزیشکەکانە بە ئایین و بیروباوەڕی نەخۆشەکان و دوورکەوتنەوە لەو گوفتار و کردارانەی پێچەوانەی لایەنی ئایینیی نەخۆشە بێت. ڕێزگرتن لە بیروباوەڕی نەخۆش جگە لەوەی پێوەندیی نێوان پزیشک و نەخۆش ئاسان دەکات، ناشهێڵێت پزیشک بیروباوەڕەکانی خۆی بەسەر نەخۆشەکەدا بسەپێنێت و بەم هۆیەوەشەوە هەنگاوەکانی چارەسەرکردنی نەخۆشییەکە بە لاڕێدا برۆن. ئەم حاڵەتەش لە هەندێک سوێندنامەدا پێشبینیکراوە، بۆ نموونە، لە سوێندنامەی جنێڤدا نووسراوە: (من ڕێگە نادەم لایەنی ئایینی،

---

* Francis hutcheson

نەتەوایەتی، ڕەگەزایەتی یان پلەوپایەی کۆمەڵایەتی بکەوێتە نێوان من و نەخۆشەکەمەوە.) (اعتمادیان، ١٣٤٢، ٢٩)

لە کۆتاییشدا ئاماژە بە پێوەندییە داراییەکانی نێوان پزیشک و نەخۆش دەدەین. وڵاتان لە ڕێگە یاساییەکانیانەوە هەوڵ دەدەن پێوەندییە داراییەکانی پزیشک و نەخۆش ڕێک بخەن و لەم پێناوەشدا بیمەکانی کەرتی تەندرووستی، ڕۆڵی گرنگ دەگێڕن. بەڵام ئەوەی لەم بەستێنەدا گرنگیی هەیە، چۆنیەتیی تێڕوانینی پزیشکە بۆ نەخۆش؛ نابێت پزیشک بە چاوی کڕیارەوە سەیری نەخۆش بکات. هەر وەک لە بابەتی سەربەخۆییی نەخۆش لە بڕیاردان و ڕێزگرتن لە ڕایەکەیدا ئاماژەمان پێ دا، دەبێت ئەم ڕێزگرتنە بە پێی خەمەکانی نەخۆش بێت، لەبارەی خەرجی و تێچوونە پزیشکییەکانەوە و دەبێت نەخۆش لەشساغیی خۆیشی لە سەرووی هەموو شتێکەوە دانابێت. ڕوونە کە ئەم کارەش بەشێکی بۆ تێڕوانینی پزیشک بۆ پیشەکەی و نەخۆشەکەی دەگەڕێتەوە و بەشێکیشی بۆ ئاستی ئابووری و کۆمەڵایەتیی کۆمەڵگە.

لەگەڵ پێشکەوتنە بەرچاوەکان و ڕێگە نوێیەکانی چاندنی ئەندامانی جەستە و باشترکردنی شێوەکانی گونجاندنی بەخشەری ئەندام و وەرگری ئەندام، لەم ساڵانەی کۆتاییدا ئەم بەشەی زانستی پزیشکی، پێشکەوتنی بەرچاوی بە خۆیەوە بینیوە. ئەم پێشکەوتنانە، تەنیا لە جۆری چاندنەکاندا خۆیان نابیننەوە، بەڵکوو سەرەنجامە درێژخایەن و کورتخایەنەکانی چاندنیش لە خۆ دەگرن. لە ئێستادا چەندان نەخۆش لە ڕێگەی چاندنی ئەندامانەوە درێژە بە ژیانیان دەدەن، لە مردن ڕزگاریان دەبێت، یان ژیانێکی باشتریان بۆ فەراهەم دەکرێت. سەرەڕای زیادبوونی جۆرەکانی چاندنی ئەندامەکان، یەکێک لە گرفتە باوەکانی ئەم بوارە لە زۆربەی وڵاتان و سەنتەرەکانی تایبەت بەم کارە، کەمیی ئەندامانی تایبەت بە چاندن و نەگونجانی ئەندامە چێنراوەکانە لەگەڵ جەستەی تێچێنراودا. لە لایەکی تریشەوە، ئەگەر بێت و ئەم گرفتەش چارەسەر بکرێت، هەندێک تێبینیی مۆڕاڵیی گرنگ لەبارەی ئەم کارەوە خراونەتە ڕوو. لە سۆنگەی گرنگیی چاندنی ئەندامانی جەستەوە، زۆربەی وڵاتان سەرقاڵی دۆزینەوەی ڕێگەچارەی مۆڕاڵین.

زۆر دەمێکە لە ناوەندە زانستی و کۆمەڵایەتییەکاندا بابەتی مردنی مێشک*و ئەگەری بەکارهێنانی لە چاندنی ئەندامەکاندا قسەوباسی لەبارەوە کراوە. (سەرکەوت، ١٣٩٣، ١٤٥) چاندنی ئەندامە گرنگەکانی وەک دڵ، گورچیلە، سییەکان، جگەر و چاو لەو کەسانەی تووشی مردنی مێشک بوون، پێش وەستانی دڵیان، گرنگییەکی زۆری هەیە، چونکە ئەم ئەندامانە دەبنە هۆی ڕزگارکردنی ژیانی کەسێکی دیکە، بەڵام لایەنی کولتووری، ئایینی، یاسایی و مۆڕاڵیی مشتومڕی زۆری بە دوای خۆیدا هێناوە. گرنگیی کاریگەریی لایەنە یاسایی و مۆڕاڵییەکان لە مردنی مێشکدا بووەتە هۆی ئەوەی قسەوباسەکانی ئەم بوارانە تەنیا لە بواری پزیشکیدا کورت نەبنەوە، هەر بۆیە وڵاتە جیاوازەکانی جیهان سەرەڕای قبووڵکردنی ڕاستییە پزیشکییەکانی تایبەت بە مردنی مێشک و بە ڕەچاوکردنی تێڕوانینی کولتووری، ئایینی و یاسایی وڵاتەکەیان، هەڵوێستی جیاوازیان بەرانبەر چاندنی ئەندامان گرتووەتە بەر. (متولیزادە، کیانی، ١٣٨٦، ٥) شڵەقانی مێشک،* یەکێکە لە هۆکارە سەرەکییەکانی مردن لە ڕووداوەکانی هاتوچۆدا. بە پێی ئامارەکان، ڕووداوەکانی هاتوچۆ لە ئێران، عێراق و کوردستاندا بە تایبەتی، بە بەراورد بە وڵاتانی دەراوسێ، زۆرترین کاریگەرییان لەسەر مردنی مێشک هەیە، بە ڕادەیەک یەک لەسەر دەی کەسەکان لە ڕوودوەکاندا گیان لە دەست دەدەن و

---

* Brain Death

* Concussion

له ده حاڵەتی مردن یەکێکیان بە هۆی مردنی مێشکەوەیە، هەر بۆیە لە ئێراندا زۆرترین ڕێژەی مردن بە هۆی مردنی مێشکەوەیە لە چاو وڵاتانی دەراوسێدا. ڕێژەی بەخشینی ئەندامانی جەستە لە ئێراندا نزیکەی ٧/١ لە ملیۆنێکدایە، واتە ئەم ڕێژەیە کەمترە لە ١%ی حاڵەتەکانی مردنی مێشک، کاتێک ئەم ڕێژەیە لەگەڵ ٣٤ کەس لە ملیۆنێک کەس لە ئیسپانیا و ٢٠-٣٠ کەس لە یەک ملیۆن لە ئەورووپا و ئەمەریکا بەراورد دەکەین، کەمیی ڕێژەی ئەندامبەخشینمان بۆ دەر دەکەوێت. نزیکەی ٧٠٠٠ کەس لە ئێراندا ساڵانە تووشی سستیی گورچیلە* دەبن، کە زۆربەیان بە هۆی نەبوونی گورچیلەچاندنەوە گیان لە دەست دەدەن و هەزاران کەسیش لە ڕێگەی ئامێرپاڵفتەکردنی خوێنەوە جگە لە خەرجیی زۆروزەبەند، ژیانێکی پڕ ئازاریشیان هەیە. لە ئێراندا تەنیا ١٦٠٠ کەس، واتا ٢٨% نەخۆشەکانی سستیی گورچیلە لە ڕێگەی وەرگرتنی گورچیلەی ئەو کەسانەوەی تووشی مردنی مێشک بوون، چاندنی گورچیلەیان بۆ دەکرێت. (لاریجانی، ١٣٧٨، ٢٩) چاندنی ئەندام لە مرۆڤی زیندوو و بەئاگادا چەند بەربەستێکی یاسایی لە بەردەمدایە، بەڵام مەخابن، کە لە وڵاتانی وەک ئێران و هیندوستاندا ئەم کارانە دەکرێن و کارەساتێکی مرۆییە بە نیسبەت ئەو کەسانەوەی بە هۆی فەقیری و هەژارییەوە ناچار دەبن گورچیلەیان بفرۆشن.

لەم کارەشدا، مەسەلە مۆڕاڵییەکانی نێو بابەتی چاندنی ئەندامەکان بە هۆی کاریگەریی لایەنە کۆمەڵایەتییە

---

* Renal failure

جۆربەجۆرەکانەوە زۆر ئاڵۆز دەبن. ئایین، کولتوور و نەریتەکانی کۆمەڵگە لە نموونە کاریگەرییە کۆمەلایەتییەکانی ئەم بوارەن. لایەنە مۆراڵی و یاساییەکانی جیاکردنەوەی ئەندامێکی مرۆڤی زیندوو یان جەستەی مرۆڤێک، هەروەها پێناسەکردنی مردنی مێشک، هەلومەرجە مۆراڵی و یاساییەکانی پێدەر و وەرگری ئەندامەکە، چۆنیەتیی ڕێککەوتنی داراییی نێوانیان و چەندان مەسەلەی دیکەش، لە نموونەی ئەو گرفت و ئاڵۆزییانەن، کە لەوانەیە هیچ وەلامێکی یەکلاکەرەوەی درووستیان بۆ نەبێت، بەلام دەبێت پسپۆڕانی ئەم بوارە سەرقاڵی شەنوکەوی ئەم مەسەلانە بن. (عباسی، ١٣٨٢، ٣١)

## تێگەناسی

لە زانستی پزیشکیدا مردنی مێشک، وەک یەکێک لە نیشانەکانی مردنی مرۆڤ لە قەڵەم دەدرێت. مردنی مێشک بریتییە لە تێداچوونی تەواوەتی و نەگەڕاوەی چالاکییەکانی مێشک، کە لە ڕێگەی بێهۆشیی درێژخایەن، هەناسەبڕانی کاتی* و نەبوونی هیچ جۆرە پەرچەکردارێکی قەدی دەماخ* ـەوە دیاری دەکرێت. بەربڵاوترین هۆیەکانی مردنی مێشکیش بریتین لە: لێدانی توند*، خوێنبەربوونی ناو مێشک، کەمیی گەیشتنی ئۆکسجین بۆ شانەکانی لەش* پاش جەڵتەی دڵ، زۆریی ڕادەی بەکارهێنانی دەرمان لە ماوەیەکی دیاریکراودا*، لووە سەرەتاییەکانی مێشک*، هەوکردنی پەردەکانی مێشک*و خۆکوشتن. بە شێوەیەکی گشتییش، بەربڵاوترین هۆکاری مردن لە پێکەیشتوواندا ڕاتەکینە بەهێزەکانی ناو کەللەی سەرە*و لە

---

* Apnea
* Brainstem Reflexes
* Trauma
* Hypoxia
* Effective Dose
* The First primary Brain Tumor
* Meningitis
* Traumatic Brain injury

منداڵانیشدا، کەمبوونەوەی مەترسیداری ئۆکسجینە لە لەشدا بە هۆی کێشەی هەناسەدان*و ڕووداوەکانی هاتوچۆوە*.

یەکلاییکردنەوەی حاڵەتی مردنی مێشکی لە زانستی پزیشکیدا لە ڕێگەی ئەم نیشانانەوە دەبێت:

١. دیاریکردنی مردنی مێشکی لە لایەن پزیشکێکی بە ئەزموونەوە کە شارەزای نیشانە نۆژداریییەکان و قۆناغەکانی دیاریکردنی مردنی مێشکییە؛

٢. ئەگەر مەبەست لە دەستنیشانکردنی مردنی مێشکی، بۆ بەخشین و جیاکردنەوەی ئەندامەکانی جەستەی کەسەکە بێت، ئەوا پێویستە دوو پزیشک دان بە مردنی مێشکیی کەسەکەدا بنێن و نابێت هیچ کام لەو پزیشکانەش هیچ جۆرە پێوەندییەکی خزمایەتییان لەگەڵ وەرگری ئەندامەکاندا هەبێت، هەروەها نابێت بە هیچ شێوەیەک لە هیچ قۆناغێکی بەخشینی ئەندامەکەدا ئامادەگییان هەبێت؛

٣. لەناوچوونی هەموو پەرچەکردارەکانی قەدی دەماغ؛

٤. دەرنەکەوتنی هیچ پەرچەکردارێک لەکاتی بزواندنی هەستەوەرەکانی کەللەی سەر لە هیچ شوێنێکی جەستەدا. لەوانەیە پەرچەکردارەکانی بڕبڕەی پشت لە هەندێک کەسی تووشبووی مردنی مێشکیدا هێشتا مابن؛

٥. نەبوونی ئەو حاڵەتانەی ئەگەری گەڕانەوەی ژیانی کەسەکەی لێ دەکرێت، وەک حاڵەتی نزمبوونەوەی پلەی

---

* Asphyxia
* Motor vehicle accident

گەرمای لەش بۆ ٣٢ پلە*، هەروەها شلبوونی ماسوولکەیی بە هۆی وەلامنەدانەوەی ئەندامە دەمارییە ناوەندییەکانەوە؛

٦. بێهۆشبوونێکی یەکجارەکی، کە ئەگەری هۆشهاتنەوەی تێدا نەبێت، کە دەستنیشانکردنی ئەم جۆرە بێهۆشییەش پێویستی بە شیکاری و چاودێریی درێژخایەن هەیە لە دوو سەعاتەوە بۆ بیستوچوار سەعات؛

٧. هەناسەدانی خۆکارانە لە ماوەی تێستی هەناسەبڕانی کاتیدا لە ئارادا نەبێت، چونکە لەم حاڵەتەدا پەستانی و چواردەوری $CO_2$ لە خوێنی ناو خوێنبەرەکاندا دەگاتە سەرووی ٦٠mmHg و خەستیی خوێنیش (PH) دەگاتە ٧/١٨؛

٨. بەکارهێنانی ڕێگەکانی وێنەگرتنی ناوەکی* و وێنەگرتنی دەمارە خوێنبەرەکانی مێشک*، بە مەبەستی یەکلاییکردنەوەی وەستانی خوێن لە دەمارەکانی مێشکدا. (سەرکەوت، ١٣٩٣، ١٤٧- ١٤٨).

---

* Hypothermia
* radionuclide scan (Nuclear medicine scanning)
* Angiography

## مردنی مێشک

پێناسەی مردن و چۆنیەتیی دەستنیشانکردنی لە ڕوانگەی کولتوور و ئایینە جۆربەجۆرەکانەوە جیاواز بووە و دیاریکردنی کاتی مردنیش وەک گرفتێکی مۆڕاڵی خراوەتە ڕوو. لە سەردەمانی ڕابوردوودا، وەستانی چالاکییەکانی دڵ و سییەکان، نیشانەی مردنی مرۆڤەکان بوو، کەچی لە ئێستادا سوود لە ڕێگەکانی تاقیکردنەوەی دەماری بۆ دیاریکردنی مردنی مێشک وەردەگیرێت، کە ڕاستییەکەی ئەمەش ڕێگوزەری گواستنەوە بوو لە ڕێگەکانی دەستنیشانکردنی مردنی کۆن و پێخستنەناو ڕێگە نوێیەکانەوە، بۆیە بە هۆی فرەکولتووری و فرەئایینی و چەندان مەسەلە و گرفتی مۆڕاڵییەوە درووست بوو. هاوکات لەگەڵ باسوخواسی بەخشینی ئەندامانی جەستەی نەخۆشی مێشکمردوودا مەسەلەی مانا و چۆنیەتیی دیاریکردنی مردنیش جارێکی دیکە ئاوڕی لێ درایەوە. بنچینەی گرفتە مۆڕاڵییەکانی بابەتی بەخشینی ئەندامانی ئەم جۆرە نەخۆشانە لەوەدایە، کە ئایین و کولتوورە جۆربەجۆرەکانی ناتوانن بە ئاسانی دان بەوەدا بنێن، کە ئەو کەسەی نیشانەکانی ژیانی تێدایە، بە کەسێکی مردوو حسابی بۆ بکەین. قبووڵکردنی ئەم مەسەلەیە بە تایبەتی بۆ خزم و کەسی نزیکی نەخۆشەکە زۆر قورس دەبێت. دڕدۆنگییەکان بۆ ئەگەری دیاریکردنی درووستیی کاتی مردنی مێشک نییە، بەڵکوو گرفتەکە لەوەدایە کە پێش وادەی خۆی مردنی کەسەکە دیاری بکرێت و ئەندامەکانی لە جەستەی

جیا بکرێنەوە. گرنگترین تێبینی لە بەخشینی ئەندامی جەستەدا بابەتی دیاریکردنی درووستیی کاتی مردن و شێوازی بڕیاردانە لەبارەی بەخشینی ئەندامەکانەوە. (لاریجانی، ١٣٨٣، ١٢٠)

## چاندن و بەخشینی ئەندامەکان

بە گواستنەوەی خانە، شانە یان ئەندام، کە کارکردەکەی پارێزراو بێت، بەخشین و چاندن دەگوترێت. چاندنی ئەم بەشانە لەناو جەستەی کەسی وەرگردا بە دوو شێوە دەبێت:

١. شێوەی ئۆرتۆتۆپیک*: لەم شێوەیەدا ئەندامی چاندن لە شوێنی سرووشتیی خۆیدا دەچێنرێت، وەک چاندنی دڵ یان جگەر لە شوێنی تایبەت بە خۆیان لە جەستەی مرۆڤدا؛

٢. شێوەی هیتەرۆتۆپیک*: چاندنی ئەندامی چاندن لە شوێنێکدا جیا لە شوێنە سرووشتییەکەی خۆی. بۆ نموونە، چاندنی گورچیلە لە حەوزدا.

بە پێی جۆری خوێن و تایبەتمەندییە بۆماوەییەکانیش چەند جۆرێکی جیاوازی چاندن هەن:

ئەلیف: جۆری ئۆتۆگرافت*: لەم جۆرەدا ئەندامێک یان خانە و شانەیەک لە خودی کەسەکەوە بۆ شوێنێکی دیکەی جەستەی

---

* Orthotropic
* Heterotopic
* Autograft

خۆی دەگوازرێتەوە، وەک چاندنی پێست یان ئێسک لە چارەسەرکردنی سووتاوی و شکاویی نەخۆشەکە خۆی. چاندنی مۆخی ئێسکیش لە نێوان دوانەکاندا بە سینژنیک* ناو دەبرێت و چاندنی نێوان ئەندامەکانی دوو مرۆڤیش بەبێ ڕەچاوکردنی خزمایەتی بە ئالۆگرافت*دەناسرێت.

بێ: جۆری زینوگرافت (موتوربە لە بێگانە)* : چاندن و موتوربەی نێوان دوو زیندەوەری جیاواز، وەک مرۆڤ و ئاژەڵ.

زۆربەی هەرەزۆری چاندنەکان لە جۆری ئالۆگرافتە، ئیدی لە مرۆڤی زیندووەوە بێت یان لەو کەسانەوەی مردنیان نزیکە، لەم جۆرەدا زیاتر چاندنی گورچیلە، مۆخی ئێسک، بەشێکی جگەر و سییەکان و زراو. ڕاددەی سەرکەوتنی نەشتەرگەریی چاندن و زیندووبوونی ئەندامە چێنراوەکان، پێوەندییان بە چەند هۆکارێکەوە هەیە وەک: جۆری چاندن، ئەندامی چێنراو، دۆخی جەستەیی کەسی وەرگر، دەرمانە بەکارهێنراوەکانی پاش نەشتەرگەری (دەرمانەکانی وەستاندنی سیستەمی بەرگریی لەش) و چاودێریی بەردەوامی نەخۆشەکان، کە زۆر جار خەرجیی زۆر بە دوای خۆیدا دەهێنێت. بە مەبەستی سەرکەوتنی نەشتەرگەرییەکانی چاندن، پێویستە لەپێشدا چەند کارێک بکرێن، وەک: دەستنیشانکردن و شیکاریی وردی کەسی بەخشەر و وەرگر، پاکژکردنەوەی تەواوەتیی ئەندام و شانەی چاندن

---

* Syngeneic
* Allograft
* Xenograft

لەپێناو ڕێگریکردن لە پەیدابوونی کێم و جەراعەت لە کەسی چێنراودا، گرنگیدانی تەواوەتی بە تەندرووستیی جەستەیی و دەروونیی کەسی بەخشەر پاش بەخشینی ئەندامەکەی. (عباسی، ۱۳۸۲، ٥١).

## پێشینەی مێژوویی

پێشینەی بەخشینی ئەندامی جەستە بۆ سەردەمی لەدایکبوونی حەزرەتی عیسا دەگەڕێتەوە. لە تابلۆیەکی (مۆزەخانەی دێل پرادۆ)*ی شاری مەدریدی ئیسپانیا، دیمەنێکی شاری دیمەشق لە سەدەی سێیەمی زایینیدا کێشراوە، کە پزیشکەکان سەرقاڵی چاندنی قاچ (لاق)ی کەسێکی ڕەشپێستن لە جەستەی کەسێکی سپیپێست. لەوانەیە ئەم نەشتەرگەرییە سەرکەوتوو بووبێت، چونکە لە جیهانی مەسیحیدا بە پەرجووی سەنت کۆسماسو دامیان*ی جووتەبرا دەناسرێت، ئەمەش بەڵگەی سەرکەوتنی ئەم نەشتەرگەریەیە. یەکەم موتووربەی پێست لە سەدەی شانزەیەمدا کراوە. یەکەم چاندنی گورچیلەش لە ساڵی ۱۹٥۲دا لە گواستنەوەی گورچیلەی دایکێک بۆ کورپەکەی کراوە، یەکەم چاندنی دڵی مرۆڤیش لە مرۆڤێکەوە بۆ مرۆڤێکی دیکە لە ساڵی

---

* Museo del Prado
* Saint Cosmas and Damian

١٩٦٧ له لایەن پزیشکێکەوە بە ناوی کریستیەن بێرنارد* بە ڕێوە چووە. (نیکومنش، ١٣٨٥، ٢)

یەکەمین حاڵەتی نەشتەرگەریی کلینیکیی ئەندامەکانی جەستەش لە ساڵی ١٩٥٤دا کراوە. لەم چەند ساڵەی دواییشدا پێشکەوتنە زانستییەکان و دەسکەوتە پزیشکییەکان بەرەوپێشچوونی بەرچاویان بە خۆوە بینیوە. چاندنی ئەندام و شانەکان بە شێوەیەک لەگەڵ بابەتە مۆراڵییەکاندا دەستەویەخە بوون، کە لە زۆربەی وڵاتانی جیهاندا سەرنجی زانایان، مۆراڵییەکان، یاساناسان، پزیشک و یاریدەدەرانی پزیشکی و تەنانەت سەرنجی چین و توێژە جیاوازەکانی کۆمەڵگەی بۆ لای خۆی ڕاکێشاوە. بابەتە مۆراڵییەکانی پەیوەست بەم کارەوە لە دووتوێی کتێبدا خراونەتە ڕوو. (لاریجانی، ١٣٨٢، ٤٢) بابەتگەلی وەک: چاندن لە جەستەوە، چاندن لە ڕێگەی کەسێکی زیندووی بەخشەرەوە، لایەنی دارایی لە نێوان بەخشەر و وەرگر، ڕێگەچارەی نوێی نەشتەرگەریی چاندن لە ڕێگەی بەکارهێنانی ئەندامی ئاژەڵانەوە بۆ چارەسەری نەخۆشیی مرۆڤەکان و لە سەرووی ئەمانەشەوە چارەسەرکردنی نەخۆشییەکان لە ڕێگەی هاوشێوەسازییەوە، مەیدانخوازی و مشتومڕی مۆراڵییان درووست کردووە.

لە ئێستادا مژاری گەرمی ئەم جۆرە نەشتەرگەرییانە بریتییە لە کەمیی ژمارەی ئەندامە چێنراوەکان و ڕێگا مۆراڵییەکانی دەستخستنی ئەندامە پێویستەکان. لە زۆر کۆمەڵگەشدا گرفتە

---

* Christiaan Barnard

کولتووری و یاساییەکانی موتووربەکردن لە جەستەی مرۆڤەکان، مامەڵەی بازرگانییانە بەرانبەر کەسانی پێویست بە ئەندامی چێنراو و مردنی ژمارەیەکی زۆری ئەو نەخۆشانەی چاوەڕێی ئەندامی پێویستن بە مەبەستی چاندن، لە نموونەی ئەو گرفتە مۆڕاڵیانەن، کە پێویستە ڕێگەچارەی قبووڵکراوی کۆمەڵایەتیی گونجاویان بۆ بدۆزرێتەوە. لەپێناو ئەمەدا بەشێک لە وڵاتان سیستەمی (ڕەزامەندیی سەپێنروا)یان پەسەند کردووە. لەم ڕێگەیەشەوە بەبێ ڕەزامەندیی پێشوەختەی ئەو کەسانەی لە سەرەمەرگدان، ئەندامێکی جەستەی بۆ نەخۆشێکی دیکە جیا دەکەنەوە. بەڵام زۆربەی هەرەزۆری وڵاتانی جیهان سیستەمی (ڕەزامەندیی هۆشیارانە)یان بە لاوە پەسەندە. (سەرکەوت، ١٣٩٣، ١٥٠) لە ئێستادا لە زۆربەی وڵاتانیشدا سوودوەرگرتن لە ئەندامانی جەستەی کەسێکی تووشبوو، بە مردنی مێشکی پەسەند کراوە. کەمیی ئەندامی پێویست بۆ چاندن بووەتە هۆی ئەوەی بەکارهێنانی ئەندامانی ئەو منداڵانەی لە ڕووی گەشەی جەستەییەوە مێشکیان هیچ گەشەیەک ناکات و بە منداڵانی ئانێنسیفاڵی* ناو دەبرێن، هەروەها ئەو کەسانەی دەکەونە حاڵەتی ژیانی ڕووەکیی بەردەوام*ەوە لە زۆربەی کۆمەڵگەکاندا مشتومڕی لێ بکەوێتەوە.

کە واتە چەندان گرفتی سەرەکیی مۆڕاڵی لەم باسەدا دەر دەکەون، وەک: وەرگرتنی ئەندامی چاندن لە بەخشەرێکی

---

* Anencephaly
* Persistent vegetative state

زیندوو، وەرگرتنی ڕەزامەندیی هوشیارانە، ڕێگریکردن لە خراپبەکارهێنانی ماددی، چۆنیەتیی قەرەبووکردنەوەی زیانە جەستەیی و دەروونییەکانی بەخشەر، چۆنیەتیی وەرگرتنی ئەندام لە منداڵان و کەسانی خاوەن گرفتی عەقڵی، بارودۆخی کەسی وەرگری ئەندامەکان و ڕێکارە مۆڕاڵییەکانی بونیاتنانی بانکەکانی هەڵگری ئەندامە بەخشراوەکان. لە هەندێک حاڵەتی خراپبەکارهێناندا، سوودوەرگرتن لە شانەکانی کۆرپەلە بووەتە بیانووی مۆڵەتپێدان بە لەباربردنی کۆرپەلە، هەر بۆیە ئەم کارەش ڕەت کراوەتەوە. سوودوەگرتن لە خانە بنەڕەتییەکانی مرۆڤ و هاوشێوەسازی، ڕێگەیەکی جێگرەوەی وەرگرتنی ئەندامەکانە، هەر چەندە ئەم دوو ڕێکارەش مەسەلەی مۆڕاڵیی تایبەتیان بە دوای خۆیاندا هێناوە، وەک: بەهای ئەو بوونەوەرەی لێوەی بە دەست دێت، پلە و کەرامەتی مرۆڤ، دەستکاریکردنی ئافرێنراوەکانی خودا، مەترسیداری و ئەگەری خراپبەکارهێنانی ئەم ڕێگایە، لێژاییەکی خلیسک کە بەرەو بەرهەمهێنانی مرۆڤی هاوشێوە دەمانبات، هەروەها ئەگەری بازرگانیکردن بە مرۆڤ و ئەندامەکانی مرۆڤەوە.

## بابابەتە مۆڕاڵییەکانی پێوەست بە بەخشین و چاندنی ئەندامەکانەوە

لە هەر جۆرە بڕیاردانێکی مۆڕاڵیدا، پێویستە ئەو چوار پێوەرە لە بەرچاو بگیرێن:

(١) سەربەخۆیی لە بڕیارداندا؛

(٢) سوودمەندبوون؛

(٣) زیاننەگەیاندن؛

(٤) عەدالەت و دادگەری.

لەسەر ئەم بنەمایانە پێویستە لە پرۆسەی چاندنی خانە، شانە و ئەندامی جەستەدا، پێش هەموو شتێک زانیاریی تەواو و پێویست بە کەسی بەخشەر و وەرگر بدرێت، کاریگەرییە نەرێنییەکانیش بۆ هەردوو لا ڕوون بکرێنەوە و پاش بڕیاردانی هەردوو لا، ڕێز لە بڕیارەکەیان بگیرێت، واتا نابێت لە ڕێگەی پەسن و سەنای زیادەوە یان لەژێر گوشاردا هەوڵ بدرێت بڕیارەکانیان بگۆڕن، ئەمەش دەبێتە هۆی سەربەخۆبوونی هەردوو لا لە بڕیارداندا. جگە لەمە، پێویستە سوود و زیانەکانی هەردوو لا بە جوانی ڕوون بکرێنەوە و لە کۆتاییدا بڕیارێک بدرێت، کە زۆرترین سوود و کەمترین زیانی هەبێت. (لاریجانی و عباسی، ١٣٨٢، ٧٢)

زانا موسڵمانەکان هەڵوێستێکی گونجاوتریان لەبارەی وەرگرتنی ئەندامی چاندن لە جەستەی کەسی مردوودا هەیە،

بەڵام جێبەجێکردنی ئەم کارەیان بە ڕەزامەندیی پێشتری کەسەکەوە بەستووەتەوە، واتا یان دەبێت کەسەکە پێش مردنی بۆ کاری لەم جۆرە ڕەزامەندیی پێشان دابێت، یان ڕەزامەندیی سەپێنراو بێت، یان لە کەسوکاری مردووەکە ڕەزامەندیی وەربگیرێت. (عباسی، ١٣٨٢، ٩٥)

## بابەتە مۆڕاڵییەکانی پێوەست بە مردنی مێشکەوە (وەك سەرچاوەیەکی دابینکردنی ئەندامی چاندن)

مردنی مێشک بە مانای کۆتاییهاتنی تەواوەتی و یەکجارەکیی چالاکییەکانی مێشکە بە تایبەت لاسکی مێشک. ڕاستییەکەی ئەم جۆرە پێناسەیەی مێشک یارمەتیدەری دەسکەوتنی ئەندامی تەندرووست و زیاترە بۆ کاری چاندن و زۆربەی گرفتەکانی دابینکردنی ئەندامی پێویست چارەسەر دەکات. خاڵی گرنگ لێرەدا ئەوەیە، کە ئایا تاقیکردنەوەکانی دیاریکردنی مردنی مێشک لە هەموو نەخۆشخانە و سەنتەرەکاندا بە پێی پێوەرە جیهانییەکان دەکرێن یان نا؟ ئایا بە هەر شێوەیەک بێت، ڕەزامەندیی وەرگرتنی ئەندامی نەخۆشەکان بۆ کاری چاندن وەرگیراوە یان نا؟ ئایا ڕەچاوی لایەنی دەروونی و سۆزداریی ئەو کەسانە کراوە، کە لە لایەکەوە چاوەڕێی ئەندامی پێویست بە چاندنن و لە لایەکی تریشەوە چاوەڕێی مردنی کەسێکی دیکەن؟ (عباسی، ١٣٨٢، ٩٧)

## پێوەندیی دارایی لە نێوان بەخشەر و وەرگری چاندندا

یەکێکی دیکە لە مەسەلە مۆڕاڵییە گرنگەکان دەگەڕێتەوە بۆ قەرەبووکردنەوەی ئەو زیانەی لە بەخشەری زیندووی بێگانە (نا-خزم)ی خاوەنئەندامەکە دەکەوێت. ئەم مەسەلەیە بۆ ئەو حاڵەتانەی خزمی یەکن، گرفتێکی ئەوتۆ درووست ناکات، بۆ نموونە کاتێک باوکێک گورچیلەیەکی خۆی بە کچەکەی دەبەخشێت، لەپێناو پارەدا ئەم کارەی نەکردووە. هەرچەندە شتێکی ئاساییە، کە بەخشەری ئەندامەکە لە بەرانبەر لەدەستدانی بەشێک لە جەستەی خۆی لەپێناو گەڕاندنەوەی تەندرووستیی کەسێکی دیکەدا، شیاوی وەرگرتنی بڕێک پارە بێت، یان قەرەبووی زیانی لەدەستدانی ئەندامی جەستەی بۆ بکرێتەوە، بەڵام لە ڕواڵەتدا ئەم مەسەلەیە بەم شێوەیەیە، کە بەخشەری ئەندامەکە لە بەرانبەر بڕێک پارەدا ئەم کارەی کردووە. ئەم کارەش لە تێڕوانینی زۆربەی بیرمەندانی مۆڕاڵی پزیشکی و لە لای زۆربەی خەڵکیش بە کارێکی نابەجی لە قەڵەم دەدرێت. بەشێکی زۆری کۆمەڵگە دژی کڕین و فرۆشتنی ئەندامەکانی جەستەن. ئەوانە بۆ هەڵوێستەکەیان ئەم بەڵگانە دەخەنە ڕوو:

١. ئایا مرۆڤ لە بنچینەدا خاوەنی ڕاستەقینەی ئەندامەکانی جەستەی خۆیەتی هەتا لە بەرانبەر هەندێک پارەدا بیانفرۆشێت؟

٢. لەم حاڵەتەدا، ئەو کەسانەی پێویستیان بە ئەندامی بەخشراو هەیە، ناتوانن ئەندامی پێویست بە دەست بهێنن، کە واتە ئەم حاڵەتەش دەبێتە هۆی نادادپەروەری لە مەسەلەی چارەسەرکردنی نەخۆشیدا، کە ئەم مەسەلەیەش لە مەسەلە گرنگەکانی مۆراڵە؛

٣. کەسانی هەژار و کەمدەسەڵات لەکاتی تەنگوچەڵەمەکانی ژیاندا پەنا بۆ فرۆشتنی ئەندامەکانی جەستەیان دەبەن، ئەم کارەش تەندرووستیی کۆمەڵگە دەشێوێنێت.

لەم دواییانەدا، تێڕوانینێک بە ناوی (پاداشت لە بەرانبەر بەخشیندا) خراوەتە ڕوو، کە بەڵگەی زیاتری بۆ کارەکە هێناوەتەوە. لەم حاڵەتەدا، لە لایەن دامەزراوەکانی دەوڵەتەوە بۆ کاری چاودێریی تەندرووستیی نەخۆشەکانی پێویست بە وەرگرتنی ئەندام، کە بە چاودێریی وەزارەتی تەندرووستی کار دەکەن، بڕەپارەیەک وەک دیاری بە بەخشەرانی ئەندام پێشکەش دەکرێت، کە هەم تا ڕادەیەک زیانەکانی کەسی بەخشەر قەرەبوو دەکاتەوە، هەمیش ڕێگری لە درووستبوونی پێوەندییەکی دارایی لە نێوان بەخشەر و وەرگری ئەندامدا دەکات. پێویستە ئەم دامەزراوانەش نرخی ئەندامە بەخشراوەکان تا ئاستێک بەرز بکەنەوە، کە بەخشەر و وەرگری ئەندام ژێربەژێر پێوەندیی دارایی درووست نەکەن.

هەندێک لە پسپۆڕان درووستبوونی پێوەندیی دارایی نێوان بەخشەر و وەرگری ئەندام بە درووست دەزانن و چەند پاساوێکیان بۆ ئەم کارە خستووەتە ڕوو:

١. پێویستیی بەردەوامی نەخۆشەکان بە ئەندامی ساغ، کە ئەمەش بووەتە هۆی ئەوەی لایەنە ماددییەکەش لە بەرچاو بگیرێت؛

٢. لە ڕووی لۆژیکییەوە، بژاردنی زیانەکانی کەسی بەخشەر کارێکی درووستە؛

٣. ئەگەر لە بەخشینی ئەندام ڕێگری بکرێت، کە واتە بنەمای سەربەخۆبوونی مرۆڤەکانمان پێشێل کردووە.

ئەم گرووپەش پێیان وایە، باشترین چارەسەر بۆ ئەم کارە، چاودێریکردنی ئەم پرۆسەیەیە کە لە لایەن دەمەزراوەکانی دەوڵەتەوە، بە تایبەت بانکەکانی پاراستن و پێدانی ئەندامە بەخشراوەکان یان دامەزراوەکانی کەرتی تەندرووستییەوە قەرەبووی زیانەکانی ئەم کارە بکەن و لە ڕێگەی بەخشینی پارەی پێویستەوە، بیمەی درێژخایەن و پێدانی پارەی مانگانە بۆ ماوەیەکی دیاریکراو بە بەخشەرانی ئەندامەکان کاری قەرەبووکردنەوەکە جێبەجێ بکەن. شتێکی ڕوونە، کە دانانی ڕێگەچارەی یاسایی و فەرمی، دەبێتە هۆی درووستبوونی ڕێککەوتنی ژێربەژێری نایاسایی و نامۆڕاڵی لە نێوان بەخشەر و وەرگری ئەندامدا، کە سەرەنجام وەک لە زۆربەی وڵاتاندا دەبینرێت، بازاڕە ڕەشەکانی ئەم بوارە جمەیان دێت. (بزمی و همکاران، ١٣٨٨، ٩٥)

## لایەنە مۆڕاڵییەکانی چاندنی ئەندام لە ڕوانگەی قوتابخانە فەلسەفییەکانەوە

لەم بوارەدا چەندان مەسەلەی گرنگ لە بەرچاو دەگیرێن، کە بە کورتی دەتوانین ئاماژە بەم مەسەلانە بکەین:

١. سەربەخۆبوونی مرۆڤ لەبارەی ئەندامەکانی جەستە و بەخشینیانەوە لە چ ئاستێکدایە؛

٢. مەسەلە مۆڕاڵییەکانی پێوەست بە وەرگرتنی ئەندام بۆ کاری چاندن لە مرۆڤی زیندوو یان لە جەستەی مردوو؛

٣. مەسەلە مۆڕاڵییەکانی پێوەست بە مردنی مێشک، کە وەک یەکێک لە سەرچاوەکانی دابینکردنی ئەندامەکان لە قەڵەم دەدرێت؛

٤. وەرگرتنی ڕەزامەندی لە بەخشەری ئەندام و چۆنیەتیی دەستنیشانکردنی کەسی وەرگر و پلەبەندیی وەرگرەکان بە پێی پێویستیی ژیانیان؛

٥. مافە ماددی و مەعنەوییەکانی بەخشەر و پاراستنی سەلامەتی؛

٦. کەمبوونی ئەندام و شانەی تایبەت بە چاندن و ڕێگەچارە مۆڕاڵییەکانی چارەسەرکردنی ئەم گرفتە؛

٧. پێوەندیی دارایی نێوان بەخشەر و وەرگری ئەندام و ڕێکخستنی یاسایی ئەم بوارە.

## ڕوانگەی قوتابخانە فەلسەفییەکانی مۆڕاڵ

لە ڕوانگەی قوتابخانە فەلسەفییەکانی مۆڕاڵەوە، دوو تێڕوانینی سوودگەرایی*و ئەرکگەرایی*مان هەیە، کە لە تێڕوانینی سوودگەراییدا گرنگیی بە ئەنجامی کارەکە و سوودە بەدەستهاتووەکانی دەدرێت. پەیڕەوانی ئەم قوتابخانەیە کارێک بە مۆڕاڵی لە قەڵەم دەدەن، کە زۆرترین سوودی بۆ زۆرترین کەس هەبێت. بەڵام لە قوتابخانەی ئەرکگەراییدا گرنگیی بە ئەنجامدانی ئەرک دەدرێت و کارێکیش بە مۆڕاڵی لە قەڵەم دەدرێت، کە لە بنچینەدا پەسەندکراو بێت. بە ڕەچاوکردنی زۆریی ژمارەی لایەنگر و نەیارانی هەر یەکێک لەم قوتابخانانە و بەڵگەکارییەکانی هەریەکێکیان، ناتوانین بە شێوەیەکی ڕەها قبووڵیان بکەین، یان ڕەتیان بکەینەوە. لەبارەی چاندنی ئەندامیشەوە لە ڕوانگەی بەهای مۆڕاڵی، لە ڕێگەی چاندنی ئەندامەوە مرۆڤێک لە مردن ڕزگار دەکرێت یان نەخۆشییەکی درێژخایەنی جەستەیی چارەسەر دەکرێت، بەڵام لە هەمان کاتدا تەندروستیی کەسیی بەخشەری زیندوو دەخەینە مەترسییەوە. (فرانکنا، ١٣٧٦، ٦٢)

---

* Normative Ethics
* Utilitarianism

## قوتابخانەی سوودگەرایی و تێڕوانینی بۆ چاندنی ئەندام

سوودگەرایی، یەکێکە لە تیۆرییە مۆڕاڵییە جیهانییەکان، کە زۆر بەربڵاوە. ئەم قوتابخانەیە جەخت لەوە دەکاتەوە کە بە کارێک دەوترێت مۆڕاڵی، کە ئەو کارە خۆشی و چێژ بۆ زۆرترین خەڵک دەستەبەر بکات. واتا کارێک درووستە، کە زۆرترین خێری بۆ زۆرترین کەس تێدا بێت. لەم تێڕوانینەوە، وشەی (خۆشی) زیاتر بەرانبەر وشەی (pleasure) لە زمانی ئینگلیزیدا بەکار دێت، کە ئەم مانایانە لە خۆ دەگرێت: خۆشی، چێژی ماددی، خۆشگوزەرانیی پێوەست بە پارە و سامانەوە. لە ناساندنێکی دیکەی سوودگەراییدا، بنەمای چاکوخراپەکان بە پێی هەست بە خۆشی و حەز و ئارەزووەکان دەپێورێت. (سەرکەوت، ١٣٩٣، ١٥٦-١٥٧)

هەندێک لە توێژەران ئاماژەیان بە جۆرێک لە سوودگەرایی کردووە، کە بە سوودگەرایی ڕێساسەنتەر* دەناسرێت، کە لەم جۆرەدا لەجیاتی سوودە تاکەکەسی و ڕووکەشەکان پێوەری داوەریکردن، سوودە هەمەکی و گشتییەکانە. ئەم جۆرە لە سوودگەرایی، زیاتر لە لایەن جۆن ستیوارت میلەوە خراوەتە

*. Role-Utilitarianism

بەر باس. (کالینسون، ١٣٨٠، ٤٥١) فەیلەسووفانی وەک: جۆرج بێرکلی* و برانت*، بە لایەنگریی ئەم تێروانینە لە قەڵەم دەدرێن. لەم تیۆرییەدا، چاکە و خراپەی کارەکانیش بە پێی ئەو سوودە دیاری دەکرێت، کە بە پێی یاسا لە زۆربەی حاڵەتەکاندا بە دەست دێت، نەک ئەو سوودەی بە شێوەیەکی بەشەکی و لە چەند حاڵەتێکی تایبەتدا دەست دەکەوێت. مادام بەخشین و چاندنی ئەندامەکانی جەستە لە حاڵەتی ڕێساسەنتەردا بەرژەوەندیی گشتیی کۆمەڵگە لە بەرچاو دەگرێت، کە واتە دەتوانین هەموو چالاکییە مرۆییەکان و لە نێویشیاندا مۆڕاڵ لەم قوتابخانەیەدا، بە پێی خۆشی و ئازار شی بکەینەوە، پاشان لێیان تێبگەین. خەڵکییش ئامانجیان لە کردنی کارەکانیان چێژی زیاتر و دوورکەوتنەوە لە ئازار و مەینەتییە، بۆیە پێدانی ئەندامیش دەکەوێتە ئەم خانەیەوە. (فرانکنا، ١٣٨٦، ٨٨).

---

* George Berkeley
* R. B. Brandt

## قوتابخانەی ئەرکگەرایی و تێڕوانینی بۆ چاندنی ئەندام

ئەمەش یەکێکی ترە لە تیۆرییەکانی هەڵسەنگاندنی کارێکی مۆراڵی، کە بە پێی ئەم تیۆرییە ئادەمیزاد ئەرکگەلی دیاریکراو و تایبەتیی هەیە و بە پێی ئەمانەش هەندێک لە کردە و ڕەفتارەکان لە بنچینەدا درووست* و ڕێگەپێدراون و هەندێکی دیکەشیان خراپ و ڕێگەپێنەدراون. مرۆڤ لە هەڵسەنگاندنی بۆ کردەوەکان بە گشتی، تەنیا دەبێت گرنگی بە ئەرکی سەرشانی خۆی بدات و لەبەرچاوگرتنی ئەنجام و کاریگەرییەکانی کردەوەکان ناتوانێت چاکوخراپیی کردەوەکان دیاری بکات؛ بۆ نموونە، کوشتنی مرۆڤی بێتاوان، کارێکی خراپ و پەسەندنەکراوە، تەنانەت ئەگەر بێت و بە پاساوی ڕێگریکردن لە کردنی کاری خراپ ئەم کارە بکرێت، تەنانەت ئەگەر بێت و سوود یان زیان بگەیەنن. بە پێوەری ئەمانە، لەبەر ئەوەی چاندنی ئەندام لەپێناو ڕزگارکردنی ژیانی کەسێکی دیکەدایە، لە بنچینەدا کارێکی باشە. کە واتە جێبەجێکردنی هەر کارێک، ئەگەر ببێتە هۆی زۆرترین خێر و خۆشی بۆ زۆرترین کەس -هەر وەک چۆن قوتابخانەی سوودگەرایی جەختی لەمە دەکردەوە- دەکرێت کارێکی درووست و ڕێگەپێدراو بێت. (فرانكنا، ٤٧،١٣٧٦)

---

* Rightness

ئیمانوێل کانت، دامەزرێنەری سەرەکیی ئەم جۆرە تێڕوانینە مۆراڵییەیە، بۆیە لێرەدا بە هۆی پێوەندیی بابەتەکە بە تێڕوانینەکانی کانتەوە هەوڵ دەدەین بە شێوەیەکی کورت ئاماژە بە تەوەرە سەرەکییەکانی تیۆرییەکەی کانت بکەین: کاری باش ئەوەیە لەسەر بنەمای ویستی چاکە بە ئەنجام بگات و هەروەها زانیمان ویستی چاکە، ویستێکە لەپێناو ئەرکدا بێت و ئاوڕ لە دەرئەنجامی بەرهەمهاتووی کردار و بەرژەوەندیی گرووپ و تاکەکەس نەداتەوە، بەڵام ئەمە پێوەر و سەرچاوەی بڕیارەکانی مۆراڵمان بۆ دیاری ناکات. بۆیە کانت دەڵێت: "یەکێک لە پێوەرەکانی دیاریکردنی ئەرک ئەوەیە کارکردنی گشتیی هەبێت." واتا گشتگیر بێت، بۆیە پێویستە بگەڕێینەوە خاڵی هاوبەشی هەموو مرۆڤەکان کە هەمانە، ئەویش عەقڵە. کە واتە ویستی چاکە، ویستێکە بە مەبەستی جێبەجێکردنی ئەرک بێ کە لە ڕێگەی هێزی عەقڵەوە دیاری دەکرێت. یاسای عەقڵ ئەو شتەیە کە دەستووری ڕەها بۆ ئێمەی دیاری کردووە.

١. کانت لەو باوەڕەدا بوو، کە ناکرێت لە ڕێگەی ئەزموونگەراییەوە درک بە مەسەلە مۆراڵییەکان و ماناکانی وەک پێویستییتی بکەین. ئەم بابەتانە لە زەینی مرۆڤدا بە شێوەی پێشبینی بوونیان هەیە؛

٢. بە گوێرەی تێڕوانینی قوتابخانەی ئەرکگەرایی، پاڵنەر و ویستەکانی مرۆڤ ڕۆڵێکی سەرەکییان هەیە و بەبێ

ڕەچاوکردنی ئەنجام و پاشهاتەکان، لە بنچینەی خۆیاندا بەنرخن و بەکەڵکن؛

٣. لەم قوتابخانەیەدا گرنگترین شت (خواستی خوازراوە)، لەم خوازراوییەدا بە هیچ شێوەیەک سوودەکان و حەزە تاکەکەسییەکان، هیچ ڕۆڵێکیان نییە و بە تەعبیری کانت سوود و قازانج نە شتێک دەخاتە سەر فەزیلەتی نیاز و مەبەستی مرۆڤ، نە لێشی کەم دەکاتەوە. (کانت، ١٣٦٩، ١٣)

٤. لە تێڕوانینی کانتدا گشتییێتی، گرنگیی خۆیی هەیە. لەم تێڕوانینەدا ویستی چاک لە ڕێگەی مەرجێکەوە دیاری دەکرێت کە خۆی، لە واقیعدا بێ مەرج و یاسایە، کە تەنیا لەسەر خۆی بەندە و وابەستەی هیچ شتێکی دیکە نییە. (یاسپرس، ١٣٧٢، ١٦٣)

کانت لە ئەنجامدا دەگاتە ئەوەی، کە مۆڕاڵی بوونی کارێک تەنیا بە پێی یەکسانبوونیەتی لەگەڵ قانووندا بە شێوەیەکی گشتی. بە بڕوای کانت، تەنیا و تەنیا بەو مەرجە کارێک مۆڕاڵی دەبێت، کە ئەو ویست و پاڵنەرەی لە پشت ئەنجامدانی کارەکەوەیە، بکرێتە یاسا و ڕێسایەک و بشتوانم پابەندی بم. کە واتە بەخشین و چاندنی ئەندامەکان مادام بۆ مرۆڤایەتی سوودی هەیە و دەکرێت خەڵکییش بۆ ئەنجامدانی هان بدرێت، کارێکی مۆڕاڵییە.

یەکێک لە مەسەلە گرنگەکانی بواری مۆڕاڵی پزیشکی، مەسەلەی مردنە. لەم بوارەشدا قسەوباسی ئۆتۆنازی گرنگییەکی زۆری هەیە، بە هۆی گرنگیی ئەم مەسەلەیەشەوە بە شێوەیەکی سەربەخۆ باسمان لێوە کردووە. ئۆتۆنازییش بە چەندان شێوە پێناسە کراوە.

"لە زمانی لاتینیدا بە واتای مردنی چاک دێت، مردنێکی ئارام و بەدوور لە مەینەتی." (زالی، ١٣٨٧، ٤٩٤) لە پێناسەیەکی دیکەدا ئەم جۆرە مردنە بە واتای کورتکردنەوەی ماوەی ئازارچەشتن و گیاندانی نەخۆشی چارەسەرنەبووە، کە بە پێی زانستی پزیشکیی ئەمڕۆ، هیچ جۆرە ئومێدێک بۆ چاکبوونەوەی لە ئارادا نییە، لە بەرانبەر ئەم مردنەدا تێگەکانی کوشتنی بەبەزەییانە، مردنی هێورکەرەوە، کوشتنی نەخۆش لە ڕووی بەزەییەوە و کوشتنی نەخۆشی پزیشکییان بە کار هێناوە. هەندێکی تریش بە شێوەی پچڕاندنی بێ ئازاری ژیانی ئەو مرۆڤەیە، کە ترووسکاییەک ئومێد بۆ چارەسەرکردنی نییە، یان تەمەنێکی زۆری هەیە و بە هیچ شێوەیەک چارەسەر وەرناگرێت و هەتا بژی، چێژ لە ژیانی نابینێت.

لە ڕووی زمانەوانییەوە، وشەی (euthanasia) لە دوو وشەی یۆنانی (-Eu) بە مانای (ئاسان و چاک) و (thanasia) بە مانای (مردن) دێت. هەڵبەت وشەی (thanasia) لە ناوی خوداوەندی مردن (thanatos)ی ئەفسانەی یۆنانییەوە

وەرگیراوە. بۆ ئەم وشەیەش پێناسەی جیاواز لە سەرچاوە جیاوازەکانەوە خراوەتە ڕوو، وەک: باشکوشتن، ئاسانکوشتن، کوشتنی بەبەزەییانە، کە پێ ناچێت هاوواتای درووستی ئەم وشەیە بن، چونکە هەر یەک لەم وشانە تەنیا گوزارشت لە دیوێکی ئەم کارە دەکەن، چونکە لەم کارەدا هەنگاو بۆ کوشتنی نەخۆشێک دەنرێت، بەبێ وەرگرتنی ڕەزامەندیی خۆی، یان پێچەوانەی خواستی نەخۆشەکە.

ڕاستییەکەی ئەم جۆرە هاوواتایانە جۆرێک بڕیاردانی پێشوەختەیان پێوە دیارە، چونکە پێش هەر کارێک دانمان بەوەدا ناوە ئەم کارە جۆرێک (کوشتن)ە. هەندێکیش بڕوایان وایە لە چەند جۆرێکی ئۆتۆنازیدا بە هیچ شێوەیەک هیچ کارێک بۆ کوشتنی نەخۆشەکە ناکرێت، بەڵکوو نەخۆش بە تێپەڕینی سرووشتیی دۆخی نەخۆشییەکەی، دەمرێت. لەم سۆنگەیەوە وا باشترە وشەی کوشتن بە کار نەهێنین و ئەم وشەیە بە شێوەیەکی درووست بۆ (ئۆتۆنازی) وەربگێڕین.

هەر وەکوو پێشتریش ئاماژەمان پێ دا، پێناسەی جۆربەجۆر بۆ ئەم کارە خراونەتە ڕوو؛ فەرهەنگی ئۆکسفۆرد بە "کوشتنی بێ ڕەنج و ئازاری نەخۆشێک، کە بە دەست نەخۆشییەکی بێ چارەسەرەوە دەناڵێنێت یان لە دۆخی بێهۆشیی تەواوەتی و یەکجارەکیدایە، لە ڕێگەی ئامراز و ڕێگەیەکەوە، کە مردنێکی خێرا و بێ ئازاری بۆ بڕەخسێنێت." ئەگەر بمانەوێت بە شێوەیەکی ورد پێناسەی بکەین: ئەو کاتە کەسێکی نەخۆش و دەردەدار، مردنێکی ئاسانی بۆ دەڕەخسێنرێت، مردنەکەی باش

دەبێت، چونکە ژیان و زیندوومانەوە، نەخۆشەکە دەخەنە دۆخێکی زۆر خراپتر لەوەی کە هەیە؛ ئازاری چارەسەرنەبوو، بێتوانی و بێبڕستی، بێهۆشیی یەکجارەکی، ئەمانە نموونەی ئەو حاڵەتانەن، کە ژیان و زیندووبوون تێیاندا زۆر لە مردن خراپتر دەبێت. لەم دۆخەدا ژیان بەهای مانەوەی نییە.

فەرهەنگی کامبریجیش بە شێوەیەکی کورت و پوخت بەم جۆرە پێناسەی ئۆتۆنازیی کردووە: ئەو کردارەیە، کە بە شێوەی هۆشیارانە و بە ئەنقەست، بە ئامانجی کۆتاییهێنان بە ژیانی مرۆڤێک -یان ئاژەڵێک- دەکرێت، چونکە گیرۆدەی نەخۆشییەکی بێ دەرمانە و ئازارێکی زۆر و مردنێکی دڵتەزێنی بە دوادا دێت، بە جۆرێک ئەم ئازارە بە کەمترین ئازارپێگەیاندنی نەخۆش کۆتاییی پێ بهێنرێت. کۆتاییهێنان بە ژیانی نەخۆش لە ڕێگەی دەرزییەکی کوشتندەوەیە یان لە ڕێگەی وەستاندنی پێدانی دەرمان و لابردنی بەشە سەرەکییەکانی مانەوەی ژیانەوەیە لە جەستەی مرۆڤدا، بە پاساوی ئەوەی باشتر وایە نەخۆشەکە بمرێت، هەتا بەو دۆخەوە درێژە بە ژیان بدات. وەستاندنی پرۆسەی چارەسەرکردنی نەخۆشیش لەم خاڵانەدا خۆی دەبینێتەوە: دەرزی-لێنەدان و لێکردنەوەی ئاوی دڵۆپێنراو لە ڕێگەی دەمارەوە، لابردنی ئۆکسجین، وەستاندنی پرۆسەی پاڵفتەکردنی خوێن، لابردنی ئامێرە یارمەتیدەرەکانی بووژانەوەی دڵ و یارمەتیدانی هەناسە و هاوشێوەکانی، پێدانی دەرمانی هێورکەرەوەی زۆر بەهێز، کە دەبنە هۆی دابەزینی

ئاستی بەئاگابوونی نەخۆش و ئاسانکردنی مردن بۆی، هەموو ئەمانە بە ڕێگەکانی ئۆتۆنازی هەژمار دەکرێن.

ئەنجوومەنی پزیشکانی ئەمەریکاش بەم شێوەیە پێناسەی ئۆتۆنازیی کردووە: "بە شێوەیەکی گشتی، ئۆتۆنازی بریتییە لە دەستەبەرکردنی هۆیەکانی مردنی نەخۆشێکی نائۆمێد و بەئازار لە ڕێگەیەکی خێرا و بێ ئازارەوە، ئەم کارەش بە هۆی بەزەییهاتنەوەیە بە نەخۆشدا." لێرەدا چەمکی (ئۆتۆنازی) بەو مانایە دێت، کە لە ڕێگەی هۆیەکی کوشتندەوە، بە ئامانجی نەهێشتنی ئازاری زۆری نەخۆش ئەم کارە دەکرێت. سەرچاوەکانی دیکەش تا ڕادەیەکی زۆر پێناسەی هاوشێوەی ئەمەیان خستووەتە ڕوو: جێبەجێکردنی کارێک، کە ببێتە هۆی مردنی خێرا و بێ ئازاری نەخۆشێکی چارەسەرنەبوو و کۆتاییهێنان بە ئازارچەشتنی، یان کۆتاییهێنان بە چارەسەرە نەخوازراوە پزیشکییەکان.

ئینسایکلۆپیدیای مۆڕاڵی زیندەوەرناسی پێناسەیەکی هاوشێوەی ئەم پێناسەیەی پێشووی خستووەتە ڕوو. ژمارەیەک لە یاساناسانیش لە پێناسەیدا وتوویانە: ئۆتۆنازی یارمەتیدەری مردنی خۆویستانەی ئەو نەخۆشانەیە کە نەخۆشییەکی چارەسەرنەکراویان هەیە و توانی بڕیاردانیان هەیە، جێبەجێکردنیەتی بۆ ئەو نەخۆشانەی خۆیان توانی بڕیاردانیان نییە.

کەواتە ئۆتۆنازی، بە مانای کوشتن یان ڕەوایەتیدانە بە کوشتنی نەخۆشێک بەو بیانووەی کە مردن لە ژیان بۆ نەخۆشەکە باشترە، یان ئەوەتانێ لە حاڵەتی بێهۆشیی یەکجارەکیدایە و لە ڕووی پزیشکییەوە هیچ ئومێدێک بۆ بەهۆشهاتنەوەی لە ئارادا نییە، یان باری تەندرووستیی لەمانە باشتر نییە. (سەرکەوت، ١٣٩٣، ١٢٢-١٢٤) بە کورتی، دەتوانین بڵێین ئۆتۆنازی، ڕێگەپێدەری کرداری کەسی سێهەمە، ئیدی ئەو کەسە پزیشک بێت یان هەر کەسێکی دیکە، کە لە ڕێگەی کردنی کارێکەوە یان چارەسەرنەکردنەوە دەبێتە هۆی مردنی نەخۆشەکە، بە پاساوی ئەوەی لە گیانەلادایە، یان لە بێهۆشیی یەکجارەکیدایە و بە هیچ شێوەیەک ناگەڕێتەوە، یان لە دۆخێکی ڕەوتێنەری نەخۆشیدایە. جۆری هەنگاونانی کەسی سێهەم پێوەندیی بە خێراییی ماوەی مردنەکەوە هەیە، چونکە دەتوانێت ئازارەکانی نەخۆشەکە کەم بکاتەوە و یارمەتیدەری مردنێکی ئاسان بێت بۆی. ئەم کارە زۆر جار بۆ ئەو حاڵەتانەی نەخۆشی بە کار دێت، کە ئازاری زۆریان هەیە یان چارەسەری درێژخایەن و بێ ئەنجامیان هەیە. ئەم جۆرە نەخۆشانە بەردەوام هەست بەوە دەکەن بەسەر شانی خێزان و کۆمەڵگەیانەوە بارن، هەروەها پێیان وایە کەرامەت و بەهای مرۆڤایەتییان هیچ نەماوە و تەنیا لە مردندا ڕێگەی ئارامی و ئاسایشی خۆیان و خێزان و کۆمەڵگەیان دەبیننەوە.

## پێشینەی مێژوویی ئۆتۆنازی

ئۆتۆنازی لە ڕووی مێژووییەوە پێشینەیەکی دوورودرێژی هەیە و بە شێوەی جۆربەجۆر جێبەجێ کراوە. لەبارەی یەکەمین حاڵەتی کوشتنی بەبەزەییانەوە، بیروڕای جیاواز هەیە؛ (دیبایی) لەم بارەیەوە دەڵێت: لە هەندێک کۆمەڵگەدا کوشتنی نەخۆشەکان بە هۆی خەمخۆری و بەزەیي-پێداهاتنەوەوە کراوە، لە هەندێک کۆمەڵگەشدا بە هۆی (چارەسەرنەکردن)ی نەخۆشییەکەوە بووە. هەندێ جاریش کوشتنی نەخۆش لەسەر بنەمای بیروباوەڕی خورافییەوە بووە. بڕێکیش نەخۆشەکانیان خنکاندووە و گۆشتەکانیان خواردوون، ژمارەیەکیش زیندەبەچاڵیان کردوون یان سووتاندوویانن. لە شاری مارسی لە ئەورووپا، یاسایەکی تایبەت هەبووە، لەبارەی ئەو کەسانەوە کە لە ئەنجوومەنی پیراندا بەڵگەی تەواوەتییان لەبارەی باشتربوونی مردنیانەوە لە ژیانیان بە دەستەوە بدایە، ئەوا شەربەتی شوکەرانیان پێ داوە، هەندێک جار زۆربەی هۆزە کۆچەرییەکان دەستیان لە نەخۆشەکە بەر داوە، یان کوشتوویانە. (دیبایی، ١٣٨١، ٢٣٢).

ئەم کارە لە ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوادا لە دەستپێکی ژیانی مرۆڤەوە هەتا ئێستا، قسەوباسی لەبارەوە کراوە. بە دیوێکی

تردا، لەوانەیە بتوانین مشتومڕەکانی پێوەست بە مۆڕاڵیبوونی کردنی ئەم کارەوە بگەڕێنینەوە بۆ پێشینەی درووستبوونی کۆمەڵگە شارستانییەکانی ئادەمیزاد. ئەم کارە لە هەموو سەردەمێکدا و لە گشت شوێنێکی جیهاندا کراوە و شتێکی نوێ نییە، کە ڕۆژنامەکان و ناوەندە زانستییەکان بۆ یەکەم جار باسی لێوە بکەن.

هاوکات لەگەڵ بەکارهێنانی چەمکی ئۆتۆنازیدا دوو چەمکی (ئۆرتۆتانازیا) و (ئەنتی دیستانازیا) بە مەبەستی ڕێگریکردن لە مردنی بەئازار و درێژخایەن و بێڕێزانە هاتنە کایەوە. لەوانەیە نووسەرانی کۆمێدیی یۆنانی، وەک: میناندەر، پۆسیدیپۆس و کراتینۆس، بۆ یەکەم جار ئەم وشەیەیان بە کار هێنابێت. لە دیدی ئەوانەوە ئۆتۆنازی بە جۆرێک مردنی خێرا و بێ ئازار لە قەڵەم دراوە. لە مێژووشدا ئاماژە بەوە دراوە، کە ئیمپراتۆر ئاگۆستۆس خوازیاری مردنێکی لەم چەشنە بووە.

لە سوێندنامەکەی هیپۆکراتیس (٤٦٠-٣٧- پ. ز.) کە بۆ سەردەمی سۆکرات دەگەڕێتەوە و لە دیدی زۆربەی پزیشکان و لایەنگرانی مافی ژیانەوە بە یەکێک لە دەقە باوەڕپێکراوە کۆنەکان لە قەڵەم دەدرێت، زۆر بە ڕوونی ئۆتۆنازیی ڕەت کردووەتەوە. بەڵام بانگەشەکارانی مافی مردن، بە چاوی گومانەوە سەیری ئەم دەقەی هیپۆکراتیس دەکەن و پێیان وایە هیپۆکراتیسیش لەم بارەیەوە ئاماژەی بە هیچ شتێک نەکردووە.

پاشخانە فیکرییە جیاوازەکانی جیهانبینیی کۆن و نوێیش کاریگەریی زۆریان بەسەر هەڵوێست و بڕیارەکان لەبارەی

ئاسانمردنەوە هەیە. لە جیهانبینیی کۆندا ژیانی کۆمەڵایەتی لە بنچینەدا بوو، بۆیە لە ڕوانگەی کەسانی وەک ئەفلاتوونەوە ئەو کەسانەی سوودیان بۆ کۆمەڵگە نییە و ناهێڵن کۆمەڵگە بگاتە شاری چاک (یۆتۆپیا) شایەنی مردنن.

سێ قوتابخانەی فەلسەفیی گرنگ و کاریگەر، کە دژی خۆکوشتن بوون، بریتی بوون لە فیساگۆرسییەکان، نوێ-ئەفلاتوونییەکان و ئەرەستۆییەکان. قۆتابخانەکانی یەکەم و دووەم باوەڕیان وا بوو خودا دەسەڵاتی بەسەر ژیان و مردنی مرۆڤەکانەوە هەیە، بۆیە لەو باوەڕەدا بوون، کە مرۆڤەکان هیچ جۆرە دەسەڵاتێکیان بەسەر کاتی ژیان و مردنیانەوە نییە. ئەمانە خۆکوشتنیان ڕەت کردووەتەوە، هەر وەک چۆن لە دیدی ئایینییەوە بە گوناهێکی گەورە لە قەڵەم دەدرا. لە سەردەمانی دواتردا بنچینەکانی دژایەتیکردنی ئایینی مەسیحیی بەرانبەر مەسەلەی خۆکوشتن بۆ ئەم دوو قوتابخانەیە گەڕێنرایەوە. ئەرەستۆییەکانیش پێیان وا بوو خۆکوشتن دژی خواستە باشەکان و سوودەکانی کۆمەڵگە و دەوڵەتشارە، کە واتە خۆکوشتن قەدەغەیە و پێویستە قانوون ڕێکاری پێویست بگرێتە بەر بۆ ئەوەی ئەم کارە بە قانوونی نەکرێت.

بەڵام قوتابخانەکانی ئەپیکۆری، ڕەواقی و سەگگەرایی بە شێوەیەکی شێلگیرانە لایەنگری خۆکوشتن بوون. (ئەپیکۆر)ی دامەزرێنەری قوتابخانەی (ئەپیکۆری،) زۆر بە توندی لایەنگریی لە ویستی ئازادیی مرۆڤ دەکرد، بڕوای وا بوو سەلامەتیی زەین و ڕۆح بالاترین چاکەیە، دەست مرۆڤ بکەوێت. بێ گومان

گرنگترین بنەمای سەرەکیی ژیان لە ڕوانگەی ئەپیکۆرەوە (چێژ) بوو: (هەر شتێک چێژ بە مرۆڤ ببەخشێت، چاک و باشە و هەر شتێکیش ئازاری پێ بگەیەنێت خراپە.) زانایانی بواری مۆراڵی کۆن لەو بڕوایەدان، کە ئەپیکۆر عەودالی چێژ بووە یان کەسێکی چێژگەرا بووە. هەروەها ئەپیکۆرییەکان جەختیان لەسەر (چۆنیەتیی ژیان) دەکردەوە. (سەرکەوت، ١٣٩٣، ١٢٦-١٢٧)

دیوجانس (دیوژن) دامەزرێنەری قوتابخانەی سەگگەرایی قسەوباسەکانی ئەرەستۆ و ئەفلاتوونی لەبارەی درووستکردنی بەربەستی کۆمەلایەتییەوە لە بەردەم خۆکوشتندا قبووڵ نەدەکرد. ئەو پێی وا بوو لە هەر جێگەیەکدا مۆراڵ پێوەندیی بە خودی کەسەکەوە هەیە، تەنیا خۆی لە کارەکانی بەرپرسە. لەم سۆنگەیەوە ئەو کەسەی خۆی دەکوژێت، ئەگەر چێژ لەم کارەی وەربگرێت، دەتوانێت ئەم کارە بکات. ئەفلاتوون و ئەرەستۆ کوشتنی منداڵی ساوایان بە ڕەوا دەزانی. ئەوان پێیان وا بوو پێویستە خزمەتگوزارییەکانی ناو کۆمەڵگە بۆ ئەو هاوولاتیانە تەرخان بکرێن، کە دۆخێکی جەستەیی و دەروونیی باشتریان هەیە. ئەفلاتوون لە کتێبی (کۆماری)دا، بێزاریی خۆیی لەو (باوکە لاوازانە پێشان داوە، کە کوڕی لاوازیان دەبێت.) لەوانەیە ئەم خاڵەش یەکەمین باوەڕی یۆنانییەکان بێت لەبارەی چاکسازییەوە، لە ڕەگەزی مرۆڤ و گیانلەبەراندا. ئەفلاتوون لە زمانی سۆکراتەوە ئاماژە بەوە دەدات، کە (منداڵانی خەڵکانی پلەدووی کۆمەڵگە یان پلەیەکی کۆمەڵگە، ئەگەر هات و بە ناکامی

له دایک بوون، ئەوا پێویستە لە شوێنێکی دوورەدەست و نادیاردا فڕێ بدرێن.)

لەوانەیە فرەنسیس بەیکۆن یەکەم کەس بێت، کە کوشتنی نەخۆشەکانی لە ڕووی بەزەییەوە و بە دوور لە ڕەچاوکردنی بەرژەوەندییە کۆمەڵایەتییەکان بە ڕەوا زانیبێت. بەیکۆن لە سەدەی حەڤدەیەمدا پشتگیریی لەم شێوە کوشتنە کرد و بە (ئۆتانازی) ناوی برد و باوەڕی وا بوو، بەم کارە یارمەتیی ئەو نەخۆشانە دەدرێت، کە ئازار و نەخۆشیی کوشندەیان هەیە بۆ ئەوەی مردنێکی ئارام و کەم-ئازاریان هەبێت.

شەنوکەوی لایەنە مۆڕاڵی و یاساییەکانی ئۆتۆنازی، زیاتر لە کۆتاییەکانی نیوەی دووەمی سەدەی بیستەم و سەرەتاکانی سەدەی بیستویەکەمدا بە شێوەیەکی شێلگیرانە کرا. لەم کاتەدا بوو، کە وردە وردە ئۆتۆنازی بووە بابەتی قسەوباسی ناوەندە یاسایی، پزیشکی، مۆڕاڵی و ئایینییەکانی زۆربەی وڵاتانی جیهان. پرۆسەی بەیاساییکردنی ئەم مەسەلەیەش لە ساڵی (١٩٨٠)وە دەستی پێ کرد. هەر لەم ساڵەدا ڕەشنووسی ئۆتۆنازی بۆ نەخۆشەکان خرایە بەردەستی ئەنجوومەنی ئینگلتەرا و ئەنجوومەنی ئەمەریکا، بەڵام بە هۆی دژایەتیکردنی پزیشکانەوە پەسەند نەکرا. هەندێک لە توێژەران پێیان وایە، یەکەمین هەنگاوی بە یاساییکردنی ئەم کارە لە ساڵی ١٩٠٢دا بوو. لەم ساڵەدا زیاتر لە (١٥٠٠) پزیشک لە ویلایەتی نیویۆرکی ئەمەریکاوە داوای پێدانی مافی خێراکردنی مردنی ئەو نەخۆشانەیان دەکرد، کە تووشی نەخۆشیی شێرپەنجە بووبوون

و دوای نەشتەرگەری، جارێکی دیکە نەخۆشییەکەیان تێدا دەر کەوتووەتەوە و چارەسەر نەکراون. لە دەیەکانی ١٩٧٠ و سەرەتای ١٩٨٠دا، باسوخواسی ئۆتۆنازی بووبووە یەکێک لەو مەسەلانەی زۆرترین قسەوباسی لە ناوەندە جیاجیاکاندا بە گشتی و لە ناوەندە پزیشکییەکانی هۆڵەندادا بە تایبەتی لەبارەوە دەکرا. لە ساڵی ١٩٧٣دا دادگای ڕۆتەردام چەند یاسایەکی لەبارەی یاساییبوونی جێبەجێکردنی ئۆتۆنازییەوە لە چەند دۆخێکدا دەر کرد. هەر لەم ساڵەدا هۆڵەندا دامەزراوەیەکی بۆ بەرگریکردن لە ئۆتۆنازیی خۆویستانە دامەزراند. ئەم دامەزراوەیە لەبارەی ئۆتۆنازی و شێوە و دەرمانەکانی بەکارهێنانەوە لێکۆڵینەوەیەکی بە ئەنجام گەیاندبوو، بەڵام بۆ یەکەمین جار لە ساڵی ١٩٨٤دا لە لایەن ئەنجوومەنی پزیشکانی پاشایەتیی هۆڵەنداوە بڕیاری لەبارەوە درا. لە ساڵی ١٩٩٠دا مەرجەکانی ئۆتۆنازی لە ئەنجوومەنی پزیشکانی پاشایەتیی هۆڵەندا و لە وەزارەتی داددا قبووڵ کران. لە ساڵی ١٩٩٣دا چەند چاکسازییەکی لەبارەی چۆنیەتیی جێبەجێکردن و مەرجەکانی کردنی ئۆتۆنازییەوە تێدا کرا و نامیلکەیەکی تایبەت ڕاگەیەنرا، کە چەند خاڵێکی سەرەکیی تێدا بوو، لەوانەش: پێویستە نەخۆشەکە گیرۆدەی نەخۆشییەکی چارەسەرنەکراو بێت، هەروەها پێویستە نەخۆشەکە بە شێوەیەکی ئازادانە و خۆویستانە داوای ئەنجامدانی ئۆتۆنازی بکات، جگە لەمانە پێویستە ئەو پزیشکەی ئەم کارە دەکات، لەگەڵ پزیشکی دیکەشدا ڕاوێژ بکات.

لەم باسانەدا بۆمان دەر دەکەوێت کە هۆڵەندا یەکەم وڵات بووە ئۆتۆنازیی تێدا جێبەجێ کراوە. بەڵام یەکەم یاسا کە بە شێوەیەکی تایبەت لەبارەی ئۆتۆنازییەوە پەسەند کرا، (یاسای مافی مردن)ی ناوچەی باکووری ئوسترالیایە، کە لە ساڵی ١٩٩٥دا پەسەند کرا. ناوچەی باکووری ئوسترالیا یەکەم ناوچە بوو، کە بە پێی ئەم یاسا تایبەتە ئۆتۆنازیی قبووڵ کرد، بۆیە ئەم ناوچەیە لە ڕووی یاساییەوە پێش هۆڵەندا کەوتووە، بەڵام هۆڵەندا لە ڕووی قبووڵکردنی ئۆتۆنازییەوە لە ڕێگەی پرۆسە دادگاییەکەیەوە پێش ناوچەی باکووری ئوسترالیا کەوتووە.

پێویستە ئاماژە بەوە بکرێت، کە ئۆتۆنازیی چالاکانە لە هەموو شوێنێکی دنیادا جگە لە کۆڵۆمبیا نایاساییە. لە هۆڵەندا ئەو پزیشکانەی بە خواستی نەخۆشەکانیان دەرمانی ژەهراوییان دەرخوارد دەدەن یان بە دەرزی لێیان دەدەن، لێپێچینەوەی یاساییان لەگەڵدا دەکرێت. لە کەنەداشدا ئەو پزیشکانەی یارمەتیی نەخۆشەکان دەدەن بۆ ئەوەی خۆیان بکوژن، لە یاسا لایان داوە و بە ١٤ ساڵ بەندکردن سزا دەدرێن. لە ساڵی ١٩٩٦دا دادگای باڵای ناگۆیای ژاپۆن، جێبەجێکردنی ئۆتۆنازیی بە پێی ڕەچاوکردنی هەندێک هەنگاوی یاسایی پەسەند کرد و جەختی لەوە کردەوە کە پزیشکان ئەم کارە دەکەن. هەروەها جێبەجێکردنی هەر جۆرە ئۆتۆنازییەک بۆ ئەو نەخۆشانەی خۆیان توانی بڕیاردانیان نییە، نایاساییە. لە وڵاتانی مەکسیک، ئیتاڵیا و باشووری ئەفریقیادا ئەم کارە بە کوشتن لە قەڵەم دەدرێت. لە بەریتانیاش گرووپەکانی لایەنگری ئۆتۆنازی چەند

دەیەیەکە سەرقاڵی پشتگیریکردنی ئەم کارەن، کەچی هێشتا ئۆتۆنازی و خۆکوشتنیش با هاوکاریی پزیشکییشی لەگەڵدا بێت، هەر بە کارێکی نایاسایی و قەڵاچۆکردنی ڕەگەزی و وەک کوشتن لە قەڵەم دەدرێت. لە فەڕەنساش بە هەمان شێوەیە؛ ئۆتۆنازی وەک کوشتن حیسابی بۆ دەکرێت، بەڵام کاری ئەو پزیشکە فەڕەنسییانەی هاوکاریی نەخۆشەکان دەکەن، بۆ ئەوەی بە ئاسانی بمرن، تەنیا وەک هەنگاوێک بۆ نەهێشتنی ئازاری نەخۆشەکان لە قەڵەم دەدرێت، نەک کارێکی خۆویستانەی پزیشکان بۆ کوشتنی نەخۆشەکان. لە ئەڵمانیاشدا چەمکی یارمەتیدانی مردن جێگەی ئۆتانازیی گرتووەتەوە، بۆ ئەوەی لەگەڵ ئۆتانازیدا بەراورد نەکرێت. هەم ئۆتۆنازی و هەمیش خۆکوشتن بە هاوکاریی پزیشک، نایاسایین و ئەو کەسانەی ئەم کارانە دەکەن، پێنج ساڵ بەند دەکرێن. لە سەرانسەری جیهاندا چەندان ڕێکخراوی تایبەت بۆ پشتگیریی مافی مردن دامەزراون، کە ڕاستییەکەی ئامانجی ئۆتۆنازی، ئەوەیە لە لای کۆمەڵگە و لە یاساشدا مردنی خۆویستانە قبووڵ بکرێت. لە سەردەمی نوێدا، بە زیادبوونی قسەوباسەکانی ئۆتۆنازی و خۆکوشتنی یارمەتیدەرانە لە ڕێگەی پزیشکەوە، بە شێوەیەکی زۆر ورد درووستکردنی گرووپی لایەنگر و نەیاری ئەم کارە خرایە بەر باسەوە و چوارچێوە و میکانیزمێکی تایبەتیان بۆ لایەنگری و دژایەتیی ئەم کارە دارشت. لە درێژەی ئەم باسانەماندا، بە شێوەیەکی وردتر لەبارەیەوە دەدوێین. (سەرکەوت، ١٣٩٣، ١٢٩)

## جۆرەکانی ئۆتۆنازی

ئۆتۆنازی لە دوو ڕووەوە دابەش دەکرێت: (یەکەم، جیاوازییەکی سیانی کە لە نێوان ئۆتۆنازیی خۆویستانە، خۆنەویستانە و ناچاریدا جێبەجێ دەکرێت؛ (دووەم،) ئەو جیاوازییەی لە نێوان ئۆتۆنازیی چالاکانە و ناچالاکانەدا هەیە.

## ئۆتۆنازی بە پێی هۆشیاری و ڕەزامەندیی نەخۆش

### ئۆتۆنازیی خۆویستانە:

ئەگەر نەخۆشێک خۆی بیەوێت ئەم کارە بکات، واتا هۆشیاری و لێوەشاوەییی ئەم کارەی هەبێت و پاش بیرکردنەوە و ڕەزامەندی، خۆی بڕیاری لەبارەوە بدات، ئەوا بە ئۆتۆنازیی خۆویستانە ناو دەبرێت.

خاڵی مۆڕاڵیی گرنگی ئەم جۆرە ئۆتۆنازییە، سەربەخۆییە لە بڕیارداندا. لەوانەشە ڕێزگرتن لە سەربەخۆییی نەخۆش، گرنگترین هۆکاری ڕێگەپێدانی ئۆتۆنازیی خۆویستانە بێت. دەبێت مافی سەربەخۆیی لە بڕیارداندا، هەڵگری مافی کۆتاییهێنان بە ژیانیشی هەبێت. سەرەڕای ئەمانەش، لایەنگرانی

ئۆتۆنازی، باوەڕی پتەویان بەوە هەیە کە ڕێزگرتن لە خواستە سەربەخۆکانی نەخۆش جگە لەوەی لە ڕووی مۆڕاڵییەوە ڕێگە بە کردنی ئەم کارە دەدات، لە هەمان کاتیشدا پێویستە هاوکاریی نەخۆشەکە بۆ ڕزگاربوونی لە ژیان بکرێت.

ڕەخنەی زۆر توندیش لە ئۆتۆنازی گیراوە؛ هەندێک لەوانە پێیان وایە هەرچەندە دەبێت مرۆڤەکان لە ژیانیاندا سەربەخۆ بن، بەڵام ئەم مەسەلەیە بۆ دەستپێک و کۆتاییی ژیان بە هیچ شێوەیەک پێڕەو ناکرێت. بەشێکی زۆری ئایینگەراکان بەم شێوەیە بیر دەکەنەوە. ئەوان لەو بڕوایەدان کە ژیان موڵکی ئەوان نییە، تاوەکوو هەر کاتێک و هەر چۆنێک ویستیان، کۆتاییی پێ بهێنن. ژیان خەڵاتێکی خودایییە و ئێمە مافی ڕەهامان بەرانبەر ژیان نییە، بەڵکوو لێرەدا خۆتێهەڵقوتانێکی ڕاستەوخۆ هەیە، بۆیە پێویستە ئاگاداری ئەو خاڵە بین کە ئەم جۆرە لێکدانەوانە لەوانەیە ببنە هۆی قەدەغەکردنی هەموو جۆرەکانی دیکەی کوشتن.

## ئۆتۆنازیی خۆنەویستانە:

ئەگەر کەسێک تووشی نەخۆشییەکی کوشندە بووبێت و هۆشیاریی خۆیی لە دەست دابێت، بۆ نموونە ئەو کەسانەی تووشی ڕووداوێکی هاتوچۆی مەترسیدار بووبن و لە حاڵەتی بێهۆشیدا بن، یان منداڵێکی ساوا، کە توانی قسەکردن و ڕادەربڕینی نییە، لەم حاڵەتانەدا جێبەجێکردنی ئەم کارە دەبێتە

ئۆتۆنازیی خۆنەویستانە. (سەرکەوت، ١٣٩٣، ١٣١) لەم حاڵەتانەدا پابەندبوون بە بنەمای ڕێزگرتنەوە لە سەربەخۆبوونی نەخۆش لە بڕیارداندا کارێکی دژوار و ئەستەم دەبێت، چونکە نەخۆشەکان لەم حاڵەتانەدا توانی بڕیاردانیان نییە، یان هێشتا نەگەیشتوونەتە ئاستی بڕیاردان. ئێمە لەسەر بنچینەی ئاگاداریی نەخۆشەکە لە دۆخی نەخۆشییەکەی، دەتوانین بەڵگە بۆ ئەم کارەمان بهێنینەوە. لێرەدا دەتوانین خواستی نەخۆشەکە بۆ ژیان و مردن بە ڕێکوپێکی بزانین. هەرچەندە بەم کارەمان هەوڵ دەدەین پابەندی سەربەخۆبوونی نەخۆش بین، بەڵام ئەگەری ناڕوونی و بڕیاری نادرووست لەم حاڵەتانەشدا بوونی هەیە. ئەگەر لەم حاڵەتانەدا وەسیەتنامە، یان نووسینێکی تایبەتیی نەخۆشەکە هەبێت، کە نەخۆشەکە ڕاشکاوانە ئاماژەی بە خواستی خۆی لەبارەی چۆنیەتیی مردنەکەیەوە دابێت، ئەوا گرفتێکی ئەوتۆ درووست نابێت. ئەمەش دەچێتە خانەی ئۆتۆنازیی خۆویستانەوە، چونکە ئۆتۆنازیی خۆنەویستانە لەو کاتانەدایە، کە پزیشکان هیچ زانیارییەکیان لەبارەی خواستەکانی نەخۆشەکەوە نییە.

کە واتە پێویستە ڕێگەچارەیەک بۆ یەکلاییبوونەوەی ئەنجامدانی ئۆتۆنازیی خۆنەویستانەوە هەبێت، تاوەکوو لە ڕێگەیەوە بە ئاسانی بڕیاری مردنی نەخۆشەکە بدەین. هەڵبەت لێرەدا دەبێت ئاگاداری ئەوە بین کە جێبەجێکردنی بڕیاری ئۆتۆنازیی خۆنەویستانە بەسەر نەخۆشێکدا لەسەر بنەمای پێوەرێکی زەینی نییە، تا بزانین نەخۆشەکە چ نیازێکی لەسەردا

بووه، بەڵکوو پێوەرێکی بەردید و واقعییە لەسەر ئەو گریمانەیەی، ئەگەر بێت و مرۆڤێکی خاوەن هۆش و گۆش لەم حاڵەتەدا بێت، چ بڕیارێک لەبارەی ژیانیەوە دەدات؟ بنچینەی ئەم ڕێگەچارەیە لەسەر ئەوە بنیات نراوە، کە دۆخی ژیان لە چەند حاڵەتێکدا ئەوەندە خراپە، کە مردن لەو ژیانە باشترە.

## ئۆتۆنازیی ناچاری:

ئەگەر بێت و نەخۆشەکە ئاگای لە خۆی بێت، بەڵام ئۆتۆنازیی بەسەردا بسەپێنن، بەم حاڵەتە دەگوترێت ئۆتۆنازیی ناچاری. لەم حاڵەتەدا نەخۆشەکە دەیەوێت درێژە بە ژیان بدات، بەڵام پزیشکان مردنی بەسەردا دەسەپێنن.

بەڵام لەم حاڵەتەی ئۆتۆنازیدا بەڵگەهێنانەوەی مۆڕاڵی بۆ ئەم کارە دژوار دەبێت، چونکە بە هەموو شێوەیەک سەربەخۆییی نەخۆش لە بڕیاردانادا پێشێل کراوە. تەنیا جێبەجێکردنی خواستەکانی کەسانی دیکەیە، کە پاساو بۆ ئەم کارەمان دێنێتەوە. هەرچەندە ئەم کارە پێچەوانەی خواستەکانی نەخۆشەکەش بێت.

ئەرککەراکان بڕوایان وایە ئەم کارانە هێندە نامۆڕاڵین، کە بە هەموو شێوەیەک ڕەت دەکرێنەوە، تەنانەت ئەگەر بێت و سوودێکی زۆریش لەم کارە بە دەست بێت. ئەوان لەو بڕوایەدان کە جیهانی ڕێگەپێدەری ئەم جۆرە کارانە زۆر خراپترە لەو

جیهانەی کە ڕێگەیان پێ نادات. بەڵام لێرەشدا پێویستە ئاماژە بەوە بدرێت کە ئەو مەترسییەی لە قانوونیبوونی ئۆتۆنازیدا هەڕەشە لە تاکەکان دەکات، زۆر کەمترە لەو مەترسییەی لە حاڵەتی ناقانوونیبوونی ئەم کارەدا هەیە. تەنیا لە یەک کاتدا دەکرێت کوشتنی مرۆڤێک بە پێچەوانەی خواستی خۆیەوە بە ڕەوا بزانرێت، ئەویش ئەو کاتەیە، کە بە هۆی ئەو نەخۆشەوە ژیانی خەڵکانێکی زۆر لە مەترسیدا بێت، هەرچەندە بەشێک لە فەیلەسووفانیش ئەم بیانووەیان بە لاوە پەسەند نییە. کە واتە ئۆتۆنازیی ناچاری، کارێکی قبووڵکراو نییە.

## ئۆتۆنازی بە پێی شێوازی جێبەجێکردنی

ئەم کارە بە پێی شێوازی جێبەجێکردنەکەیشی بۆ دوو بەش دابەش دەکرێت: (یەکەم،) ئۆتۆنازیی ناچالاکانە؛ (دووەم،) ئۆتۆنازیی چالاکانە. (لاریجانی، ١٣٨٣، ٥٢)

### (یەکەم،) ئۆتۆنازیی ناچالاکانە

لەم شێوازەدا، تیمی پزیشکی چاودێری و چارەسەرە تەندروستییەکان دەوەستێنن بۆ ئەوەی نەخۆشەکە وردە وردە کۆتایی بە ژیانی بێت. ئەم کارەش لەو کاتەدا دەکرێت کە پزیشکان لە درێژەدان بە چارەسەرکردنی نەخۆشییەکە بێ هیوا دەبن. بۆیە هەموو ئامێرە پزیشکییە سەرەکییەکانی چارەسەری نەخۆش وەک ئامێری ئۆکسجین و هاوشێوەکانی، لە نەخۆشەکە جیا دەکرێنەوە و پرۆسەی چارەسەرکردنەکە دەوەستێنن. لەوانەیە "ڕێگەنەدان بە ژیانیش بۆ هەندێک لە نەخۆشەکان بە پێی ڕێسای (dnr) هەر بەم شێوەیە بێت." (هەمان، ٥٢-٥٣) یەکێک لەو بابەتانەی پێوەندیی توندوتۆڵی بەم خاڵەوە هەیە، پێناسەی پزیشکییە لە مردنی بایۆلۆجیدا.

لێرەشدا چەندان پێناسەی جیاواز لەبارەی مردنەوە و لە ڕوانگەی پزیشکییەوە خراونەتە ڕوو؛ (لە ساڵی ١٩٦٨دا لیژنەیەک لە پزیشکانی زانکۆی هارڤارد مردنی بە لەکارکەوتنی هەموو چالاکییە فیزیۆلۆجییەکانی مێشک پێناسە کرد. لە ساڵی ١٩٧٠دا جارێکی دیکەش بابەتەکە خرایەوە بەر باس و مەسەلەی

ئۆتۆنازیی خراپە ڕوو، کە لەو کاتەدا مردن بە مانای لەکارکەوتنی بەشە سەرەکییەکانی جەستە، وەکوو مێشک و سییەکان پێناسە کرایەوە.) (زالی، ١٣٨٧، ٤٩٥) لە ساڵی ١٩٩٤دا پێشنیاری ئەوە کرا کە ئەو کەسانەی تووشی مردنی مێشک دەبن، ئیدی پێویست ناکات ئامێری پزیشکی بۆ پاراستنی دڵ و سییەکانی، لە نەخۆشەکە ببەسترێت. بۆیە ( لە هەندێک وڵاتانی وەکوو: فەڕەنسا، دانیمارک، ئەڵمانیا، ئینگلتەرا و لە هەندێک ویلایەتی ئەمەریکایش مردنی مێشک وەک مردنی یەکجارەکی لە قەڵەم دەدرێت، بۆیە لەم حاڵەتەدا پاش جیاکردنەوەی ئامێرەکان لە نەخۆشەکە، یەکسەر پزیشک دەتوانێت هەندێک لە ئەندامەکانی نەخۆشەکە وەک جگەر، گورچیلە و دڵی بۆ چاندن لە نەخۆشێکی دیکەدا بە کار بهێنێت، بەو مەرجەی ئەم ئەندامانە مەرجەکانی چاندنیان تێدا بێت.) (دیبایی، ١٣٨١، ٢٥٤)

**(دووەم)، ئۆتۆنازیی چالاکانە**

ئەم شێوازەی کوشتنی نەخۆش لە ڕێگەی پێدانی دەرمانێکی کوشندەوە و لە لایەن پزیشکەوەیە، کە لەم حاڵەتەدا (پزیشک یان خزمانی نەخۆش بە شێوەیەکی ژیرانە باری خۆکوشتنەکە لە نەخۆشەکە تێدەگەیەنن و بڕێکی زۆری ماددەی بێهۆشکەر دەخرێتە بەردەستی نەخۆشەکە، تاوەکوو لە ڕێگەی زۆرخواردنیانەوە خۆی بکوژێت.) (هەمان، ٢٣٣-٢٣٤) هەڵبەت ئەمە دوایین هەنگاوی ئۆتۆنازیی چالاکانە نییە، بەڵکوو پزیشک لە کارەکەدا ڕۆڵی دەبێت و بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ مردنی

نەخۆشەکە خێراتر دەکات. ئەم جۆرە ئۆتۆنازییە، چ خۆویستانە بێت و چ خۆنەویستانە، "بەو مەرجەی بڕیاری جێبەجێکردنی ئەم جۆرە ئۆتۆنازییە لەگەڵ خواستی نەخۆشەکەدا بێتەوە، لەکاتی بەئاگابووندا، نەخۆشەکە بە هۆشیاری و بە ڕوونی دان بە ئەنجامدانی کارەکەدا بنێت، ئەوا بە ئۆتۆنازیی خۆویستانە ناو دەبرێت. بەڵام ئەگەر هات و نەخۆشەکە لەم بڕیارە ئاگادار نەبوو و لە بەئاگابوونیدا بە کردنی کارەکە ڕازی نەبوو، بە ئۆتۆنازیی خۆنەویستانە ناو دەبرێت، تەنانەت ئەگەر نەخۆشەکە بڕوای بە ئەنجامدانی ئەم کارەش هەبێت و پزیشکەکان لە ڕازیبوونی دڵنیاش بن، هەر بە هەمان شێوەیە." (لاریجانی، ١٣٨٣، ج١، ٥٢)

## لایەنگران و نەیارانی ئۆتۆنازی

### لایەنگرانی ئۆتۆنازی

گرنگترین بەڵگەکانی لایەنگرانی ئۆتۆنازی بریتین لە: ئازارێکی لەڕادەبەدەر، کە نەخۆشانی چارەسەرنەبوو دەیچێژن، بارگرانیی نەخۆشەکان بەسەر کۆمەڵگەوە کە ناتوانن لە چالاکییە سرووشتییە مرۆییەکاندا بەشداری بکەن، هەروەها ناتوانن لەبارەی ژیانی خۆشیانەوە بڕیاربەدەست بن. (بسامی، ١٣٨٦، ١٧٤) نووسەرانی کتێبی مۆڕاڵی جێبەجێکاری، بەرەنگارییەکان

و لێکۆڵینەوە نوێیەکان لە مۆڕاڵی کردەییدا، بەڵگەکانی لایەنگرانی ئۆتۆنازییان بەم شێوەیە پۆلێن کردووە:

ئەگەر کەسێک بە دەم نەخۆشییەکی لەچارەنەهاتووەوە ئازارێکی زۆر بچێژێت، لە چەند ڕوویەکەوە وا باشترە بمرێت.

ئەگەر مردن بە سوودی کەسێک بێت، کە واتە خۆکوشتنیش بە سوودی دەبێت. لە ئەنجامدا ئەگەر کەسێک تووشی نەخۆشییەکی وەها بێت، کە واتە خۆکوشتنیش بە قازانجی دەبێت.

لایەنگرانی ئۆتۆنازی دوو مەرجیان بۆ ئەم کارە داناوە: (یەکەم،) مافی کەس پێشێل نەکرێت؛ (دووەم،) کاریگەریی خراپ بەسەر کۆمەڵگەوە بە جێ نەهێڵێت. ئەگەر بێت و ئۆتۆنازیی چالاکانە بچەسپێنرێت، بێ گومان ئۆتۆنازیی ناچالاکانەش بە فەرمی دەناسرێت. چەند تێبینییەک لەسەر ئەم بەڵگەکارییە هەیە: (یەکەمیان،) لەو وێکچوونەدایە کە بۆ مردن و خۆکوشتن دەکرێت و ڕەوابوونی یەکێک لەمانە بە پێی ڕەوابوونی ئەوی دیکەیان دەپێوێت؛ (دووەمیان،) ئەوەیە کە ناکرێت هێندە بە ئاسانی کاریگەریی کردەوەیەک هەڵبسەنگێنرێت، بەڵکوو پێویست بە چەند پێوەرێک دەکات، کە بە پێی کولتوور، نەتەوە و تاکەکانی کۆمەڵگەش ئەم پێوەرانە دێنە بوون. ئەم پێوەرە نوێیانە هیچ کاتێک ناتوانن ڕۆڵی ناساندن و هەڵوێستەکان لە بەرچاو نەگرن و تەنیا حساب بۆ خۆیان بکەن.

ئەم کەسانە بۆ لێکدانەوەکانیان بەڵگەگەلێک دەخەنە ڕوو، کە گرنگترینیان ئەمانەن:

ڕێزگرتن لە ویست و ئازادیی مرۆڤ: یەکەمین و سەرەکیترین بەڵگەیەک، کە لایەنگرانی ئۆتۆنازی پشتی پێ دەبەستن، مەسەلەی (ویست) و خواستی مرۆڤە. بە بڕوای ئەوان ئەو مرۆڤەی بە درێژاییی ژیانی، ویست و هەڵبژاردنەکانی لە لای هەموان قبووڵکراوە، بۆچی لەکاتی مردندا -کە بە بڕوای ئەوان کۆتاییی هەموو شتێکە- مافی ئەم هەڵبژاردنەی نەبێت؟ کە واتە ئۆتۆنازی وەک ڕێزگرتن لە ویست و خواستی مرۆڤ لە قەڵەم دەدرێت. لایەنگرانی ئەم کارە لەو باوەڕەدان، کە مافی هەڵبژاردنی کۆتاییهێنان بە ژیان، هاوشێوەی مافی موڵکداریی مرۆڤە بەرانبەر کاڵا و شمەکەکانی و خستنەڕوویان بە ئامانجی فرۆشتن بە کەسێکی دیکە. بۆیە پێویستە هەر مرۆڤێک مافی ئەوەشی هەبێت چارەسەرە پزیشکییەکان ڕەت بکاتەوە، تەنانەت ئەگەر بێت و تەمەنی کەم بێتەوە، چونکە تەمەنێکی کەم و پڕچێژ لە تەمەنێکی زۆر و پڕئازار باشترە.

تیۆریی سوودگەرایی: بە پێی ئەم تیۆرییە، دوورکەوتنەوە لە ئازار و گەیاندنی خۆشبەختی بۆ زۆرترین مرۆڤ بە ڕێسایەکی بنچینەییی بڕیاردانە درووستەکان دادەنرێت لە هەر جۆرە گرفتێکی مۆڕاڵیدا. بەو مانایەی پێویستە ڕێگەچارەکان بە ئامانجی سوودی گشتی کۆمەڵگە بێت. جێرمی بێنتام و جۆن ستیوارت میل لە کەسە ناودارەکانی ئەم قوتابخانەیەن. بێنتام زۆر بە ڕوونی ئاماژەی بەوە دەکرد کە (بەدەستهێنانی زۆرترین خۆشبەختی بۆ زۆرترین مرۆڤ...) بە کورتی دەتوانین بڵێین لایەنگرانی ئەم تیۆرییە پێیان وایە ئەو کەسانەی مردنیان

مسۆگەرە، بەڵام لە ڕێگەی چارەسەر پزیشکییەکانەوە دەکرێت ژیانیان درێژ بکرێتەوە، پێویستە بە هۆی لایەنی ئابووری، یان کۆمەڵایەتییەوە دەرمان و خۆراکی پێویستیان پێ نەدرێت، بۆ ئەوەی زوو بمرن، چونکە ئەم جۆرە کەسانە لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە سوودیان نییە. لەم کاتەدا لە ڕێگەی خەرجکردنی پارە و دابینکردنی پسپۆڕی پزیشکی و دوورکەوتنەوەوە لە نەشتەرگەری، باشترین خۆشبەختی بۆ زۆرترین مرۆڤ دەستەبەر دەکرێت. سێ زاراوەی مەسەلەی ئابووری، چۆنیەتیی ژیانی نەخۆش و باشترین بەرژەوەندیی مرۆڤ، ئەو بابەتانەن، کە تیۆریی سوودگەرایی پشتیان پێ دەبەستێت. (بسامی، ١٣٨٦، ١٧٦).

تیۆریی بەزەییپێداهاتنەوە: نووسەرانی ئۆتۆنازی بە یەک ئەندازە لەسەر ئازاری کۆنترۆڵنەکراو و ئازاری زۆر هەڵوێستە دەکەن. مەسەلەی بەزەییپێداهاتنەوە جەخت لەوە دەکاتەوە، کە دڵسۆزیی مرۆڤ لەوەدایە، مردنێک لە سایەی عیززەتدا پێشکێش بە نەخۆش بکەین، نەک ڕێگە بدەین لە تاو ئازاری گیانی گیانەڵڵا بکات. ئەگەر نەخۆشێک بۆ ئازارنەچەشتنی زیاتر پێویست بە مردن بکات، ئیدی شتێکی زۆردارانە دەبێت، ئەگەر بمانەوێت ژیانی درێژ بکەینەوە. بۆیە کۆتاییهێنان بە ژیانی وەها کەسێک، جۆرێکە لە سۆز و میهرەبانی بەرانبەری.

یاسای زێڕین: ئەم یاسایە جەخت لەوە دەکاتەوە کە یاسا مۆراڵییەکان دەبێت جیاکاری نەکەن. بە واتایەکی تر، ئەگەر نەخۆشێک نەیەوێت پزیشک بە پێی یاسایەک کارێکی بەرانبەر

بکات، نابێت بۆ خەڵکانی دیکەش قبووڵی بکات. بە هەمان شێوە ئەگەر نەخۆشێک بیەوێت پزیشک یاسایەکی بۆ بە کار بهێنێت، دەبێت بەکارهێنانی ئەم یاسایە بۆ خەڵکانی دیکەش قبووڵ بکات. ڕاستییەکەی ئەم تیۆرییە لەسەر ئەو بنەمایەیە، کە هەر کاتێک مرۆڤ مردنێکی ئارامی بۆ خۆی پێ خۆش بوو، دەبێت بۆ خەڵکانی دیکەشی پێ خۆش بێت. ئەمە لە کاتێکدایە هەندێک کەس بۆ خۆیان مردنێکی ئارامیان دەوێت، بەڵام بۆ خەڵکانی دیکە ڕەتی دەکەنەوە. (سەرکەوت، ١٣٩٣، ١٣٦) ئەو باسانەی لەمەپێش ئاماژەمان پێ دان، گرنگترین بەڵگەکانی لایەنگرانی ئۆتۆنازین، لە بەرانبەر ئەمانەشدا نەیارانی ئۆتۆنازی چەندان بەڵگە بۆ ڕەتکردنەوەی لایەنگرانی ئۆتۆنازی دەخەنە ڕوو، کە گرنگترینیان ئەمانەن:

## نەیارانی ئۆتۆنازی

نەیارانی ئۆتۆنازی بەڵگەیەکی کانتی بۆ هەڵوێستەکانیان دەهێننەوە و درێژدان بە ژیان و پاراستنی ژیان بە ئەرکێکی مۆڕاڵی لە قەڵەم دەدەن. "بە بڕوای کانت بیانووی خۆکوشتن و هەر بیانوویەکی لەم شێوەیە لەگەڵ بنەما گشتییە مۆڕاڵییەکاندا دژ بە یەکن، چونکە ئەم بیانووانە کەسین و بۆ جێبەجێکردنی ئەرکێکی کۆمەڵایەتی نین." (محمد تقی اسلامی و جمعی از نویسندگان، ١٣٨٦، ١٦٩) نەیارانی ئۆتۆنازی بڕوایان وایە هەر کاتێک ئەم کارە ڕەهەندێکی یاسایی پێ بدرێت، ئەوا دەبێتە وزەیەکی شاراوە بۆ ئەو کەسانەی بە شێوەیەکی خراپ سوود

لە چاودێرییە پزیشکییەکان وەردەگرن. هەنگاوی یەکەمی قانوونی، بوونی ئۆتۆنازی لە کۆمەڵگەدا دەبێتە هۆی ئەوەی هەنگاوە چەوتەکانی دیکەش ئاسانتر بنرێن. بەمەش دەگوترێت بەڵگەکانی تیۆریی هەڵخلیسکان. بیل کامیساری، پرۆفیسۆری قانوونی زانکۆی میشیگان، یەکێکە لە نەیارە ناسراوەکانی ئۆتۆنازی، کە هەڵمەتێکی سێلایەنەی دژی ئۆتۆنازی داوە:

(١) مەترسیی خراپبەکارهێنانی ئۆتۆنازی لە لایەن چاودێرانی تەندرووستییەوە؛

(٢) تیۆریی خلیسک؛

(٣) مەترسیی کەوتنە هەڵەی لایەنگرانی تیۆریی (خلیسک) کە پێیان وایە هەر کاتێک کوالیتیی ژیان دابەزیبێت، کۆمەڵگە دەتوانێت کۆتاییهێنان بە ژیان قبووڵ بکات، ئیدی هیچ شێوەیەکی ئاوەزمەندانە بۆ ئۆتۆنازی نابێت.

بیل کامیسار لە کۆتاییدا دەگاتە ئەو ئەنجامەی کە بە یاساییکردنی ئۆتۆنازیی خۆویستانە، وردە وردە ئۆتۆنازیی خۆنەویستانەش بە یاسایی دەکرێت، چونکە جیاکردنەوەی لۆژیکییانەی ئەو کەسانەی خۆیان بە بارێک بەسەر کۆمەڵگەوە دەزانن و دەیانەوێت بمرن، کارێکی ئەستەم دەبێت. لە ئێستاشدا فراوانبوونی ئۆتۆنازیی منداڵان بەڵگەیەکی ڕوونی ئەم قسانەیە.

لە لایەکی دیکەشەوە، لەوانەیە ئۆتۆنازیی خۆویستانەی نەخۆش پێشێلی سەربەخۆبوونی بکات، چونکە ئەگەری ئەوە لە ئارادا دەبێت، کە نەخۆشەکە بە گوشاری خزم و هاوڕێیانی و ئازاری ویژدانی خۆی ویستبێتی قبووڵی ئۆتۆنازیی بکات.

جێبەجێکردنی ئۆتۆنازی، دەبێتە هۆی نەهێشتنی متمانەی نەخۆشەکان بەرانبەر پزیشکان و پێوەندیی نێوان پزیشک و نەخۆش تێک دەدات.

## نەیارانی ئۆتۆنازی بەم شێوەیە ڕەخنە لە لایەنگرانی ئۆتۆنازی دەگرن:

هەڵسەنگاندنی تیۆریی ویست و هەڵبژاردن: نەیاران لەو باوەڕەدان، کە ئازادی و ویستی مرۆڤ ڕەها نییە و سنووریکی هەیە. لەو کاتەدا ئازادی و ویستی مرۆڤ ڕێزلێگیراو دەبێت، کە لەسەر بنەما و چوارچێوەی بەها مۆڕاڵییەکان بێت. مافی هەڵبژاردن تەنیا بۆ ئەو بابەتانە دەبێت، کە ڕەهەندێکی مۆڕاڵی و یاساییان هەیە و بەم شێوەیە لە ڕێگەی پێشکەوتندا یاریدەی ئێمە دەدەن. لێرەدا هەم پێشکەوتن و بەرزبوونەوەی خۆمان و هەم پێشکەوتن و بەرزبوونەوەی کەسانی دیکەش ڕەچاو دەکرێت. ئەو کەسانەی دژی ئازادیی ڕەهای مرۆڤن، نموونەگەلێکیش لەبارەی ئازادیی تاکەکەسیی سنووردار و لە ڕێگەی یاساکانی سزادانەوە دەخەنە ڕوو، تەنانەت نموونە بە سزادانی لێخوڕینی ئۆتۆمۆبیل بەبێ پشتێنی سەلامەتی دەهێننەوە، هەرچەندە ئەم کارە هێندەش نامۆڕاڵی نییەن هەتا بەم شێوەیە سزا بدرێت. لەم ڕوانگەیەوە، ئازادیی خواست و ویستی مرۆڤ ڕەها نییە و سنوورێکی بۆ دانراوە. نەیارانی

ئۆتۆنازی پێیان وایە سەربەخۆبوونی نەخۆش لە بڕیارەکانی بۆ هەموو مرۆڤەکان گونجاو نییە. ئەو کەسانەی لە ڕووی جەستەیی و ئاوەزەوە پێنەگەیشتوون، لێوەشاوەیی گونجاویان بۆ بڕیاردان لەبارەی ژیانیانەوە بە پێی شێوە پێشنیارکراوەکانی ئەم یاسایە نییە. سەرەڕای ئەمانەش، کەسانی پێگەیشتوو بە هۆی دۆخی هزری و جەستەیی تایبەتەوە دەکەونە حاڵەتێکەوە، کە سەربەخۆبوونی خۆیان لە دەست دەدەن. بە کورتی لە ڕوانگەی ئەم کەسانەوە، هەرچەندە مرۆڤ ئازادە، بەڵام ئەم ئازادییەی چوارچێوەیەکی مۆراڵی، یاسایی و ئایینیی هەیە.

هەڵسەنگاندنی تیۆریی سوودگەرایی: نەیارانی ئۆتۆنازی پێیان وایە، ئەگەر پێوەری کردنی ئەم کارە سوودگەرایی بێت، کە واتە جگە لە کوشتنی نەخۆشانی بێچارەسەر، دەبێت منداڵی ناتەواوی زگماکی و دواکەوتوو لە ڕووی مێشکەوە بۆ سوودگەیاندن بە کۆمەڵگە بکوژرێن. لەوانەیە کەسانی دیکەش بەم بیانووەوە حوکمی کوشتنیان بەسەردا بدرێت. لە تێڕوانینی قوتابخانەی سوودگەراییەوە زۆر بە سادەیی بەها و نرخی ڕاستەقینەی ژیان فەرامۆش بکرێت. لە تێڕوانینی هەندێ لە ڕەخنەگرانەوە، ناکرێت بەهای ژیانی مرۆڤێک بە پێوەری ڕادەی بەرهەمهێنانی شمەک و ئامراز لە لایەن کەسەکەوە بپێورێت، یان ناکرێت بە پێی ئاستی باجدانی کەسەکە حساب بۆ نرخی ژیانی بکرێت. پێویستە مرۆڤەکان لە چالاکییە کۆمەڵایەتییەکاندا بۆ ژیان بەشدارییان هەبێت. بەڵام ئەمە نابێتە تاکە هۆکاری ژیانی مرۆڤەکان. (ئامانجی ئابووری، پاراستن و بەردەوامیدانە بە ژیان، لە کاتێکدا

ئامانجی ژیانی مرۆڤ، پاراستن و بەردەوامیپێدانی ئابووری نییە.) هەروەها ئەم ڕەخنەگرانە پێیان وایە ئەو خۆشبەختییەی کە لایەنگرانی قوتابخانەی سوودگەرایی بانگەشەی بۆ دەکەن، تەنیا یەک مانای نییە. ئەو شتەی بۆ کەسێک بە خۆشبەختی دادەنرێت، لەوانەیە بۆ کەسێکی دیکە خۆشبەختی نەبێت. (بسامی، ١٣٨٦، ١٨٠).

ڕەخنەی تیۆریی بەزەییپێداهاتنەوە: نەیارانی ئەم کارە پێیان وایە بیانووی ئازاری جەستەیی، نابێتە تاکە هۆکار بۆ کوشتنی نەخۆشێک. ئازاری جەستەیی، جگە لە چەند حاڵەتێکی کەم، دەکرێت کۆنترۆڵ بکرێت. تا چەند سەدەی ڕابوردوو دەرمانەکانی ڕزگارکردنی ژیانی مرۆڤ کەم بوون، بەڵام ئێستا لەگەڵ پێشکەوتنی بواری پزیشکیدا، دۆزینەوەی دژەتەنەکان، نەشتەرگەریی سەرکەوتوو، یەکەکانی چاودێری و بووژانەوەی نەخۆشەکان، ڕێگریکردن لە مردن و کەمکردنەوەی ئازار دەکرێن. جگە لەمەش، دەکرێت بەهای ژیان لە ئازارچەشتندا بدۆزرێتەوە. مرۆڤ دەتوانێت خەڵکی لەوە تێبگەیەنێت چۆن کەسێکی لەخواترسی عاقڵ دەتوانێت لەگەڵ گرفتەکانی ژیان و ئازاری جەستەیی و مردنیشدا ڕووبەڕوو ببێتەوە. بە تەعبیرێکی تر، بە قبووڵکردنی ئۆتۆنازی، لەوانەیە مرۆڤ هەلی فێربوونی هەندێک شت لە ڕێگەی ئازارچەشتنەوە لە دەست بدات.

تیۆریی لێژاییی خلیسک: ئەم تیۆرییەیە باس لەوە دەکات کە بەیاساییکردنی ئۆتۆنازی، دەبێتە هۆی ئەوەی بکەوینە نشێوییەکی خلیسکەوە، کە لەوانەیە ببێتە هۆی ئەوەی بە

شێوەیەکی بێڕەحمانە ئۆتۆنازی بۆ منداڵی ناتەواوی زگماکی یان کەسانی پیر و پەککەوتە و هاوشێوەی ئەمانە بە کار بهێنرێت. بە یاساییکردنی ئۆتۆنازی دەبێتە وزەیەکی شاراوە بۆ خراپبەکارهێنانی لە لایەن کادیرانی بواری تەندرووستییەوە، بۆیە نەیارانی ئۆتۆنازی پێیان وایە هەڵگرتنی یەکەم هەنگاوی ئۆتۆنازی، دەبێتە هۆی ئەوەی هەنگاوەکانی دیکە ئاسانتر بن. پاڵنەرە سۆزدارییەکانی ئەم کارە، ناتوانن لەوە دڵنیامان بکەنەوە کە تەنیا بۆ ئەو کەسانە بە کار بهێنرێت، کە بە ویستی خۆیان دەیانەوێت بمرن. بۆیە ئۆتۆنازیی خۆویستانە سەر بۆ ئۆتۆنازیی خۆنەویستانە و زۆرەکی دەکێشێت.

چاودێریکردنی دڵسۆزانە جێگرەوەی ئۆتۆنازییە: بە پێی ئەم تیۆرییە، ڕێگەی درووستی جێگرەوەی ئۆتۆنازی، دەستەبەرکردنی چاودێریی تەندرووستیی باشە بە مەبەستی ئامادەکردنی نەخۆشەکە. چاودێرە کۆمەڵایەتییەکان و دەروونناسەکانیش بە پێی ئەزموونی کارکردنیان بۆیان دەر کەوتووە، زۆربەی ئەو نەخۆشانەی ئۆتۆنازی و خۆکوشتن قبووڵ دەکەن، یان هەوڵی بۆ دەدەن، ڕاستییەکەی نایانەوێت بمرن، بەڵکوو لەم ڕێگەیەوە دەیانەوێت سەرنجی چواردەوریان بۆ لای خۆیان ڕابکێشن. ئەم نەخۆشانە چاوەڕێی ئەوەن کەسانی چواردەوریان پێیان بڵێن: تکایە مەمرە! ئێمە تۆمان خۆش دەوێت.

ڕەخنە کردەییەکان: جگە لە ڕەخنە تیۆرییەکان، ڕەخنەگەلی کردەییی زۆریش دژی ئۆتۆنازی خراونەتە ڕوو، وەکوو:

چۆنیەتیی مسۆگەرکردنی خواستێکی باوەڕپێکراوی نەخۆش بۆ مردن، سەلماندنی هەلومەرجەکانی چارەسەرنەبوونی نەخۆشییەکە بۆ وەرگرتنی مۆڵەتی جێبەجێکردنی ئۆتۆنازی لەسەر نەخۆش، دانانی کاتێکی دیاریکراو بۆ نەخۆشەکە بۆ حاڵەتی پەشیمانبوونەوە لە بڕیاری خۆکوشتن، کاریگەریی ڕەفتاری خزمانی نەخۆشەکە لەسەر گۆڕینی بڕیارەکانی، هەروەها گرفتی چۆنیەتیی زانینی خواستی ڕاستەقینەی نەخۆش بۆ مردن لەو کاتانەدا کە شایەتەکانی بڕیاردانی خۆویستانەی نەخۆشەکە تەنیا ئەو کەسانە بن کە بە شێوەیەک لە شێوەکان دەیانەوێت نەخۆشەکە بمرێت، یان پزیشکێکە و هۆیەکانی مردنی نەخۆشەکەی ئامادە کردووە. (سەرکەوت، ١٣٩٣، ١٣٩).

## ئۆتۆنازی لە ڕوانگەی ئایینەکانەوە

بە شێوەیەکی گشتی دەتوانین بڵێین ئایینەکان لە زۆر باردا دژی کوشتن و خۆکوژین، چونکە بە پێی فێرکاری و بنەما ئایینییەکان ڕۆح و جەستەی مرۆڤ لە لایەن خوداوە درووست کراون؛ ئەوە خودایە کە لە ڕووی میهرەبانی و بەخشندەییەوە ژیانی بە مرۆڤەکان بەخشیوە. کە واتە ژیان و مردنی مرۆڤ و دوایین بڕیاری چارەنووسی لە دەستی خودادایە. کە واتە هەڵبژاردنی مردن لە لایەن مرۆڤەوە پێشێلکردنی ئەم تایبەتمەندییە ئیلاهییەیە. ئەمەش سەرەکیترین بەڵگەی ئایینییە دژی هەڵبژاردنی مردنە لە لایەن مرۆڤەوە. پاش ئەم پێشەکییە کورتە، تێڕوانینی چوار ئایینی گەورەی جیهان، واتا: جوولەکە، مەسیحیەت، بوودایی و ئیسلام دەخەینە ڕوو.

### تێڕوانینی ئایینی جوو:

لە ئایینی جوودا، نابێت هیچ شتێک ببێتە هۆی کورتکردنەوەی ژیانی ئادەمیزاد. بە پێی شەشەم حوکمی کتێبی پیرۆز، کوشتنی بە ئەنقەست قەدەغە کراوە و سزای کوشتن بۆ ئەو کەسانە دیاری دەکات، کە بە ئەنقەست کەسێک دەکوژن. بە پێی کتێبی

پیرۆز خودا تەنیا لە سێ حاڵەتدا ڕێگەی بە کوشتن داوە: (یەکەم،) لە شەڕێکی موقەددەسدا؛ (دووەم،) لە سزادانی ئەو کەسانەی شایستەی لەسێدارەدانن؛ (سێیەم،) لە بەرگریکردن لە خۆمان.

بەم پێیە خودا تەنیا ڕێگەی بە کوشتنی کەسانی تاوانبار داوە. ناکرێت لەژێر هیچ پاساوێکدا خوێنی بێتاوانێک بە ناحەق بڕێژرێت. ئەم حوکمەیش لە تەواوی کتێبە ئاسمانییەکاندا ڕەت کراوەتەوە. هەڵبژاردنی مردن لە لایەن مرۆڤەوە، لە ڕوانگەی کتێبە ئاسمانییەکانەوە دەکەوێتە چوارچێوەی پێناسەی کوشتنەوە. هیچ ڕێگەپێدانێک بە بیانووی بەزەییپێداهاتنەوە بۆ کوشتنی نەخۆشێک لە ئارادا نییە، تەنانەت ئەگەر نەخۆشەکە خۆیشی داوای مردن بکات. هیچ کەسێکیش ناتوانێت مردن بەسەر کەسێکدا بسەپێنێت، چونکە مرۆڤەکان موڵکی خودان. کە واتە خۆکوشتن و ئۆتۆنازییش دژی کتێبی پیرۆزن و پێشێلی حوکمی شەشەمی کتێبەکە دەکەن.

## ئایینی مەسیح:

لەم ئایینەشدا کوشتن قەدەغە کراوە و هیچ مۆڵەتێک بۆ کوشتن بە بیانووی بەزەییپێداهاتنەوە لە ئارادا نییە. لە ئینجیلدا بە ڕوون و ئاشکرایی ئاماژە بەوە کراوە کە نابێت مرۆڤ تووشی کوشتن ببێت: (هاوڕەگەزەکانتان مەکوژن! وەک خۆتان خۆشتان بوێن! هەروەها بە زۆر هۆکاری دیکە خۆکوشتن قەدەغە کراوە. ئەو کەسەیشی خۆی دەکوژێت، نابێت مەڕاسیمی

بەخاكسپاردنی بۆ بە ڕێوە بچێت. لە ئێستادا پاپا جۆن پۆڵی دووەم*ی كاسۆلیكی دژایەتییەكی زۆری هەڵبژاردنی مردن لە لایەن مرۆڤەوە دەكات. پاپا وتوویەتی: (تەنیا خودا دەسەڵات و توانی بەسەر ژیان و مردنی مرۆڤەكاندا هەیە.) (بسامی، ١٣٨٦، ١٨٩)

لایەنگرانی ئایینی مەسیحی پێیان وایە هەڵبژاردنی مردن لە لایەن مرۆڤەوە بەدرۆخستنەوەی بوون و مافی خودایە لەبارەی ژیان و مردنی مرۆڤەوە. هەڵبەت ئەم تێڕوانینە لە جیهاندا زۆر جێی خۆی نەكردووەتەوە و هەندێک لە پێڕەوانی ئەم ئایینە چەند فۆرمێكی هەڵبژاردنی مردنیان لە لایەن مرۆڤەوە لا پەسەندە. ئەوان پێیان وایە خودای میهرەبان ئەم جۆرە تاقیكردنەوە قورسانە پەسەند ناكات و یارمەتیدانی مردنی نەخۆشێک، كە لەتاو ئازاری گیانی ئارامیی لێ براوە، نیشانەی دڵسۆزی و میهرەبانییە. پەیڕەوانی ئایینزای پرۆتستانتیش پشتگیریی هەڵبژاردنی مردن لە لایەن مرۆڤەوە دەكەن. ئایینزاكانی دیكەش، وەک: كاسۆلیكە میانڕەوەكان، ئۆرتۆدۆكسەكان، مێتودیستەكان*ی كڵێسەی كاسۆلیكیی ئینگلتەرا و لۆتەرییەكانیش، بیروڕای جیاوازیان لەبارەی هەڵبژاردنی مردن لە لایەن مرۆڤەوە هەیە. (سەركەوت، ١٣٩٣، ٧٦)

---

* Ioannes Paulus PP. II
* Methodist

## ئایینی بوودایی:

لە ڕوانگەی بوودایییەکانەوە مردن ڕاستیی خۆڕانەگری جەستە و زەین و ڕۆحمان پیشان دەدات. هەر بۆیە پێیان وایە مردنێکی ناچاری وا لە مرۆڤ دەکات، لە ڕاستیی ئەم مەسەلەیە تێنەگات و بەم هۆیەشەوە دژی هەڵبژاردنی مردن لە لایەن مرۆڤەوەیە. بوودایییەکان پێیان وایە مرۆڤ ناتوانێت ئازاری مرۆڤەکانی تر لا ببات، ئەگەر ئەم کارەش بکات، ئەوا ئازارەکان لە قۆناغەکانی دواتری ژیانی ئەو کەسەدا بەرجەستە دەبن. یەکێک لە بنەما مۆڕاڵییەکانی بوودایییەکان ناتوندوتیژییە*. ئەو کارانەی دەبنە هۆی وێرانکردنی ژیان بە پێی یاسای ناتوندوتیژی، ئیدانە دەکرێن. ناتوندوتیژی وەک یاسایەکی گشتگیر بە ئایینی بوداییدا دژی هەر جۆرە خۆکوشتن و خەڵککوشتنێکە، چونکە دەبێتە هۆی وێرانکردنی ژیانی ئادەمیزاد و ئەو کەسانەی ئەم کارانە دەکەن، سزا دەدرێن، چونکە یاسای ناتوندوتیژییان پێشێل کردووە.

## ئایینی ئیسلام:

ئایینی ئیسلام، خۆکوشتن و هەر جۆرە مرۆڤکوشتنێکی قەدەغە کردووە. لە قورئاندا چەندان ئایەت ئاماژە بە قەدەغەکردنی کوشتن دەکەن. بۆ نموونە لە ئایەتی ١٥١ی سوورەی ئەنعامدا خودا دەفەرموێت: [وَلاَ تَقْتُلُواْ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ

---

* Ahimsa or Nonviolence

اللَّهُ إِلاَّ بِالْحَقِّ.] (کەسیش مەکووژن کە خودا کوشتنی حەرام کردووە، مەگین لە ڕووی هەقەوە بێ.)(*) هەروەها لە ئایەتی ٣٢ی سوورەی مائیدەدا هاتووە: [...مَن قَتَلَ نَفْسًا بِغَيْرِ نَفْسٍ أَوْ فَسَادٍ فِي الأَرْضِ فَكَأَنَّمَا قَتَلَ النَّاسَ جَمِيعًا وَمَنْ أَحْيَاهَا فَكَأَنَّمَا أَحْيَا النَّاسَ جَمِيعًا.] (هەر کەسێ بێتاوانێکی بکووژێ، کە نە گوناهی کردبێ و نە خراپەی لە زەویندا لێ ڕوو دابێ، وەک ئەمەیە کە گش خەڵکی سەرزەویی لە ناو بردبێ و هەر کەسێکیش بێتاوانێک ڕزگار بکا، وەک ئەمەیە کە هەموو خەڵکی سەر زەویی لە مردن ڕزگار کردووە.)(*)

لە کۆی ئەم ئایەتانەدا بۆمان دەر دەکەوێت، کە خودا تەنیا لە کاتێکدا ڕێگەی بە کوشتن داوە، کە حەقێک لە ئارادا بێت، ئەو حەقەش تەنیا لەو کاتەدایە کە کوشتن وەکوو سزایەک بۆ تاوانبارێک لە قەڵەم بدرێت، بۆیە لە هیچ کاتێکی تردا نابێت ڕێگە بە کوشتن بدرێت. جگە لەمانە، ئیسلام خۆکوشتنی قەدەغە کردووە: [وَلَا تَقْتُلُوا أَنْفُسَكُمْ إِنَّ اللَّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا.] (بە هەق نەبێ، نابێ یەکتریش بکووژن. خودا دەربارەی هەمووتان دلۆڤانە.)(**)

بە پێی ئەم ئایەتانەی ئاماژەمان پێ دان، کوشتن و خۆکوشتن لە ئیسلامدا بە توندی قەدەغە کراون، چونکە مرۆڤەکان خاوەنی گیانی خۆیان نین و ژیان خەڵاتێکی خوداییە، کە بە مرۆڤەکانی

---

( *) وەرگێڕانی هەژار

(*) قورئان، سوورەی مائیدە، ئایەتی ٣٢، وەرگێڕانی هەژار

(**) هەمان سەرچاوە، سوورەی نیساء، ئایەتی ٢٩

بەخشیوە. کە واتە ئیسلام هەڵبژاردنی مردن لە لایەن مرۆڤەوە بە هەموو جۆرەکانیەوە ڕەت دەکاتەوە و وەک کوشتنی کەسێک سەیری دەکات.

لە سەدەی بیستەمدا خێراییی گەشەکردن و زانیارییەکانی مرۆڤ لە بوارە جۆربەجۆرەکانی زانینەکان و چالاکییە زانستییەکاندا زۆر زیادیان کردووە. گۆڕانکاری و پەرەسەندنی خێرای تەکنەلۆژیا لەگەڵ فراوانبوونی سیستەمەکانی میدیا و گەیاندنی زانیارییەکان، هۆکارە کاریگەرەکانی گورپێدانی فراوانکردنی زانیارییەکان و دەستڕاگەیەشتنن بە بابەتە نوێیەکان. ئەم گۆڕانکارییانەش دەرفەتی جیابوونەوەی بەشەکان و دەرکەوتنی پسپۆڕییە جۆربەجۆرەکانیان فەراهەم هێناوە. بێ گومان ئێستا هیچ کەسێک ناتوانێت لە بەشە جۆربەجۆرەکانی تاکە بەشێکی دیاریکراویشدا لافی پسپۆڕیەتی لێ بدات، تەنانەت بوارەکانی لێکۆڵینەوە لە پسپۆڕییەکی دیاریکراو بۆ چەند پسپۆڕییەکی وردتر دابەش بوون. ئەم دابەشبوونانەش بۆ شارەزابوون لە بنجوبناوانی هەر زانستێک شتێکی پێویستە و هەر ئەمەش بووەتە هۆی ئەوەی ژمارەیەکی زۆری بەشەکان فراوانبوون بە خۆوە ببینن. لەم نێوەندەدا، لێکۆلینەوەی بەشە نێوەنجییەکان (ئەو بەشانەی لەگەڵ چەند بەشێکی دیکەدا هاوبەشییان تێدایە.) پێویستی بە مامەڵەکردن و تێکۆشانەکانی بەشەکانی دیکەیە؛ بە تایبەتی پێوەندیی نێوان بەشەکانی زانستە زیندەییەکان و زانستە مرۆییەکان، کە پێویستیان بە هەوڵ و کۆششی پسپۆڕییە جۆربەجۆرەکانە بۆ ئەوەی بابەتە نوێیەکان

دەستنیشان بکرێن و ڕێگەچارەی گونجاویان بۆ پێشنیار بکرێت. لەم سۆنگەیەوە، لەباربردنی تۆل، یەکێکە لەو بابەتانەی کە لە لایەکەوە پێویستی بە هاوکاریی پسپۆڕییە جۆربەجۆرە کۆرپەلەیی و پزیشکییەکانە و لە لایەکی تریشەوە پێویستی بە ڕاوبۆچوونی پیاوانی ئایینی، مۆراڵی، کۆمەڵناسی، دەروونناسی و مافناسەکانە، تاوەکوو لە بەر ڕۆشنایی هاوکارییەکی هەمەلایەنەدا لە گۆشەنیگای جیاوازەوە لێکۆڵینەوە و توێژینەوەی مەسەلەکە بکرێت. بێ گومان بابەتێکی لەم شێوەیە نابێت تەنیا لە بەر سێبەری چەند بەشێکی تایبەتدا قەتیس بکرێت و قسەی کۆتاییش هەر لە لای ئەو بەشانە بێت. هەموو ساڵێک ژین و تەندروستیی ملیۆنان کەس لە سەرانسەری جیهاندا بە هۆی کۆتاییهێنان بە (دووگیانییە خۆنەویستەکان)ەوە لەژێر هەڕەشەدایە.

زۆربوونی بەرچاوی لەباربردنەکان لە ڕێگەی نەشتەرگەری و بە شێوازی ناتەندرووست لە هەموو جیهاندا، بە تایبەت لە جیهانی سێهەمدا، بوونەتە هۆکاری گیروگرفتی هەمەجۆر، کە دەتوانین بەم شێوەیە ئاماژە بە هەندێکیان بدەین: ئەم لەباربردنانە بوونەتە هۆکاری مردنی دایکان لە قۆناغەکانی دووگیانیدا. جگە لەمە، سەدان هەزار ئافرەت بە هۆی ئەم لەباربردنانەوە گرفتی جەستەیی و سێکسییان بۆ درووست بووە. ئازار و پاشهاتەکانی نەشتەرگەرییەکان و شێوازەکانی دیکەی لەباربردنیان چەشتووە. بە پێی ڕاپۆرتەکانیش بەشێکی زۆری بەرزترین ڕێژەی (لەباربردنە ناتەندرووستەکان) لە

کۆمەڵگەکانی جیهانی سێهەمدا تۆمار کراون، بە تایبەتی لەو وڵاتانەی یاسا و ڕێسای توندیان لەبارەی مەسەلەی لەباربردنەوە داناوە. بەم شێوەیە بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە پێویستمان بە لێکۆڵینەوەی هەمەلایەنەی مەسەلەی (لەباربردن) لە کۆمەڵگەکاندا هەیە، لە نێویشیاندا ئێران. ئەو ژنەی لە ماوەی دووگیانیدایە، چەند کارێک بۆ کۆرپەلەکەی دەکات، لەوانەش: پارێزگاریکردنی، هەوڵدان بۆ پڕکردنەوەی پێداویستییە خۆراکییەکانی، دابینکردنی خوێن، پێدانی ئۆکسجین، بەرهەمهێنانی هۆرمۆنەکانی گەشەکردنی ئاوڵەمە و پاشان کۆرپەلە، کە بەبێ هیچ یەکێک لەمانە (کۆرپەلە) ناتوانێت درێژە بە ژیان بدات. کاتێک کۆرپەلە بەم شێوەیە لە سیستەمی جەستەیی دایکدا جێگەی خۆی دەکاتەوە و گرنگی پەیدا دەکات، کە واتە لەباردنی دەبێتە هۆی دروستبوونی کێشەی تەندروستی بۆ دایک. (سەرکەوت، ١٣٩٣، ١٠٤) هەرچەندە هیچ جۆرە ڕاپۆرتێکی ورد و دروست لەبارەی لەباربردنە ناتەندروستەکانەوە و ڕێژەی مردنەکانەوە بە هۆی لەباربردنەوە لە بەردەستدا نییە، بەڵام هەندێک بەڵگە و ئاماری نافەرمی، باس لە ڕێژەی زۆر بەرزی لەباربردنە ناتەندروستەکان و مردنی دایکان و نەخۆشییەکانی پێوەست بە لەباربردنی ناتەندروستەکانەوە دەکەن. چەندان بابەت و گرفتی هەمەجۆر وایان کردووە لێکۆڵینەوەی مەسەلەی لەباربردنی کۆرپەلە و لەباربردنە ناتەندروست و

ناقانوونییەکان پێویستییەکی لە پێشینە بن کە دەتوانین ئاماژە بەم خاڵانە بدەین:

١- بوونی ڕێژەی زۆری تەمەنی لاوان؛

٢- ئارەزووی ژنانی لاو بۆ بنیاتنانی خێزان لە قەبارەی بچووکدا؛

٣- دواکەوتنی ئاستی پێکهێنانی خێزان بە هۆی گرفتەکانی نەبوونی کار و پێویستییە فیزیۆلۆژییەکانەوە؛

٤- هەنگاونانی کۆمەڵگەی نەریتی بەرەو کۆمەڵگەیەکی مۆدێرنیتە؛

٥- خێرابوونی گەشە و گۆڕانکارییە جەستەییەکان؛

٦- بەرزبووونەوەی ئاستی سەربەخۆیی ئابووری و پێکهێنانی خێزان؛

٧- نەبوونی ڕێژەیەکی بەرچاوی حاڵەتەکانی جیابوونەوەی باوان؛

٨- کاریگەریی میدیا جیهانییەکان و تۆڕەکانی ئینتەرنێت؛

٩- مەسەلەی حەزی سێکسی، کە هاوشێوەی حەزەکانی دیکەی مرۆڤ ناوەستێنرێت؛

١٠- زیادبوونی چالاکییە سێکسییەکان لە دەرەوەی خێزان بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ، کە ئەمەش دەبێتە هۆی زۆربوونی دووگیانییە خۆنەویستەکان؛

١١- زۆربوونی ڕاپۆرتە دۆکیۆمێنتارییەکان لەبارەی زۆربوونی ڕەفتارە پرمەترسییە سێکسییەکانەوە لە نێوان گەنجاندا؛

١٢- بوونی پێوەندیی سێکسی، پێش پرۆسەی هاوسەرگیری.

هەمیشە لەباربردنی کۆرپەلە بە کاریگەریی چەند هۆکارێکی وەکوو: شەرع، نەریت، قانوون و مۆراڵ بووە و هەروەها هۆکارە دەروونی، کۆمەڵایەتی و ژینگەییەکانیش کاریگەرییان هەیە. لەباربردن نەک تەنیا گرفتی تەندروستی لە دوای خۆیەوە بە جێ دەهێڵێت و بە هۆی خەرجیی زۆرەوە ئەرکێکی قورس دەخاتە سەر شانی کۆمەڵگە، بەڵکوو وەکوو گرفتێکی کۆمەڵایەتییش لە گشت کۆمەڵگەکاندا سەیر دەکرێت، بە شێوەیەک کە تەندرووستیی خێزان و کۆمەڵگە دەخاتە مەترسییەوە.

زۆربوونی ژمارەی منداڵ، مەسەلەی ڕەگەزی نێرومێ، جیاوازیی نێوان خێزانەکان، دووگیانبوونی بەردەوام و خۆنەویستانە، پێوەندییە سێکسییە ڕێگەپێنەدراوەکان، نەبوونی ڕۆشنبیریی سێکسی و بێئاگایی لە شێوازەکانی ڕێگریکردن لە دووگیانبوون، هەروەها ئەو هۆکارانەی لە پێشەوە باس کران، بەستێنێکی لەباریان بۆ لەباربردنە ناتەندرووستەکان فەراهەم کردووە، کە هەندێ جاریش (لەباربردن) وەکوو ڕێگەیەک بۆ کۆنترۆڵکردنی دووگیانی و ڕێکخستنی ژمارەی ئەندامانی خێزان بە کار هاتووە. کۆنفرانسی نێودەوڵەتیی دانیشتوان و گەشەسەندن (ICPD)* لە قاهیرە لە ساڵی ١٩٩٤دا لەباربردنە ناتەندرووستەکانی وەکوو یەکێک لە گرفتەکانی تەندرووستیی

* International Conference on Population and Development

گشتی لە قەڵەم دا و بەکارهێنانی (لەباربردن)ی وەکوو ڕێگەیەک بۆ ڕێکخستنی خێزان ڕەت کردەوە، هەروەها پێشنیاری ئەوەی کرد (بەرگرتن بە دووگیانبوونە خۆنەویستەکان) دەبێت لەپێش مەسەلەی (لەباربردن)ـەوە بێت و بە پێدانی ڕێنمایی و بەرزکردنەوەی ئاستی ڕۆشنبیری و لەباربردنە نەشتەرگەرییەکان لە ناو ببرێن.

هەرچەندە دانانی سنوورەکان دەتوانێت ڕۆڵێکی گرنگ لە بڕیاردانی تاکەکان لەبارەی (لەباربردن)ـەوە بگێڕن، بەڵام لە کاتە ناچارییەکاندا زۆر جار بڕیارەکان لە دەست تاکەکان دەر دەچن؛ بە شێوەیەک کە تاک سەرەڕای هەموو ڕێگرییەکان بە هەر شێوەیەک بێت، هەوڵی لەباربردن دەدات. هەرچەندە لەباربردن پاشهاتی جەستەیی و تەنانەت هەندێ جاریش مردنی بە شوێندا دێت، هەندێ جاریش کارگەری دەرمانەکانی پێوەست بە لەباربردنەوە سەلامەتیی ژن دەخەنە مەترسییەوە، بەڵام لەوانەیە کاریگەرییەکانی پاش کرداری (لەباربردن) کاریگەریی بنچینەییی زیاتر لە سەر ژیانی ئافرەتان بە جێ بهێڵن. لە باسوخواسی مەسەلەی لەباربردندا دەبێت چەند مەسەلەیەکی دیکە ڕەچاو بکرێن، لەوانەش: پاشهاتە دەروونییەکانی بەخێوکردنی منداڵی خۆنەویست، منداڵی ناتەواو و ئەو منداڵانەی لە ئەنجامی دەستدرێژیی سێکسییەوە دەکەونەوە. تەنانەت ئەگەر بێت و دووگیانبوونەکەش لە ڕێگەی مەشرووعەوە بووبێت و ژنەکەش بە ڕەزای خۆی ملی بۆ لەباربردنەکە دابێت، هێشتا غەم و پەژارەی کردنی ئەم کارەی وای لێ دەکات بێتاقەت و

گۆشەگیر بێت و تووشی ئازاری ویژدان بێت. بەڵام ئەو ژنەی کە بە شێوەی دەستدرێژیی سێکسی دووگیان بووە، بە دڵنیاییەوە لە بارودۆخێکی دژوارتردا دەبێت. ئەم بارودۆخانەش وا لە باوان دەکەن گوێ بە منداڵەکانیان نەدەن و لە خۆیانی دوور بخەنەوە، یان پەروەردەی درووستی نەکەن و بۆ بەخێوکردنی منداڵێکی ناتەواو خەرجییەکی زۆر بدەن، کە هەموو ئەمانەش دواجار هەم زیان بە سەلامەتیی خێزان دەگەیەنێت و هەم لە سەلامەتیی کۆمەڵگەش. پێویستە لە ڕوانگەی کۆمەڵایەتییشەوە سەیری ئەم مەسەلەیە بکەین؛ ئایا دەتوانین چەمکی مرۆڤ بۆ کۆرپەلەیەک بە کار بهێنین، کە هێشتا ڕۆحی بە بەردا نەکراوە، تا مەحرووومکردنی لە ژیان بە هەڵە لە قەڵەم بدەین؟ بەڵام ئەگەر پێ بخەینە ئەم مەیدانەوە و بێ مرونەتیی ئەم بابەتەمان بۆ دەر کەوێت، ئیتر ناتوانین هیچ کام لە گەواهییەکانی مەسەلەی (لەباربردن)، تەنانەت (پاراستنی گیانی دایک)یش، کە جگە لە چوار وڵاتی ڤاتیکان، چیلی، ئێلسالڤادۆر و دوورگەی ماڵتە، هەموو وڵاتانی دیکە واژوویان لەسەر کردووە، قبووڵ بکەین، یان لە ڕێگەکانی تری پێشگرتن لە درووستبوونی کۆرپەلەوە وەکوو (IUD) سوود وەربگرین، یان پشت بە ئازادیی بیروڕا و ئازادیی ئیرادەی مرۆڤەکان بە گشتی و دایک بە تایبەتی ببەستین.

بەم هۆیەوە، تێڕوانینی مۆڕاڵی و فەلسەفەی مۆڕاڵی (لەباربردن) پێویستە لێکۆڵینەوەی لەبارەوە بکرێت. زۆر جار وا باس دەکرێت کە وتوویژ لەبارەی پلەوپایەی مۆڕاڵیی

(لەباربردن)ەوە بە جۆرێک لە جۆرەکان بێهیواکەرە. ئەو کەیسانەی کە لێکۆڵینەوەیان لەبارەوە کراوە و ئەو بەڵگانەی بۆ پاساوی لەباربردن هێنراونەتەوە، لەوانەیە وردبینی و وردەکاریی زۆریان تێدا نەبێت، کە ئەمەش مانای بێسەروبەرەیی لە لێکۆڵینەوەکانی تایبەت بەم مەسەلەیەدا ناگەیەنێت، بەڵکوو پەرچەکردارێکی تایبەتتر لەبارەی مەسەلەکەوە پێشان دەدات. (هەمان، ١٠٦) لەم بەشەدا هەوڵ دەدەین لێکۆڵینەوەی مەسەلەی (لەباربردن) لە بواری فەلسەفەی مۆڕاڵدا شرۆڤە بکەین.

## تێگەناسیی لەباربردنی کۆرپەلە

لە مەسەلەی (لەباربردن) لە ڕوانگەی کۆرپەلەناسی و بەرەوپێشچوونی هەلومەرجی مۆڕاڵییانەی لەباربردنی تۆل (و کۆرپەلە)وە پێویستە تەنیا شەنوکەوی بابەتە ئاشناکانی میتافیزیک و مۆڕاڵی ڕابوردوو نەکەین، بەڵکوو لە گشت ماوە جیاوازەکانی دووگیانی بکۆڵینەوە، کە هەر یەکێک لەو ماوانەش تایبەتمەندیی خۆیانیان هەیە.

لە کۆرپەلەناسیدا، (لەباربردن) بە مانای کۆتاییهێنانە بە ماوەی دووگیانی، پێش ئەوەی (کۆرپەلە) بگاتە ئاستێک، بتوانێت لە دەرەوەی منداڵدان بژی. (گودرزی، ١٣٧٠، ٥٩٣) پێناسەی کۆرپەلەیشکیانەی (لەباربردن) بریتییە لە: "دەرکردنی هەموو بەرهەمێکی دووگیانی پێش هەفتەی بیستەمی دووگیانی و کەمتر

له کێشی پەنجا گرام.* (اکرمی و همکاران، ١٣٨٩، ٢٧) زۆربەی لەباربردنەکان لە سێ مانگی یەکەمی دووگیانیدا (تا ١٢ هەفتە) بە ڕێوە چوون. بەڵام هەندێک لەوانەش لە سێ مانگی دووەمدا (لە نێوان ١٢-٢٤ هەفتەدا) و زۆر بە کەمییش لە سێ مانگی سێهەمدا (٢٤-٣٦ هەفتە) بە ئەنجام گەیەنراون. ئەوەی جێگای خۆشحاڵییە، ئەوەیە کە زانستی کۆرپەلەناسی بە شێوەیەک بەرەو پێشچوونی بە خۆوە بینیوە، کە بارودۆخی ئەندامەکان (فیزیۆلوژیک) و کەموکووڕییە بۆماوەییەکانی کۆرپەلە لە ماوەکانی دووگیانیدا دیاری دەکات. لە لای ڕێکخراوی کۆرپەلەیشکی دادوەرییش لەباربردن بریتییە لە: کۆتاییهێنان بە دووگیانی، پێش ئەوەی کۆرپەلە بتوانێت لە دەرەوەی منداڵدانی دایک بژی، کە زۆر جار ئەم ماوەیە تا هەفتەی بیستەم دەخایەنێت، ئەوجا کۆرپەلە ئەم توانە پەیدا دەکات. لەو کتێبانەدا کە لەبارەی کۆرپەلەوە نووسراون، ئاماژە بەوە دەکەن کۆتاییی ماوەی دووگیانی تا هەفتەی ٢٤ی دووگیانی (واتا شەشمانگی) بە لەباربردن لە قەڵەم دراوە و پاش ئەوەش بە (لەدایکبوونی پێشوەختە) ناو دەبرێت. (قضایی، ١٣٧٣، ٢١)

## پێشینەی مێژوویی فەلسەفەی

## (لەباربردنی کۆرپەلە)

لە کۆمەڵگە کۆنەکاندا، کرداری لەبابردن زیاتر لە ڕێگەی بەکارهێنانی گیا و ڕووەکی ژەهراوی، ئامرازی نووکتیژ یان زۆر پەستانخستنە سەر سکی ئافرەتەوە کراوە، بۆ ئەوەی تووشی خوێنبەربوون ببێت. تەکنیکەکانی لەباربردن لە پەرتووکە کۆنە کۆرپەلەیشکییەکاندا زۆر بە باشی ناسراون، چینییەکان و میسرییە کۆنەکان لە ڕێگەی بەکارهێنانی شێواز و ڕێکاری تایبەت بە خۆیانەوە کرداری لەباربردنیان بە ئەنجام گەیاندووە. یۆنانییەکان و ڕۆمییەکانیش لەباربردنیان وەکوو ڕێگەیەک بۆ کۆنترۆڵکردنی ژمارەی دانیشتوان و پاراستنی سەلامەتیی کۆمەڵگە بەکار هێناوە. بۆ نموونە؛ لە شارەکانی پۆمپای* لە نزیک ئیتاڵیا و لە شاری هێرکولانیۆم*. ئامێرە کۆنەکانی لەم کۆمەڵگەیانەدا بە کار هێنراون، زۆر هاوشێوەی ئامێرە نەشتەرگەرییە نوێیەکانن. ڕۆماییەکان و میسرییەکانیش لە ڕێگەی دانانی پلیتەیەکی ژەهراوی لە ناو ئەندامی زاوزێی مێینە و بە هۆی هەڵمژینی ئەم ژەهرانەوە، سووری خوێنی زیاد

---

* Pompeii

* Herculaneum

کردووه و بەم شێوەیە کرداری لەباربردن جێبەجێ کراوە. فەیلەسووفە گەورەکانی وەک سۆکرات، پلاتۆن و ئەرەستۆ زۆر بە باشی ئاگاداری کاریگەرییە جۆربەجۆرەکانی لەباربردنە نۆژدارییەکان بوون و درکیان بە کاریگەریی زیانە جەستەیی و ڕۆحییەکانی لەباربردن لەسەر دایکان کردووە. هەروەها هیپۆکراتیس، حەکیمی یۆنانی، بۆ لەباربردن پێشنیاری هەندێک ڕاهێنانی قورسی کردووە، بۆیە بە یەکێک لەو کەسانە دەناسرێت کە دژی بەکارهێنانی پەستانی زۆر و لێدانی توندی سکی ئافرەتان بووە، کە زیانی گەورە بە سەلامەتییان دەگەیەنێت. لە سەردەمی ئێستاشدا، لەباربردنی کۆرپەلە لە هەموو جیهاندا بەبێ گوێدانە گرفتە یاساییەکانیش جێبەجێ دەکرێت. ڕێگەکانی لەباربردنی ناتەندرووست و نایاسایی زۆر هاوشێوەی یەکترن و لە کولتوورە جیاوازەکانیشدا تا ڕادەیەکی زۆر لێک جیاوازن. (سەرکەوت، ١٣٩٣، ١٠٩) ژنانی ئەفریکایی بە بردنەژوورەوەی لقی درەختەکان و ڕیشکی گیاکان بۆ ناو ملی منداڵدان، کە مامانەکان و دەرمانگەرە نەریتییەکان، ئۆمێدیان وایە منداڵدان، گرژبوونەوە بە خۆوە ببینێت و سکەکەیان دابنێن. ژنانی زیمبابۆیش، کە خوێنی خۆیان کردووەتە کاسەوە، لە ڕێگەی خواردنی گیراوەکانی تایبەت بە شۆردن یان خواردنەوەی بەنزین و بەکارهێنانی زیادەڕۆییانەی حەبەکانی ئەسپرین و کلرۆکین، ماسوولکەکانی منداڵدانیان گرژ کردووە و بەم شێوەیە پرۆسەی لەباربردنیان بە ئەنجام گەیاندووە. لە ناوچە گوندنشینەکانی ئەندەنۆزیا و تایلەندیشدا، پەستانی زۆر دەخرێتە

سەر ناوچەی منداڵدان؛ لە کاتێکدا لە ناوچەکانی ئەمەریکای لاتیندا بە بەکارهێنانی لوولە، خەنجەر، شمشێر، قولاپی ڕستن و چنین، ماددەی سووتێنەر، چا و دەرمانە گیاییەکان لە ڕێگە باوەکانی لەباربردن بوون. لە ئێرانیشدا، هەندێک ڕێگەی باو بۆ لەباربردن هەبوون، وەکوو بەکارهێنانی دەرمانەکان و ژەهرەکان، لێدانی توندی جەستەیی و شۆردنی ئەندامی زاوزێ لە ڕێگەی ماددەی کیمیاییەوە. هەروەها بەکارهێنانی ماددەیەکی وەک (سۆدیۆم) بۆ ناو ملی منداڵدان، بووەتە هۆی سووتانەوە و خوێنبەربوونی زۆری ناوچەکانی ملی منداڵدان، کە لەم حاڵەتەشەدا زۆر بە کەمی کاریگەریی بەسەر لەباربردنی کۆرپەلەوە هەبووە، بەڵکوو هەندێ جار ئەم ماددەیە چووەتە ناو خوێنی دایکەوە و دواجار بووەتە هۆکاری مردنی دایکەکە. هەروەها بەکارهێنانی چەند دەرمانێکی تری وەکوو ئاسی تۆسین و گیراوە پڕۆستاگلاندینەکان دەبنە هۆی کرژبوونی ماسوولکەکانی منداڵدان و ئەمەش دەبێتە هۆی لەبارچوونی کۆرپەلە. هەروەها نموونەی وەهاش ڕووی داوە، کە پاش دەستدرێژکردنە سەر ئافرەتێک و درووستبوونی کۆرپەلە لە سکیدا، کەسوکاری ئافرەتەکە بە چەقۆ سکیان بڕیوە و پاشان لە ناو منداڵداندا کۆرپەلەکەیان دەر هێناوە و بە دەزووی قاڵیدوورین سکی ئافرەتەکەیان دووریوەتەوە.

بە شێوەیەکی گشتی، ڕێگەکانی (لەباربردن) لە کۆمەڵگە و کولتووورە جیاوازەکاندا، چ لە ڕابوردوو و چ لە ئێستادا، پێوەندییان بە سنووورە کولتووری و ئایینییەکان و نەریتە

کۆمەڵایەتییەکانەوە هەیە. هەتاوەکوو سنوورەکانیش زیاتر بن، ئەو ڕێگایانەش بۆ لەباربردن دەگیرێنە بەر، ناتەندرووست و نهێنیتر دەبن، کە ئەمەش بە هۆی کەسەکە خۆیەوە یان بە هۆی کەسانی نەشارەزاوە دەکرێت. هەرچەندە بە هۆی پێشکەوتنی تەکنەلۆژیاوە ڕێگەکانی لەباربردنیش گۆڕانکارییان بەسەردا هاتووە.

## جۆرەکانی لەباربردن:

چەند پۆلێنبەندییەک لە ڕوانگەی جیاوازەوە بۆ مەسەلەی لەبابردن کراون، کە لێرەدا ئاماژەیان پێ دەکەین:

أ) پۆلێنبەندیی مەسەلەی لەباربردن لە ڕوانگەی قانوونەوە، کە لەسەر پێویستی تۆڵەسەندنەوە (قصاص) یان خوێنبژاردن (دیە) و تەمبێکردن (تعزیر) جەخت دەکاتەوە؛

ب) پۆلێنبەندی لە ڕوانگەیەکی مەعنەوییەوە، کە بۆ سێ بەش دابەش دەبێت: لەباربردنی ئەنقەست، لەباربردنی نائەنقەست، هەڵەی پوخت؛

ج) پۆلێنبەندی لە ڕوانگەی ڕێکخراوە یاساییەکانەوە، کە بۆ لەباربردنی سرووشتی (ئاسایی و ڕێککەوت،) لەباربردنی کۆرپەلە و تاوانکاری پۆلێن دەکرێن. (عباسی، ١٣٨٣، ٧٠) ئەم جۆرە لە پۆلێنبەندی، بە یەکێک لە شێوە باوەکانی پۆلێنبەندی هەژمار دەکرێت، کە هەوڵ دەدەین لێرەدا بە کورتی ڕوونی بکەینەوە.

## لەباربردنی سرووشتی

لەبارچوونی سرووشتی، یان خۆنەویستانە، زیاتر بە هۆی هۆکارە بۆماوەییەکان (وەکوو پەستانی خوێن،) هۆکارە ژینگەییەکان، هۆکارە سۆزدارییەکان (وەکوو خۆشی و ناخۆشی) و هەندێک هۆکاری دیکەی نەزانراوەوە ڕوو دەدەن، لەو سۆنگەیەشەوە کە ئافرەت هیچ ویستێکی بۆ کردنی ئەم کارە نەبێت، ڕووبەڕووی هیچ جۆرە بەرپرسیاریەتی و سزادانێک نابێتەوە. لەبەر ئەوەی لەم جۆرە لەبارچوونەشدا هیچ جۆرە ئامێرێک و دەرمانێک بۆ خاڵیکردنەوەی منداڵدان بە کار نایەت، بە لەبارچوونی خۆبەخۆیی ناو دەبرێت.

## لەباربردنی تاوانکاری

لەوانەیە لەباربردنی تاوانکاری، یان دەرهێنانی کۆرپەلە پێش وادەی سرووشتیی خۆی، لە لایەن دایکەوە و لە ڕێگەی دەستکاریکردنی منداڵدان، خواردنی دەرمان و لێدانی توندی ئەنقەستەوە بۆ سەر سک بکرێت، یان لە لایەن کەسانی دیکەوە بە ئەنجام بگەیەنرێت، کە بۆ ئەم کارەش هانی دایک درابێت و قایل بووبێت بەوەی لێدانی توندی لێ بدرێت یان قبووڵی هەر جۆرە مەترسییەکی کردبێت، بەبێ گوێدانی قایمکاری و

شارەزانەبوون و گوێنەدان بە مەرجە تەندرووستییەکان. (هەمان سەرچاوە، ٧١)

## لەباربردنی دەرمانی

ئەو حاڵەتانەی کە پێویست بە لەباربردن دەکەن بە (لەباربردنی دەرمانی) دەناسرێن. ئەم جۆرە لەباربردنە بە مانای کۆتاییهێنانی ماوەی دووگیانی دێت، پێش ئەوەی کۆرپەلە بتوانێت لە دەرەوەی منداڵدان بژی، ئامانج لەمەش، پاراستنی تەندرووستیی دایکە، یان ناتەندرووستیی کۆرپەلە و نەخۆشییەکانیەتی (اکرمی و همکاران، ١٣٨٣، ٢٧) جگە لە پاراستنی تەندرووستیی دایک هۆکارێکی دیکەش ڕێگە بە ئەنجامدانی لەباربردنی دەرمانی دەدات، ئەوەیش مەسەلەی ناتەواویی کۆرپەلەیە پاش لەدایکبوون و درووستکردنی سەختی و دژواری بۆ باوان یان خۆی ببێت. هەڵبەت دەبێت سەرنجی ئەوە بدەین، کە مەبەست لە پاراستنی گیان و ژیانی دایک ئەوە نییە کە بە هۆی ئەم کارەوە گیانی دایک بپارێزین، بەڵکوو لێرەدا هاندەری کارەکە گرنگە، هەروەها دەبێت ئەم کارەش بە تەواوی لە ئامانجی پاراستنی گیانی دایکدا بێت. "لە چەند سیستەمێکی قانوونییشدا، ئەگەر بێت و دووگیانی بە هۆی دەستدرێژی یان زیناوە بووبێت، بۆ پاراستنی ئاوڕووی ژنەکە، ڕێگە بە لەباربردنی کۆرپەلە دراوە." (رزم ساز، ١٣٧٩، ٨٥) بە پێی ئەو بابەتەی پێشوو پرسیارێکی زۆر سەرەکیی لە پێشدایە، کە زۆر

جار بە شێوەیەکی جیددی عەودالی وەلامەکەی دەبین، بەلام زۆربەی گێرەوکێشە توندەکانی ئێمە لەگەل بنەما مۆراڵییەکانی لەباربردنی کۆرپەلەدا بۆ چەند پرسیارێکی تر لەبارەی پلە و پایەی پاکداوێنی، ڕێز و هەستکردن بە بەرپرسیاریەتییەوەیە. (سەرکەوت، ١٣٩٣، ١١١) لە لایەکەوە پێمان دەڵێت (لەباربردن کارێکی ڕێگەپێدراو و ئابڕوومەندایە، لە لایەکی تریشەوە کارێکی ڕێگەپێنەدراو و ئابڕووبەرانەیە.

## گۆڕانکارییە یاساییەکانی لەباربردنی کۆرپەلە

گۆڕانکارییە مێژوویی، کولتووری و یاساییەکانی لەباربردن لە کۆمەڵگە جۆربەجۆرەکاندا ڕووبەڕووی هەوراز و نشێویی زۆر بووەتەوە؛ لە بەشێکی زۆری کۆمەڵگەکاندا پاش چەندان سەدە لە ڕەتکردنەوەی (بە یاساییبوونی لەباربردنی کۆرپەلە) و لە هەمان کاتیشدا ئاگاداربوون لە بێکەڵکبوونی سزا دیاریکراوەکان، لە کۆتاییدا بەرەو یاساییکردنی (لەباربردنی کۆرپەلە) هەنگاویان ناوە. هەندێکی دیکەش بە هەمان شێوەی پێشوو لەسەر قەدەغەبوونی ڕێوشوێنەکانی لەباربردن مکوڕ بوون. لە سیستەمی یاسایی فەڕەنسادا، لە سەرەتادا (لەباربردنی کۆرپەلە) وەک تاوان لە قەڵەم دراوە و سزای بیست ساڵ زیندانیی بۆ دانراوە. ڕووبەڕووبوونەوەی ئەم دیاردە کۆمەلایەتییەش لەسەر بنەمای سیاسەتە تاوانکارییە

سەرکوتکارانەکان بووە، کە لەژێر کاریگەریی توندی ئایینی و هەلومەرج و پێویستییە کۆمەڵایەتییەکاندا بووە. بە تێپەڕبوونی کات، پاش زانینی کاریگەرییە لاوازەکانی سزاکانی لەباربردنی کۆرپەلە و فراوانکردنی بازنەی تاوانکارییەکانی پێوەست بەم کارەوە، بەرەو چاوخشاندنەوە بە سیاسەتەکانی تاوانکاریی ئەم دیاردەیەدا هەنگاویان نا و چەند چاکسازییەکیان لە یاساکانی تایبەت بە لەباربردن کرد و تێڕوانینی نوێیان لەبارەی ڕەوابوونی چەند لایەنێکی (لەباربردن)ەوە گرتە بەر. خاڵەکانی سزادانی ڕووبەڕووبوونەوەی ئەم دیاردەیەیان کاڵتر کردەوە و بەرەو بەیاساییکردنی مەسەلەی (لەباربردن) هەنگاویان نا. (شاملو، ١٣٨١، ١٤٢) لە یاسا گشتییەکانی وڵاتی دیکەدا بە تایبەتی ئینگلتەرا لەباربردنی کۆرپەلە -پێش ئەوەی ڕۆحی بە بەردا بکرێت و توانی ژیانی هەبێت- تەنانەت وەکوو لادانی مۆڕاڵییش سەیر نەکراوە و سزایەکی ئەوتۆشی بۆ دیاری نەکراوە و سزاکانیش زۆر کەم بوون. ئەگەر بگەیشتایەتە قۆناغی کۆرپەلە -واتا پاش ئەوەی ڕۆحی بە بەردا کرابێت- وەکوو لادانێکی مۆڕاڵی و سەرپێچیکردنی یاسا سەیر کراوە، هەتاوەکوو سەدەی بیستەم ئەم جۆرە مامەڵەیە لەگەڵ مەسەلەکەدا هەر بەردەوام بووە. لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەیەم بە دواوە، لە ماوەی دووەمین جەنگی جیهانیدا تا ڕادەیەکی زۆر سنوورە یاساییەکانی دژی لەباربردن بە شێوەیەکی فراوان لە بەشێکی ناوچەکاندا جێبەجێ کران. لە ساڵی ١٩٥٠دا یاسای ئازادیی لەباربردن لە چەندان وڵاتی

ڕۆژئاوایی و لە ناوەڕاستی کیشوەری ئەورووپادا خرایە بواری جێبەجێکردنەوە. لە ماوەی دەیەکانی ١٩٦٠ و ١٩٧٠دا ئەم یاسایە لە ژمارەیەک ناوچەی گەشەسەندووشدا جێبەجێ کرا. تەنیا چەند وڵاتێکی کەمی وەکوو هیندستان و چین، لەو کاتەدا مەسەلەی لەباربردنیان پشتگوێ دەخست و هیچ گرنگییان پێ نەدەدا. چەند هۆکارێک کاریگەرییان لەسەر ئازادیی یاسای لەباربردن هەبوو، لەوانەش: گۆڕانکاری لە گۆشەنیگای تایبەت بە پێوەندییە سێکسییەکان و زاوزێکردن، کاڵبوونەوەی بیروباوەڕە ئایینییەکان لە ناو خەڵکیدا، هەروەها کاریگەریی بەکارهێنانی هەندێک دەرمانی زیانبەخشی وەکوو تراتۆجین* و دەرمانی هێورکەرەوەی وەک تالۆمید*، کە بەکارهێنانی ئەم دەرمانە لە ماوەی دووگیانیدا دەبێتە هۆی دروستبوونی ناتەواوی لە کۆرپەلەدا. هەروەها تووشبوونی لەڕادەبەدەر بە نەخۆشیی دڕکە* لە ماوەی دووگیانیدا و گرتنەبەری سیاسەتە گشتییەکانی وڵاتێک بۆ زۆربوون یان کەمکردنەوەی ڕێژەی لەدایکبوون و دانیشتوان، کە هەموو ئەمانە مەودای ڕۆشنبیریی خەڵکی لەبارەی (لەباربردنە یاساییەکان)ـەوە فەراهەم دێنێت و (لەباربردنە نایاساییەکان)یش، کە ژمارەیەکی زۆر لە ژنان بە هۆی ئەم لەباربردنانەوە تووشی نەخۆشی و تەنانەت مردنیش دەبن، بە مەترسییەکی گەورە بۆ سەر سەلامەتیی گشتیی

---

* Teratogenese
* Thalomid
* Rubella

کۆمەڵگە لە قەڵەم دراون. بۆیە هانی بە یاساییکردنی (لەباربردن)یان داوە.

بە پێی لێکۆڵینەوەیەکی گشتگیری ڕێکخراوی تەندرووستیی جیهانی لە ساڵی ١٩٩٩دا زۆربەی وڵاتە ئیسلامییەکانی وەک: بەحرێن، عێراق، ئوردن، کوێت، عوممان، قەتەر، سعوودیە، سوریا، تورکیە، ئیمارات، یەمەن، مالیزیا و پاکستان بە تێڕوانینی جیاواز بۆ نموونە ڕاستودرووستەکانی لەباربردن لە لایەن ڕێکخراوی تەندرووستیی جیهانییەوە هەلی ڕێگەپێدانی لەباربردنی کۆرپەلەیان (بە پێی پێویستی) فەراهەم هێناوە. سەرەڕای ڕەوایەتیدان بە (لەباربردن) بۆ مەبەستی پاراستنی گیانی دایک لە هەموو وڵاتەکاندا، هەندێک لە وڵاتان (ئوردن، سعوودیە، پاکستان) لە بوارێکی فراوانتردا بۆ مەسەلەی لەباربردن هەنگاویان ناوە و جگە لە پاراستنی گیانی دایک، تەندرووستیی ڕۆحی و جەستەیشیان بە لاوە گرنگ بووە. هەندێکی دیکەشیان، وەکوو کوێت و قەتەر، جگە لەو خاڵانەی سەرەوە، کەمئەندامبوونی کۆرپەلە و کۆرپەلەشیان بە هۆکارێک داناوە کە دایک بتوانێت داوای لەباربردنی یاسایی بکات. وڵاتانی بەحرێن و تورکیەش بە قبووڵکردنی هەموو بەندە یاساییەکانی ڕێکخراوی تەندرووستیی جیهانی بە مەبەستی یاساییکردنی (لەباربردن)، بۆ باشترکردنی سەلامەتیی دایکان و کۆمەڵگە و کەمکردنەوەی پاشهاتەکانی لەباربردنی ناتەندرووست و مردنی دایکان هەنگاویان ناوە. (سەرکەوت، ١٣٩٣، ١١٤)

جگە لە مەسەلەی سەلامەتیی دایک و هۆکارەکانی جێبەجێکردنی لەباربردن، داوەرییە جۆربەجۆرە مۆڕاڵییەکان لەبارەی لەباربردنی کۆرپەلەوە زیاتر لەو ڕوانگەیەوە سەرچاوە دەگرێت کە کۆرپەلە بە مرۆڤ لە قەڵەم بدرێت، ئەو کاتە لەباربردن حوکمی کوشتنی دەبێت. مرۆڤەکانیش مافی ژیانیان هەیە و لەباربردنی کۆرپەلە هەڵەیەکی لێنەبووراوە.

لەم بارەیەوە چوار تێڕوانین هەن:

١- کۆرپەلە، تەنیا کۆمەڵە خانەیەکە و هیچی تر نییە؛

٢- کۆرپەلە، شتێکە لە دۆخی ئامادەبوون بۆ مرۆڤبوون؛

٣- کۆرپەلە، مرۆڤێکی تەواوە و هەموو مافەکانی مرۆڤەکانی دیکەی هەیە؛

٤- کۆرپەلە، بەشێکە لە دایک و دایکیشی هەقی بە سەریەوە هەیە.

زانینی ئەم تیڕوانینانە و ئەو مەسەلە شەرعی و یاساییانەی پێوەندییان پێیانەوە هەیە، دەبنە یارمەتیدەرێکی زۆر باش بۆ ئەو کەسانەی کە لە داهاتوودا قۆناغەکانی زانکۆ تەواو دەکەن و دەبن بە مامان، پەرستار و... هتد، تاوەکو تێگەیشتنێکی ڕاست و درووستیان لەبارەی کۆرپەلە و لەباربردنی کۆرپەلەوە هەبێت و بتوانن بڕیاری درووست بدەن. لە ڕووی مۆڕاڵییەوە، ئەو بابەتانەی لەبارەی (لەباربردنی کۆرپەلە)وە دێنە بەر باس، زیاتر پێوەندییان بە مافەکانی ئافرەت و مافەکانی کۆرپەلەوە هەیە، کە

لەم بارەیەوە بابەتگەلێکی زۆر هەن. ئایا کۆرپەلە وەک کەسێکی زیندوو لە دەرەوەی منداڵدانی دایک لە قەڵەم دەدرێت و خاوەنی مافی تایبەت بە خۆیەتی؟ ئەگەر هات و وەکوو مرۆڤێک سەیر کرا، ئەی لە چ کاتێکدا دەبێتە خاوەنی مافی مرۆییی خۆی؟ ئەمانە نموونەی پرسیارگەلێکن کە وەڵامدانەوەیان چۆنیەتیی هەڵوێستوەرگرتنی مۆراڵیی بەرانبەر بە لەباربردن بە تەواوی دەگۆڕن.

بە پێی هەندێک پێناسە، هەر لە سەرەتای پێکەوەنووسانی هەردوو دڵۆپی نێر و مێوە ئیدی ئافراندن دەست پێ دەکات و بە (کۆرپەلە) دەناسرێت، کە قۆناغە سەرەتاییەکانی کۆرپەلەیە و پسپۆڕانی کۆرپەلەناسی ئاماژە بەوە دەکەن کە کۆرپەلە ناتوانێت پێش هەفتەی (٢٦) لە دەرەوەی منداڵدانی دایکدا بژی و ئەگەر بێت و هۆکارێکیش کاریگەریی بخاتە سەر منداڵدانی دایک، ئەوا لەوێیشدا ناتوانێت لە ژیان بەردەوام بێت، هەرچەندە لە مانگە سەرەتاییەکانی لەدایکبوونیشدا هیچ جۆرە نیشانەیەکی ژیانی سەربەخۆی تێدا بە دی ناکرێت.

بە پێی تیۆریی مۆڕاڵیی کانت لەبارەی ئەو کەسەوەی بووە بە قوربانی دەستدرێژی، ئایا دەکرێت ڕێگە بە نەشونماکردنی نوتفەی کەسێکی دەستدرێژیکار لە ناو منداڵدانی ئافرەتێکی قوربانیدا بدەین و دواتریش ببێت بە مرۆڤ؟ دایکیش باری قورسی پێگەیاندن و خەرجی زۆری لەسەر بێت تا ئەو کاتەی کە ئەم منداڵە بتوانێت لەسەر پێی خۆی ڕاوەستێت و درێژە بە ژیان بدات. جا بێجگە لەوەی دایک قوربانیی دەستدرێژیی

سێکسییە، لە هەمان کاتدا دەبێت ڕەنجی پارێزگاریکردن و بەخێوکردنی ئەو کۆرپەیەش بگرێتە ئەستۆ، کە لە ئەنجامی ئەم دەستدرێژکارییەدا درووست بووە. ئایا لەباربردنی وەها کۆرپەیەک بە کارێکی نامۆڕاڵی لە قەڵەم دەدرێت؟

لە بابەتەکانی دیکەی پێوەست بە مەسەلەی لەباربردنەوە، حاڵەتەکانی کۆرپەلەی ناتەواوە. لەوانەیە تاکێک لە بڕیاردانی پێوەست بە کۆرپەلەوە پشت بە مۆڕاڵی کانتی ببەستێت، کە مۆڕاڵێکە لەسەر بنەمای ویژدان بنیات نراوە و پێوەری کردارێکی مۆڕاڵی لەسەر بنەمای ئەنجامدانی ئەرکە ویژدانییەکان بزانێت. ویژدان پێمان دەڵێت کوشتنی مرۆڤێکی بێتاوان کارێکی نامۆڕاڵییە. بەڵام دەبێ سەرنجی ئەوەش بدرێت کە لە کاتێکدا کۆرپەلە، واتە پارچە گۆشتێکی بچووک کە هێشتا ڕۆحی بە بەردا نەکراوە، بە پێی بیروباوەڕی هەندێک لە ئایینەکان وەکوو مرۆڤ لە قەڵەمی نەدەین و بە پێی زانستی کۆرپەلەیش بە گۆشتپارەیەکی دابنێین، کە توانی ژیانی لە دەرەوەی منداڵدان نەبێت و کۆتاییهێنان بە گەشەکردنی ئەم گۆشتپارەیە تاکە ڕێگەی ڕزگارکردنی گیانی دایک بێت، یان ئامانج لێی ڕێگریکردن بێت لە درووستبوونی منداڵێکی ناتەواو. ئایا هێشتاش دەتوانین بە کارێکی نامۆڕاڵی لە قەڵەمی بدەین؟ یان بە پێچەوانەوە کارێکی تەواو ویژدانییە و نەکردنیشی دەبێتە کارێکی (نامۆڕاڵی؟) لێرەدایە کە شوێنی گەشەکردنی بەڵگەهێنانەوە مۆڕاڵییەکان بۆ دەستەی دەرمانگەر بە ڕوونی دەر دەکەوێت. هەڵبەت مەبەستی ئێمە لەوە نییە کە ئەم تیۆرییە

بە تەواوی درووستە، بەڵکوو دەمانەوێت بڵێین لە فێرکارییەکانی تایبەت بە چۆنیەتیی مامەڵەکردن لەگەڵ داواکارییەکانی (لەباربردنی کۆرپەلە)دا پێویستە لایەنە جۆربەجۆرە مۆڕاڵییەکان لە بەرچاو بگیرێن، چونکە لە بڕیاردانە مۆڕاڵییەکاندا کاریگەرییان دەبێت. ئەگەر لە گۆشەنیگای (ئەنجامگەراکان)یشەوە بۆ مەسەلەکە بڕوانین، دەبێت جارێکی دیکەش لە مەسەلەی لەباربردن ورد ببینەوە. ئەنجامگەرایی لەو باوەڕەدایە کە مۆڕاڵیبوونی کارێک تەنیا لە ڕێگەی ئەنجامەکانیەوە دیاری دەکرێت. ئەگەر لێرەشدا سەرنجی دووگیانی بدەین، بە تایبەت لەو حاڵەتانەی کە دووگیانییەکە ببێتە هەڕەشەیەک بۆ سەر گیانی دایک یان تەندرووستیی جەستەیی و ڕۆحی دایک بخاتە مەترسییەوە و کۆتاییی خۆشی لێ نەکەوێتەوە، ئیدی درێژەدان بە ماوەی دووگیانی کارێکی مۆڕاڵی نییە و پێویستە لەکاتی خۆیدا کۆتایی بە ماوەی دووگیانی بهێنرێت.

دەتوانین لە گۆشەنیگای (تیۆریی بەرژەوەندیخوازی)یشەوە سەیری مەسەلەکە بکەین. تیۆریی بەرژەوەندیخوازی بنەمای زۆرترین ڕادەی خۆشبەختی دەکاتە پێوەر بۆ جیاکردنەوەی چاک و خراپ لە یەکدی. بە پێی ئەم تیورییە، دەبێت لەنێو ئەو کردەوانەی کە لە کات و ساتە تایبەتەکاندا زیاتر جێبەجێ دەکرێن، ئەو کردەوەیەیان هەڵبژێرین کە دەبێتە هۆی بەدەستهێنانی خێری زیاتر. لە فەلسەفەی (کانت)یشدا، بۆ ئەوەی کرداری تاکێک لە ڕووی مۆڕاڵییەوە درووست بێت، دەبێت توانی

ئەوەی هەبێت ئیرادەی ئەوە بکات هەر کەسێکی تریش لەو حاڵەتەدا بێت، هەمان کار بکات. بە پێی ئەم تیۆرییە، کاتێک لەباربردن درووستە کە بۆ هەر کەسێکی تریش لە بارودۆخێکی هاوشێوەدا کارێکی ڕەوا و مۆڕاڵی بێت، بۆ ئافرەتێکیش کە لە درێژبوونەوەی کاتی دووگیانییەکەیدا گرفتی هەبێت، دەبێت کارێک بکات کە زۆرترین خێری بۆی هەبێت، بۆیە لەو حاڵەتانەدا کە گیانی دایک لە مەترسیدایە یان لە ئەگەری درێژەکێشانی ماوەی دووگیانییەکەیدا مەترسی بۆ سەر گیانی درووست دەبێت، ئیدی هیچ گومانی تێدا نامێنێتەوە، کە پاراستنی گیانی دایک، کە مرۆڤێکی کامڵە و دایکی خێزانێکە لە بەرانبەر کۆرپەلەیەکدا کە هێشتا توانی ژیانی لە دەرەوەی کۆرپەلەدانی دایکدا نییە، یاخود کۆرپەلەییێکە و هێشتا ڕۆحی بە بەردا نەکراوە، لەپێشترە. بۆیە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە پاراستنی سەلامەتیی جەستەیی و ڕۆحیی دایک کارێکی مۆڕاڵییە (شکور و همکاران، ١٣٩٢، ٣١)

## لەباربردنی دەرمانی لە ڕوانگەی مۆڕاڵی کارکردییەوە

مۆڕاڵی کارکردی بریتییە لە بەکارهێنانی تیۆرییە مۆڕاڵییە گشتییەکان لە مەسەلە مۆڕاڵییەکاندا، بەبێ ئەوەی هیچ لایەنگرییەک لە چارەسەرکردنی ئەم مەسەلانەدا هەبێت. (جمعی از نویسندگان، ١٣٨٧، ٤٩) لێرەدا ڕاستی و ناڕاستیی ئەو کارانەی لەناو کۆمەڵگەدا بە شیاو دەزانرێن و دەکەونە ناو بازنەی مەسەلە قسەهەڵگرەکان و هاوشێوەی قەیرانێکی مۆڕاڵییان لێ هاتووە، دەخرێنە ناو تەرازووی داوەریکردنی مۆڕاڵییەوە. بۆ نموونە: ئایا لەباربردنی دەرمانی درووستە یان هەڵەیە؟ لە هەندێک کۆمەڵگەدا لەباربردن نە بە تەواوی ڕێگەپێدراوە و نە بە تەواوییش ڕێگەلێگیراوە، واتا پێوەندیی بە خواستی کردنی ئەم کارەوە نییە، بەڵکوو بە هۆی هەلومەرجی تایبەتەوە بە ڕێگەپێدراو لە قەڵەم دەدرێت. جا لێرەدا پرسیاری ئەوە درووست دەبێت، کە چ بنەمایەکی مۆڕاڵی دەتوانێت لە کاتێکی دیاریکراودا ڕێگە بە لەباربردن بدات و لە کاتەکانی تردا ڕێگەی پێ نەدات؟ مەبەست لە (کاتی دیاریکراو) زیاتر حاڵەتەکانی دەستدرێژیی سێکسیی توندوتیژانەیە، یان ئەگەری

پەیدابوونی منداڵێکی ناتەندرووست و زیانگەیاندنی کۆرپەلەیە بە تەندرووستیی دایک.

١. تیۆریی ئەنجامگەرایی*: بە پێی بنەماکانی ئەم تیۆرییە، ئەگەر درێژەکێشانی ماوەی دووگیانی و ئەنجامەکانی ببنە هۆی دروستبوونی نارەحەتی و دڵەڕاوکێی زیاتر بۆ دایک، ئەوا لە ڕووی یاساییەوە ڕێگە بە دایک دەدرێت بڕیاری لەباربردنی کۆرپەلە بدات. لایەنگرانی قوتابخانەی ڕەسەنایەتیی سوود -کە بە شێوەیەکی گشتی لایەنگری مافی لەباربردنی کۆرپەلەن- لەو بڕوایەدان کە ئەگەر بێت و لەباربردن بە شێوەی یاسایی قەدەغە بکرێت، ئەوا ژنان درێژە بە لەباربردنە نایاساییەکان دەدەن و ئەمەش نەخۆشکەوتن و مردنی ئافرەتان زیاتر دەکات. ڕاستییەکەی لەم تیۆرییەشدا گرنگی بە ئەنجامی کارەکان دەدرێت. (محقق داماد، ١٣٨٨، ١٦٨)

٢. تیۆریی کاریگەریی دوولایەنانە: (فووت) لەو بڕوایەدایە کە تیۆریی کاریگەریی دوولایەنانە ڕێگەچارەیەکی گونجاوە بۆ مەسەلەی لەباربردن؛ بە پێی ئەم تیۆرییە، دەبێت جیاوازی لە نێوان ئەو نیاز و مەبەستەی کە پێش کردنی کارەکە هەیە، لەگەڵ ئەو ئەنجامانەی بە شێوەیەکی خۆنەویستانە لە کۆتاییی کارەکەدا دروست دەبن، بکرێت. بۆ نموونە: ئەگەر کۆرپەلەیشک بکەوێتە دۆخێکەوە کە لە نێوان دایک و کۆرپەلەدا تەنیا توانی ڕزگارکردنی یەکێکیانی هەبێت، لەوانەیە بە بەراوردکردنیان ژیانی دایکەکە ڕزگار بکات، چونکە مردنی

---

* Consequentialism

کۆرپەلە، ئەنجامێکی نەویستراو و ئامانجێکی نەخوازراو بووە. (موجدی و گلزار اصفهانی، ١٣٨٩، ٤٣)

٢. لەبارەی لەباربردنی کۆرپەلەوە سێ تێڕوانین هەن: لایەنگرانی ئازادیی لەباربردن، کە زیاتر ئاماژە بە لەپێشنەبوونی مافەکانی ئافرەت دەدەن، وەکوو: مافی بڕیاردانی ئافرەت بۆ زاوزێکردن، مافی کۆنترۆڵکردنی بەسەر جەستەی خۆیەوە، هەروەها بنەمای بڕیاربەدەستبوونی ئافرەت و دیارینەکردنی مۆڕاڵی کۆرپەلەیە؛ میانڕەوەکانیش، کە مەرجی ڕێگەدان بە لەباربردن دەگەڕێننەوە بۆ ناتەندرووستی و ناتەواویی کۆرپەلە و لەسەر دووگیانیی ئافرەتەکە و خێزان و ڕادەی ئەرک و بەرپرسیاریەتییەکەی لە ماوەی دووگیانیدا جەخت دەکەنەوە.

لێرەدا دوو مەسەلە جێگەی مشتومڕن: (یەکەم،) ئایا کۆرپەلە مرۆڤی تەواوە و لە چ کاتێکدا کەسایەتیی مۆڕاڵی دەبێتە خاوەنی مافی مرۆییی وەکوو مافی ژیان؟ (دووەم،) لەکاتی بەریەککەوتنی مافەکانی ئافرەت و کۆرپەلەدا کامیان لەپێشتر دەبێت؟ نەیارانی مەسەلەی لەباربردن پێیان وایە کۆرپەلە لە یەکەم چرکەی نەشونمایەوە خاوەنی کەسێتی و مافە مۆڕاڵییەکانی خۆیەتی و کەسێتیی مۆڕاڵی بە پێی گەشەی زیندەیی لێک دەدەنەوە. لایەنگرانی لەباربردن بوونی (کەسێتی) لە کۆرپەلەدا بۆ قۆناغەکانی کۆتاییی دووگیانی و تەنانەت دوای لەدایکبوونیش گەڕاندووەتەوە و گەشەی عەقڵی و دەروونیی منداڵیان بە پێوەری کەسایەتیبوون لە قەڵەم داوە. هەندێکی

دیکەش، سەرەڕای مرۆڤبوونی کۆرپەلە، هێشتا مافەکانی دایک پێش مافەکانی کۆرپەلە دەخەن. (اترک، ١٣٨٧، ٥٥).

بە هەرحاڵ، ئەوەی لەم بارەیەوە گرنگە ئەوەیە، کە هەلومەرجەکان وا دەکەن بکەری ئەم کارە بە کام یەک لەم تیۆرییانە بڕیاری کردن یان نەکردنی کارەکەی بدات.

## تێگەناسیی خانە بنەڕەتییەکان (Stem Cells)، هاوشێوەسازی و پیتاندنی دەستکرد (In vitro fertilisation)

لە زمانی عەرەبیدا وشەی (استنساخ/کۆپیکردن) و لە زمانی لاتینییشدا وشەی (Cloning) و لە فەرەنسییشدا (Clonege) بۆ هاوشێوەسازی بە کار دێن. ئەم وشەیە لە فەرهەنگە پزیشکییەکاندا بەم شێوەیە پێناسە کراوە: (کلۆنیک) لە وشەی یۆنانی Clon بە مانای چرۆ و قەڵشی دار دێت و وشەی کلۆنینگ لە ڕووی زمانەوانییەوە بریتییە لە بڕین، زۆرکردن و موتوربەکردن. لێکچوونی نێوان هاوشێوەسازی و موتوربەکردن لەوەدایە کە لە هاوشێوەسازیدا درووستبوونی ئاوڵەمە و زگپڕی بەبێ کرداری پیتاندنی خانەکانی نێر و مێ دەکرێت. لە ڕووی زاراوەییەوە هاوشێوەسازی،* بریتییە لە چاندنی ناوکی خانەیەکی غەیرەجینسیی مرۆڤ یان ئاژەڵ -کە کرۆمۆسۆمی تەواوی تێدا بێت- لە خانەی هێلکۆکەی پەتی لە ناوکی ڕەگەزی مێینەدا، پاشان پیتاندنی ئەم هێلکۆکەیە لە ڕێگای تایبەتییەوە لە مندالدانێکی سرووشتی یان دەستکرددا بە ئامانجی درووستبوونی زیندەوەرێک، کە لە ڕووی شکڵی ڕواڵەتییەوە بە تەواوی هاوشێوەی ئەو کەسە بێت، کە ناوکی خانەکەی لێ وەرگیراوە. بە مانایەکی تر، کلۆنینگ بە واتای

---

* Cloning

(زاوزێ و درووستبوونی زیندەوەرێکی هاوشێوەی نوسخە ڕەسەنەکەیە لە ڕێگەیەکی ناسێکسییەوە.) (نوبخت و مرادی، ١٣٨٧، ٢٦٨)

بانگەشەکاران و لایەنگرانی هاوشێوەسازیی مرۆڤ لە دوو ڕوانگەی پزیشکی و کۆمەڵایەتییەوە سەیری ئەم کارە دەکەن. ئەمانە بڕوایان وایە بە یاساییبوونی ئەم کارە، شارستانیەتیی مرۆڤایەتی پێ دەنێتە قۆناغێکی نوێوە و لە ڕووی پزیشکییەوە بە سەرچاوەیەکی لەبننەهاتووی دەسکەوتنی شانە و ئەندامە پێویستەکانی جەستەی دەزانن. لە ڕێگەی هاوشێوەسازییەوە دەکرێت شانەیەک یان ئەندامێکی کەسی نەخۆش بە یارمەتیی خانە بنەڕەتییە بەدەستهاتووەکانی خودی کەسەکە، بەبێ ترسی وەرنەگرتنی جەستەی نەخۆشەکە تێیدا بچێنرێت و جەستەشی وەریدەگرێت. واتا لە ڕێگەی خانە درووستکەرەکانی وەک خانەکانی مۆخی ئێسک، خانەی پێکهێنەری بنەڕەتی بۆ نەخۆشەکە پێک بهێنرێن. ئەم خانەی توانی ئەوەیان هەیە کار و فەرمانەکانی ئەو خانانە بکەن، کە لەگەڵیاندا دەچێنرێن. (نوبخت، ١٣٨٥، ١٠٤)

## پێشینەی هاوشێوەسازی و پیتاندنی دەستکرد

پیتاندنی دەستکرد بە شێوە زانستییەکەی دیاردەیەکی نوێیە و ئەنجامی زانستەکانی ئەم سەردەمەی مرۆڤە. ئەم کارە ڕێگرییەکانی بەردەم دووگیانیی لا بردووە و لە وەچەخستنەوەدا یاریدەیەکی زۆری مرۆڤی کردووە. زانستی پزیشکی توانی لەم ڕێگەیەوە زۆربەی گرفتەکانی ژن و پیاو لە درووستبوونی کۆرپەلەدا چارەسەر بکات. ئەم کارە لە سەرەتادا بۆ چاککردنی ڕەگەز و زیادکردنی ئاژەڵە ماڵییەکان بە کار هات. یەکەم تاقیکردنەوە لە لایەن زانایەکی ئەڵمانییەوە بە ناوی (لودویگ جاکوبی) لە ساڵی ١٧٦٥دا لەسەر ماسییەکان کرا (صفایی، ١٣٧٦، ٩٩) و پاشان لە ئیتاڵیا و دواتریش لە ڕووسیا پیتاندنی دەستکرد لەسەر ئاژەڵەکانی دیکەش تاقی کرایەوە و وردە وردە بۆ مرۆڤیش بە کار هات. لە ساڵی ١٧٩٩دا زانایانی ئینگلتەرا و لە ساڵی ١٨٦٦دا لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و لە ساڵی ١٨٦٨ و لە (نەخۆشخانەی ژنانی نیۆیۆرک-سیتی)یش زانایان تاقیکردنەوەکانی خۆیان کردووە. دە ساڵ دواتر یەکێک لە زانایانی فەڕەنسا ڕایگەیاند کە لەنێو ٧٢ ژندا، کە پیتاندنی دەستکردیان بۆ کراوە، ٤١ حاڵەتیان دووگیان بوون. لەو ساڵانە

بە دواوە ئەم بابەتە هزری زانایان و پزیشکانی بە خۆیەوە سەرقاڵ کردووە.

لە ساڵی ١٩١٤دا یەکێک لە پزیشکانی ئینگلیزی نیشتەجێی وڵاتی میسر بە ناوی دوکتۆر جامیسۆن* هەواڵی ئەوەی پێ درابوو، کە دەشتەکییەکانی میسر چەند ڕێگایەک بۆ چارەسەرکردنی نەزۆکیی ژنان بە کار دەهێنن، کە ژنەکان هەندێک جار سکیان پڕ بووە و هەندێ جاریش مردوون. ئەم هەواڵە پزیشکە ئینگلیزییەکەی ناچاری گەڕان و بە دواداچوون کرد و بۆی دەر کەوت ژنانی دەشتەکی پارچە پەشمێکی ئاژەڵ وەکوو پەشمی مەڕ دەهێنن و هەندێک نوشتە و شتی بەسەردا دەخوێنن و دەیدەن بە ژنە نەزۆکەکە بۆ ئەوەی لە منداڵدانی خۆی بسوێت، کە ژنەکە بەم ڕێگایە یان دووگیان دەبوو، یان دەمرد. بەڵام جامیسۆن توێژینەوەی وردی لەم بارەیەوە کرد، گەیشتە ئەو ئەنجامەی ژنە دەشتەکییەکان پەشمەکەیان لە تۆوی پیاو گلاندووە و پاشان داویانە بە ژنە نەزۆکەکە تا لە ڕێگەی ئەندامی زاوزێوە بە کاری بهێنێت، بۆیە برێکی زۆری میکرۆبیش دەچووە ناو منداڵدانی ئافرەتەکەوە. ئەگەر ئافرەتەکە سیستەمی بەرگریی بەهێز بوایە، دەما و ئەگەر بەهێز نەبوایە، دەمرد. ئەم بابەتە بووە هۆی ئەوەی دوکتۆر جامیسۆن بیر لەوە بکاتەوە، کە ئەم کارەی دەشتەکی و جادووگەرەکان لە ڕێگەیەکی زانستییەوە بگەیەنێتە ئەنجام و لە ڕێگەی ئامێرە دەستکردەکان و تیۆرییەکانی تاقیکارییەوە، تۆوی پیاوەکە بگەیەنێتە منداڵدانی

---

* Jamison

ئافرەتەکە، تاوەکوو لەم ڕێگەیەوە منداڵ بەو خێزانانە ببەخشێت کە بە هۆی نەبوونی منداڵەوە لە یەکتری جیا دەبوونەوە. جامیسۆن لەم کارەیدا هەندێک جار بە هۆی بێتوانایی سپێرمی پیاوەکەوە سوودی لە سپێرمی پیاوێکی دیکە وەردەگرت. پەرەسەندنی پیتاندنی دەستکرد لە ئینگلتەرا و سەرڕێژی ژنانی نەزۆک بۆ نەخۆشخانەکانی لەندەن بووە هۆی ئەوەی ڕای گشتیی خەڵکی لەسەر ئاگادار بکرێتەوە و داوای ڕوونکردنەوە لە وەزیری تەندرووستی بکرێت و ڕەخنەی توند لە حوکوومەت بگیرێت. هۆکاری دژایەتیی ئەنجوومەنی ئینگلتەراش ئەوە بوو، کە ئەم جۆرە منداڵانە وەکوو منداڵی سرووشتی، یاسایی و شەرعی تۆمار دەکرێن و ناسنامەیان بۆ دەر دەکرێت. سەرەڕای ئەو ڕەخنە توندانەی لە پیتاندنی دەستکرد گیران، کەچی ئێستا لە ئینگلتەرادا منداڵانی لەدایکبوو بە ڕێگەی پیتاندنی دەستکرد بە ڕێژەیەکی بەرچاو زیادیان کردووە. لە هەندێک وڵاتیشدا هەوڵ دراوە ڕێگری لە بەکارهێنانی ئەم ڕێگە ناسرووشتییە بکرێت. لە وڵاتی ئیتاڵیا و لە شاری ڤاتیکاندا، پاپای ڕێبەری ئایینی کاسۆلیکەکانی جیهان پیتاندنی دەستکردی حەرام کرد؛ بەڵام ژمارەیەک وڵاتی ئەورووپی و ئەمەریکایی بە ڕەوایان زانی. (هەمان سەرچاوە، ل١٠٠). لە ئێستاشدا لە وڵاتە یەککگرتووەکانی ئەمەریکادا، سەرەڕای دژایەتیی زۆر، هێشتا پیتاندنی دەستکرد بازاڕی گەرمە و پزیشکانی فەرەنسایش بە پێی ڕەزامەندیی ژن و پیاو ئەم کارە دەکەن.

## هاوشێوەسازی و پیتاندنی دەستکرد لە ڕوانگەی فەلسەفەوە

لە کۆندا، پێناسەکردنی ژیان لە ئەستۆی فەیلەسووفاندا بوو. هەر بیرمەندانی وەک ئەرەستۆ هەوڵی زۆریان بۆ پێناسەیەکی ژیان داوە. بەڵام زۆربەی فەیلەسووفانی ئێستا ئەم کارەیان خستووەتە لاوە، چونکە بڕوایان وایە پێناسەکردنی ژیان لە توانی زانستدا نییە. زیندەناسانیش ماوەیەکی زۆرە گوێیان لە پێناسەکردنی ژیان خەواندووە. لەوانەیە ئەوانیش بڕوایان وا بێت ئەم کارە لە توانی فەلسەفەدا نییە. تەنانەت لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمیشدا، سەرەڕای بەرهەمەکەی شرۆدینگەر بە ناونیشانی (ژیان چییە؟) هێشتا چییەتی ژیان فەرامۆش کرابوو و لە نێوان فەلسەفە و زانستدا وێڵ و سەرگەردان بوو.

خۆشبەختانە لە دەیەی ١٩٩٠دا لەگەڵ پەرەسەندنی چەمکی ژیانی دەستکرددا، پێکهێنان و درووستکردنی پرۆسە هاوشێوەکانی ژیان لە سەردەمی تەکنەلۆژیادا، جارێکی تر پێناسەکردنی ژیان کەوتەوە نێو چەقی گفتوگۆیەکانەوە.

ئەو پێرستانەی زیندەناسان لەبارەی تایبەتمەندییەکانی ژیانەوە زۆر ڕەنگاڵەن. لە پێرستەکەی (مۆنۆد ١٩٧١)دا دەتوانین ڕەفتارێکی ئامانجدار، شێوە وەرگرتنی خۆویستانەی گیاندار و یەکجۆری لە زاوزێدا بەرچاو بکەوێت، لە کاتێکدا (مایەر) لە ساڵی (١٩٨٢)دا لە پێرستەکەی خۆیدا ئاماژەی بەم خاڵانە

کردووە: تێکهەڵاوێری و ڕێکۆپێکی، یەکبوونی کیمیایی، لایەنی چۆنیەتی، یەکانگیری و جۆربەجۆری، بوونی بەرنامەیەکی بۆماوەیی، سروشتی مێژوویی، هەڵبژاردنی سرووشتی و دوورکەوتنەوە لە ڕەهاییبوون. بەم دوواییانەش کۆشلندجەر (٢٠٠٢) حەوت بنەمای بۆ ژیان دەستنیشان کردووە. بە بڕوای ئەو، هەر بوونەوەرێکی زیندوو بە پێی ئەم بنەما تێرمۆداینامیکییانە کار دەکات: بەرنامە، کۆد، دەسپێکی ژیان، کۆدکردن، وزە، چاکبوونەوە، گونجان و جوودابوون لە ژینگەی چواردەور.

ئامانجی ژیانی دەستکرد هێنانەکایەی تێگەیشتنێکە، کە لە جێگەی (ئەو ژیانەی ئێمە دەیناسین) باوەڕمان بەو (ژیانەی کە دەکرێت وەها بێت،) هەبێت. ئەمەش یەکێکە لە تایبەتمەندییەکانی زانستە زیندەییەکان. (سەرکەوت، ١٣٩٣، ٧٢) ئامانجی ئەو کەسانەی لە بواری ژیانی دەستکرددا کار دەکەن، بەرهەمهێنانی نەوەی نوێی ئاڵۆزە لە ڕێگەی (کاملکردن) لە ژینگە دەستکردەکاندا. ژیان لە ڕوانگەی بەداوەوە، بریتییە لەو تەکوزییەی لە بەرانبەر هەر گۆڕانکارییەکی چاوەڕواننەکراوی سرووشتدا، توانستی ئۆتۆماتیکی و گۆڕانکاریی لەو شتەی کە بەداو بە گونجاندنی لاستیکی ناوی دەبات، دێتە کایەوە.

## خانە بنەڕەتییەکان، هاوشێوەسازی و پیتاندنی دەستکرد لە ڕوانگەی مۆڕاڵی زیندەییەوە

مۆڕاڵی زیندەیی، یەکێکە لە بابەتە فەلسەفی و پسپۆڕییەکان، کە لە خانەی بەشەنێوەنجییەکانە* و چەندان بەشی دیکە لە پێگەیشتنی ئەم بەشەدا بەشدارییان هەیە. بابەتەکانی نێو مۆڕاڵی زیندەیی لە زۆربەی کاتەکاندا لەگەڵ بابەتەکانی بەشەکانی دیکەدا تەواوکەری یەکن، یان کاریگەریی دوولایەنەیان هەیە. هەندێ جاریش دژایەتییان لەنێواندایە. چاوگەکانی خوێندنەکانی مۆڕاڵی زیندەیی بۆ سەردەمی یۆنانی کۆن دەگەڕێنەوە. (محقق داماد و همکاران، ١٣٨٨، ١٦٧) بەڵام چەمکی مۆڕاڵی زیندەیی لە ساڵی ١٩٧٠دا بە شێوەیەکی جیددی خرایە بەر باسەوە و توێژینەوەی زۆری لەبارەوە کرا. ئەمەش بووە هۆی ئەوەی مۆڕاڵی زیندەیی بچێتە ناو زۆر بواری فەلسەفی، خوداناسی، پزیشکی، یاسایی، کۆمەڵناسی و سیاسەتەوە و وەک بەشێکی نێونجکار چالاکیی خۆی بنوێنێت.

مۆڕاڵی زیندەیی بریتییە لە زانستی مۆڕاڵ لەو بوارەدا، کە پێوەندیی بە ژیان و جەستەی مرۆڤەوە هەیە. واتا ڕەفتاری قبووڵکراوی مرۆڤ و چۆنیەتیی مامەڵەکردنی لەگەڵ ژیان و جەستەی خۆیدا، کە یەکێکە لە بەشەکانی زانینی گوتار و

* Interdisciplinary

خوێندنەوەی بەرهەمە فەلسەفی و مۆڕاڵییەکان، هەروەها هەندێک لە میتۆد و شێوەکانی زیندەناسی و تەکنەلۆژیای نوێیە، کە کاریگەرییان بەسەر ژیانی مرۆڤەوە هەیە. نموونەکانی مۆڕاڵی زیندەییش بریتین لە: پێتاندنی دەستکرد، هاوشێوەسازیی مرۆڤ، ئامادەکردنی جینۆمیی مرۆڤ، توێژینەوە لە خانەکان و چۆنیەتیی چارەسەرکردنی نەخۆشییە بێچارەسەرەکان. لە ڕەشنووسی ڕاگەیەندراوی جیهانی مۆڕاڵی زیندەیی و مافەکانی مرۆڤدا کە دواتر بوو بە ڕاگەیەنراوی فەرمیی مۆڕاڵی زیندەیی و مافەکانی مرۆڤ، پێناسەیەکی مۆڕاڵی زیندەیی خراوەتە ڕوو. بە پێی ئەم پێناسەیە، مۆڕاڵی زیندەیی بوارێکی سیستماتیکیی بەشەکیی نێوەندگرە، کە پێویستی بە مەسەلەکانی مۆڕاڵی تیۆری و کرداری لە پزیشکی و زانستەکانی پێوەست بە ژیانی زیندەییەوە هەیە، کە زیاتر پێوەستە بە پێوەندیی مرۆڤ لەگەڵ ئاژەڵاندا. بە پێی ئەم پێناسەیە، مۆڕاڵی زیندەیی مژووڵی خوێندنەوە و لێکۆڵینەوەی نێوەندگرییە، کە ئامانجی پاڵفتەکردن و چارەسەرکردنی مەسەلە مۆڕاڵییەکانی پەیدابووی کارە پزیشکییە زیندەییەکان و زیندەناسییە. کە واتە پێش هەموو شتێک مۆڕاڵی زیندەیی، گرنگیی بە مرۆڤ و ڕێزگرتن لە جەستە و گیانی دەدات. کە واتە لەبارەی مافی ژیانی زیندەییی کۆرپەلەی تاقیگەییەوە، دەکرێت زۆر بە ئاسانی لە بواری مۆڕاڵی زیندەییدا بچینە ناو بوارەکانی فەلسەفە، مۆڕاڵ، کەلام، فیقهـ و یاساوە و لەم دەلاقەیەوە بۆی بڕوانین. هەر کاتێک قسەوباسی ماف بێتە ئاراوە، خەرمانێک لە بابەتە مۆڕاڵییەکانیش دەر دەکەون.

پاراستنی ژیانی زیندەیی کۆرپەلەی تاقیگەییش یەکێکە لە مافە زیندەیی و مۆراڵییەکان، کە لە بازنەی فراوانی ئەم زانستەدا، کە لەمڕۆدا لە هەموو کۆمەڵگەکاندا جێگەیەکی تایبەتی هەیە، بە تێپەڕبوونی کات مانا و دەلالەتی نوێ وەردەگرێت، توێژینەوەی لەبارەوە دەکرێت. گرنگترین بنەمای مۆراڵی زیندەیی پابەندبوونە بە ڕێزگرتن لە پلەوپایەی مرۆڤ و مافەکانی مرۆڤەوە، کە لە ڕاگەیەنراوی جیهانیی مافەکانی مرۆڤ و جینۆمیی مرۆییدا لەگەڵ مافەکانی مرۆڤ و مۆراڵی زیندەییشدا ڕەنگی داوەتەوە. ڕاگەیەنراوی جیهانیی مافەکانی مرۆڤ لە ساڵی ١٩٤٨یشدا پایە و نرخی مرۆڤ بۆ هەموو خەڵکی و گشت میللەتان جەختی لەسەر کراوەتەوە. لەوانەیە خاڵی جیاکەرەوەی بەڵگەنامە نێودەوڵەتییەکانی زیندەپزیشکی، هەمان گرنگیدانیان بێت بە مەسەلەی کەرامەت و پایەی مرۆڤ و یەکخستنی پێوەرە هاوبەشەکان لە چوارچێوەی مافەکانی مرۆڤدا، بەڵام سەیر لەوەدایە کە کەرامەتی مرۆیی، یەکێکە لە بەها هاوبەشەکانی ناو پلۆراڵیزمی فەلسەفی. (شیروی، ١٣٨٩، ١٥٦) گرنگیدان بە کەرامەتی مرۆیی و هەوڵدان بۆ پاراستنی لەناو بەڵگەنامە نێودەوڵەتییەکانی مۆراڵی زیندەییدا بە ڕادەیەکە، کە هەندێک جار وەک (بنەمای پێکهێنەر)ی مۆراڵی زیندەیی لە قەڵەم دەدرێت. هەرچەندە بەشێکی زۆری ئەو تێگە دەستوورییانەی کە دەبێت مرۆڤ پابەندیان بێت، لە قاڵبی مۆراڵدا شێوەیان گرتووە، بەڵام دەبێت دان بەوەشدا بنێین، کە لە ڕۆژگاری ئێستادا بە پێشکەوتنی کۆمەڵگەکان لە بواری زانست و تەکنەلۆژیادا،

(کەرامەتی مرۆیی) ناتوانێت بە تەنیا لە بەر ڕۆشناییی مۆڕاڵدا گرفتە هەڵقوڵاوەکانی پێشکەوتنە زانستییەکانی چارەسەر بکات. هەر بۆیە بۆ دەستگیرۆییی مۆڕاڵ لە چارەسەرکردنی مەسەلە مۆڕاڵییەکاندا، کۆمەڵگە مرۆییەکان چەندان بەڵێننامەیان لەم بارەیەوە ڕێک خستووە و دەنگیان لە سەر داوە. (هەمان سەرچاوە، ١٥٨).

## لایەنگرانی هاوشێوەسازی

هاوشێوەسازی، دەتوانێت ڕێگەیەک بێت بۆ چارەسەرکردنی ڕیشەییی نەخۆشییە بۆماوەیی و شێرپەنجەییەکان. لایەنگرانی هاوشێوەسازی بانگەشەی ئەوە دەکەن کە دەتوانین لە ڕێگەی لێکۆڵینەوەی بۆماوەیی و جیناتییەوە کۆرپەلەی هاوشێوە، جینە خراپەکان پاک بکرێنەوە. لە هەمان کاتدا، هاوشێوەسازی لە ناسینەوەی جیناتی جینۆمیی مرۆڤدا دەتوانێت ڕۆڵێکی کاریگەر بگێڕێت. لە لایەکی تریشەوە لایەنگرانی هاوشێوەسازی پێیان وایە ئەم کارە دەسکەوتی کۆمەڵایەتیی گرنگی دەبێت، لەوانەش (ژیانی دووبارە)یە بۆ ئادەمیزاد. هاوشێوەسازی لە خانە هەڵگیراوەکانی پشیلەدا ئەوەی دەر خست، کە بۆ کردنی ئەم کارە پێویست بە خانەی نوێ ناکات. لەم سۆنگەیەوە، لایەنگرانی هاوشێوەسازی، جاڕی ئەوە دەدەن، کە بۆچی دەبێت جیهان

تەنیا بۆ یەک جار سوود لە ئەنیشتاییەنەکان، بیتهۆڤن و نیوتنەکان وەربگرێت؟!

لە ڕێگەی هاوشێوەسازییەوە دەتوانین مرۆڤە گەورەکان بۆ هەمیشە بە زیندوویی بهێڵینەوە. دەکرێت لەم ڕێگەیەوە هەمیشە سوود لە زانست و هونەری گەورەکان وەربگرین. بەلام گرفتەکە لێرەدایە کە لایەنگرانی هاوشێوەسازی پێمان نالێن هاوشێوەی زانایەکی وەک (ئارسەر چارلز کلارک)* چۆن دەبێتە کەسێکی شارەزا و پسپۆڕ لە زانستی پێوەندییەکاندا؟ (نوبخت، ١٣٨٥، ١١٠) پاراستنی خێزانە بێمنداڵەکانیش یەکێکی دیکەیە لەو لایەنانەی لایەنگرانی هاوشێوەسازی بانگەشەی بۆ دەکەن. لە جیهاندا زۆرن ئەو خێزانانەی بە هۆی نەبوونی منداڵەوە لە ئانوساتی لێکهەڵوەشاندندان. لە هەر دە خێزانێک یەکێکیان منداڵی نابێت. هاوشێوەسازی دەتوانێت تینوویێتیی منداڵویستی لای خێزانەکان بشکێنێت و چوارچێوەی خێزان بپارێزێت. لە کۆتاییەکانی دەیەی ١٩٣٠دا لە فەڕەنسا دامەزراوەگەلێک بە ناوی Baby Shopەوە هاتنە کایەوە، کە سپێرم و هێلکۆکەی ژن و پیاوی دیاریکراو و تایبەت لە سەرانسەری جیهاندا، لە تاقیگە و بە ڕێگەی IVF، خانەکانی هێلکەی ئامادە دەکرد و بە کڕیارەکانی دەفرۆشت. لە نامیلکەی وردەکاریی بەرهەم و

---

• Arthur C. Clarke

ڕیکلامی دامەزراوەکاندا ئاماژە بەوە درابوو، کە بە ڕێژەی ٣.٣٣% منداڵی خوازراوی باوان پێشکێش بکات. باوان سەردانی ئەم دامەزراوانەیان کردووە و خانەی هێلکەی خوازراوی خۆیانیان دەکڕی و دەیانخستە ناو منداڵدانی ئافرەتی جێگرەوە یان خودی دایکەکە و پاش نۆ مانگ دەبوونە خاوەنی منداڵی خۆیان، بەڵام گرفتەکە لەوێدا بوو، کە نەیاندەزانی ئەم سپێرم و هێلکۆکەیە لە چ ژن و پیاوێکەوە وەرگیرابوون؟ هەر زوو لەژێر گوشاری کڵێسە و گرووپە مەزهەبییەکانی فەڕەنسادا لە کار خران. بازاڕی فرۆشتنی خانە پێگەیشتووەکان یان Body cell shop بەرئەنجامێکی دیکەیە، کە لایەنگرانی هاوشێوەسازیی مرۆڤ بانگەشەی بۆ دەکەن، واتا ئەو کەسانەی مەرجە تەندرووستییە دیاریکراوەکانیان تێدایە، خانەکانی خۆیان بۆ فرۆشتن و بەکارهێنان لە پرۆسەی هاوشێوەسازیدا دەخەنە ڕوو. (نوبخت، ١٣٨٥، ١٢٠).

## نەیارانی هاوشێوەسازی

ئ// پێشێلکردنی کەرامەتی مرۆڤ و نیگەرانی لە دروستکردنی مرۆڤ وەک کاڵایەک

یەکەم بەڵگە، کە نەیارانی هاوشێوەسازی لە ڕەتکردنەوەی ئەم کارەدا دەیخەنە ڕوو، پێشێلکردنی کەرامەتی مرۆییە. کەرامەت بە مانای عیززەت و شەرەف و هاوواتای وشەی (dignity)یە کە لە ڕاگەیەنراوی ڕێکخراوی نەتەوە یەککگرتووەکان و

ڕاگەیەنراوی جیهانیی مافەکانی مرۆڤدا ڕەچاوکردنی ئەم کەرامەتە بە شتێکی پێویست لە قەڵەم دراوە. (سەرکەوت، ١٣٩٣، ٧٦) عیززەت و کەرامەت دوو جۆرە: کەرامەتێکی ناوەکی، کە تایبەتە بە هەر مرۆڤێکەوە و لێی جیا نابێتەوە، تەنانەت پیاوکوژان و تاوانبارانیش ئەم کەرامەتەیان هەیە، بۆیە مەسەلە مرۆییەکان تەنانەت لە سزادانی تاوانبارانیشدا دەبێت ڕەچاو بکرێن؛ کەرامەتێکی ڕووکاریشمان هەیە، کە ئادەمی بە دەستی دەهێنێت و بە هۆی فەزیلەت و پێگەیشتووییانەوە مرۆڤەکان ئەو کەرامەتە بە دەست دەهێنن. لێرەدا دەمانەوێت لەبارەی کەرامەتی ناوەکییەوە قسەوباس بکەین. نەیارانی هاوشێوەسازی بڕوایان وایە مرۆڤی هاوشێوە، هەمان کەرامەت و پلەوپایەی مرۆڤەکانی دیکەی نابێت، بەڵکوو وەک کاڵایەک و بەرهەمی کارگەیەک مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت. ئەگەری دروستبوونی کۆیلەداریی نوێ دێتە ئاراوە. (رنجبریان، ١٣٨٨، ١٣٠). لێرەشدا هەواوهەوەسی بەرهەمهێنەرانی هاوشێوەسازی بەسەر کەرامەتی مرۆییدا زاڵ دەبێت.

ب// پێشێلکردنی بنەمای سەربەخۆی تاک

لەوانەیە گرنگترین هۆکاری نەیارانی هاوشێوەسازیی مرۆڤ مەسەلەی بنەمای سەربەخۆیی تاک* بێت. بە پێی ئەم بنەمایە، هەر مرۆڤێک خاوەنی سەربەخۆیی و ڕێزی خۆیەتی و لە هەموو بوارەکانی دیکەی ژیانیدا پێڕەو دەکرێت. مرۆڤەکانی دیکە مافی

* Autonomy

ئەوەیان نییە ئەم ئازادی و سەربەخۆییەی لێ زەوت بکەن و بە زەبروزەنگ و بێ ڕەزامەندیی خۆی کارێکی پێ بکەن. بە پێی ئەم بنەمایە، پێویستە لە لێکۆڵینەوەی مرۆڤەکان ڕێز لە بڕیاری ئەو مرۆڤانە بگیرێت، کە توانی بڕیاردانیان هەیە و زانیاریی پێویست لەبارەی جۆری نەخۆشی، دەرمان و ئەنجامی شیکارییەکانەوە بە مرۆڤەکە بدرێت. هەروەها پێوستە مافی شێت و منداڵانیش، کە توانی بڕیاردانی درووستیان نییە، بپارێزرێت. (اسماعیل آبادی، ١٣٨٧، ٤٠)

پ// لێسەندنەوەی سەربەخۆیی تاک لەپێناو ویستی باواندا

لە چاوی لایەنگرانی مافەکانی مرۆڤەوە درووستکردنی هاوشێوەی مرۆڤ دەبێتە هۆی لێسەندنەوەی سەربەخۆیی و ئازادیی تاکەکان. زەوتکردنی ئازادیی مرۆڤی هاوشێوە لەوانەیە لە چەند ڕوویەکەوە بێت: (یەکەم،) ڕەتکردنەوەی سەربەخۆیی مرۆڤەکان بە بیانووی نەبوونی داهاتوویەکی ڕۆشن، چونکە کەسی هاوشێوە ئاگاداری ژیانی هاوشێوەکەیەتی. واتا مرۆڤی هاوشێوە هەموو شتێک لەبارەی خۆیەوە دەزانێت، هەروەها زانیاریی لەبارەی کەسی یەکەمی بەخشەری DNAـەوە هەیە، ئەمەش دەبێتە هۆی چاوەڕوانیی ئەو پێشهاتانەی بۆ کەسی یەکەم پێش هاتوون. هەروەها پێشبینی و ئومێدەکان، ترس و ئامانجەکان، پێوەر و ستانداردەکانی سەرکەوتن و شکستی کەسی یەکەم لە پێشچاو دەگیرێن. هەندێک لە نەیاران پێیان وایە: (مرۆڤی هاوشێوە، ژیانی خۆی لەگەڵ بەشێکی زۆری گریمانەکاندا لەبارەی تایبەتمەندییەکان و ژیانی کەسی یەکەمەوە

بەسەر دەبات، ئەمەش جۆرێک لە سەپاندنی ئەو لایەنانەی ژیانی کەسی یەکەمە بەسەر مرۆڤی هاوشێوە و سەربەخۆیی هاوشێوەدا کە پێشێل دەکرێت.) (رنجبریان و سیف،١٣٨٨،٤١) لەوانەیە هۆکاری دیکەی زەوتکردنی ئازادی، چاوەڕوانییەکانی باوانی جینۆم بێت، بەو مانایەی مادام ئەوان ئاگاداری سەرچاوەی درووستبوونی مندالّی هاوشێوەن، لەوانەیە چاوەڕێی ئەوە بن، کە مندالّەکەیان لاسایی ژیانی جینی پێکهێنەری بکاتەوە. هەر بۆیە باوان بۆ هێنانەدیی چاوەڕوانییەکانی خۆیان لە مندالّەکەیان بە ئاڕاستەیەکدا ڕێبەری دەکەن، کە لەوانەیە مندالّ لە دیاریکردنی ژیانی خۆی مەحرووم بێت.

ت// زەوتکردنی سەربەخۆیی مرۆڤ بە هۆی دیاریکردنی چارەنووسەوە

هەندێ کەس بۆ ڕەتدانەوەی هاوشێوەسازی، بەڵگە بەوە دەهێننەوە کە کەسی هاوشێوە لەوانەیە ژیان و چارەنووسی وەکوو کەسی یەکەم بێت، بۆیە ئەم حاڵەتە کاریگەریی نەرێنیی بەسەر کەسبی هاوشێوەوە دەبێت. لەوانەیە کەسی هاوشێوە هەست بەوە بکات، چارەنووسی ژیانی لە ڕابوردوودا نووسراوە، هەرچەندە ئەمە هەستکردنێکی هەڵەیە و ئیعتیبارێکی زانستی نییە، بەڵام کاریگەریی خۆی دەبێت. (محمدی، ١٣٨٧، ٦٧) هابرماس لە ڕیزی نەیارانی مەسەلەی هاوشێوەسازییە و بڕوای وایە: "بێ گومان دید و تێڕامانی ئێمە لە پێکهاتەی جینات

کاریگەریی زۆری دەبێت. لەوانەیە ئێمە باوەڕمان وا بێت جینات سەرئەنجامی پڕۆسەیەکی سروشتییە، یان بەشێکە لە تەرحێکی (نهێنی،) یان بە ڕوانگەیەکی ئایینییەوە وەک دیارییەکی خودایی سەیری بکەین. ئەم جۆرە لێکدانەوانە جۆری ڕۆشنبیریی مرۆڤ لەبارەی ڕادەی ئیختیاریی مرۆڤەوەیە کە لە ژیانی ڕۆژانەیدا دیاریی دەکات. بەڵام کاتێک مرۆڤ جینەکانی لە ڕێگەی سرووشتی و ویستی خوداییەوە دیاری ناکرێن، بەڵکوو لە ڕێگەی کەسێکی دیکەوە ڕێک دەخرێن، بێ گومان کاریگەری بەسەر دەروونی ئەم کەسەوە بە جێ دەهێڵێت." (نیکوئی نژاد، ١٣٩٠، ٣٢).

چ// دژایەتیی هاوشێوەسازی لەگەڵ بنەمای ئیختیاردا

بەڵگەیەکی دیکەی نەیارانی هاوشێوەسازی دەگەڕێتەوە بۆ تێگیرانی هاوشێوەسازی لەگەڵ بنەمای ئیختیار و ئازادیی مرۆڤدا. هابەرماس لەم بارەیەوە دەڵێت: "ئەو کەسەی هاوشێوەی مرۆڤی دیکە درووست دەکات، لەپێشدا بەرنامەڕێژیی کردووە و هەموو سیفەتەکانی کەسی خوازراوی خۆیی دەستنیشان کردووە." بە بڕوای کەسانی وەک هابەرماس، مەرجی کاری ئازاد و قبووڵکردنی ئەنجامی کارەکانی، بریتییە لەوەی هیچ کەسێک ئیختیاری زەوت نەکردبێت. (نیکوئی نژاد، ١٣٩٠، ٣٤).

ج// پێشێلکردنی بنەمای وەرگرتنی ڕەزامەندیی هۆشیارانە

ئەمەش یەکێکی دیکەیە لەو بەڵگانەی نەیارانی هاوشێوەسازی باسی لێوە دەکەن. بە پێی ئەم بنەمایە، هەر جۆرە دەسکارییەک لە جەستەی مرۆڤ پێویستی بەوە دەبێت کە مرۆڤەکە ئاگادار بکرێتەوە. پێویستە پزیشک لەبارەی جۆری نەخۆشی، جۆری چارەسەر، جۆری شیکاری و تاقیکارییەوە نەشتەرگەری و هاوشێوەکانی، زانیاریی پێویست بخاتە بەردەستی نەخۆشەکە. وەرگرتنی ڕەزامەندیی نەخۆشیش لەسەر بنەمای سەربەخۆییی مرۆڤە لە بڕیارداندا. نەیارانی هاوشێوەسازی بڕوایان وایە، مادام پێش ئەنجامدانی کاری هاوشێوەسازی ئەگەری وەرگرتنی ڕەزامەندی لە کەسی هاوشێوەکراو لە ئارادا نییە، کە واتە ئەم کارە قەدەغەیە. هەروەها بە خستنەڕووی چەند پرسیارێک و بوونی ناڕوونی لە ئەنجامدانی کارەکەدا، ئەم کارە ڕەت دەکەنەوە. لە نموونەی ئەو پرسیارانەش وەک: لە هاوشێوەسازیدا، دەبێت ڕەزامەندی لە چ کەسێک وەربگیرێت؟ ئایا ڕەزامەندیی بەخشەری خانەکە بەسە یان پێویستی بە ڕەزامەندیی بەخشەری هێلکۆکەش هەیە؟ چ کەسێک دەتوانێت بەرانبەر مەترسی و زیانەکانی مرۆڤ و جیلە هاوشێوەکانی داهاتوو ڕەزامەند بێت؟ ئایا ڕەزامەندی-دەربڕینی کەسی یەکەم بەسە بۆ ئەوەی مەترسییە جەستەیی و سۆزدارییەکانی کەشی هاوشێوە بە ڕەوا بزانرێت؟ (رنجبریان و سیف، ١٣٨٨، ١٣٥)

ح// پێشێلکردنی بنەمای بەئامانجبوونی مرۆڤ

ئەمەش یەکێکی دیکەیە لە بەڵگەکانی نەیارانی هاوشێوەسازی. هەر وەک پێشتریش ئاماژەمان پێ دا، (بنەمای ئامانجەکان) کە کانت بە ئێمەی دەگوت، لەبەر نرخی جەوهەریی مرۆڤ، پێویستە لە ڕەفتارەکانمان لەگەڵ خۆمان و لەگەڵ مرۆڤەکانی دیکەشدا بە شێوەیەک بین، کە ئامانجمان مرۆڤایەتی بێت، نەک بەکارهێنانی مرۆڤەکان بۆ مەرام و مەبەستی دیکە. لەبەر ئەوەی لە کاری هاوشێوەسازیدا مرۆڤبوونی مرۆڤی هاوشێوەکراو دەکرێتە ئامراز و ئامانج لە هاوشێوەسازی، دروستکردنی چەندان مرۆڤی چوونیەکی بۆماوەیی و بەکارهێنانیانە لە جەنگدا یان لەکاتی ئاشتیدا، هەروەها بەکارهێنانیانە لە کارە سەخت و دژوارەکاندا، هەروەها زیادکردنی مرۆڤە لێهاتووەکان و زانا پایەبەرزەکان، یان کەسانی سیاسی و سەربازی لێهاتوو و دروستکردنی منداڵی بۆماوەتایبەتی* دڵخواز، جێگرتنەوەی هاوسەر یان هەر خزم و کەسێکی نزیک، کە مردووە، کە واتە هاوشێوەسازی قەدەغە دەبێت. (سەرکەوت، ١٣٩٣، ٨٠).

خ// مەترسیی چاکسازیی ڕەگەزی لە ڕێگەی هاوشێوەسازییەوە

ئەمەش یەکێکی دیکەیە لەو بابەتانەی نەیارانی هاوشێوەسازیی نیگەران کردووە. چاکسازیی ڕەگەزی لە ڕێگەی هاوشێوەسازییەوە بە دوو ڕێگەی (ئەرێنی) و (نەرێنی)

---

* Genotype

دەکرێت. چاکسازیی ڕەگەزیی نەرێنی بە ئامانجی باشترکردنی لایەنی تەندرووستی و لابردنی جینە خراپەکانە. چاکسازیی ڕەگەزی ئەرێنییش بریتییە لە ئەنجامدانی گۆڕانکاریی دڵخواز بۆ درووستکردنی بوونەوەرێک کە هەڵگری سیفاتی تایبەتی بێت. (رنجبریان و سیف، ١٣٨٨، ١٤٠).

دووگیانی له ڕێگەی منداڵدانی جێگرەوەوە، واتا بەکارهێنانی منداڵدانی ئافرەتێک بۆ جێگیرکردنی خانەی تۆوی ژنوپیاوێکی دیکە. دایکی جێگرەوە لە ڕووی پێوەندیی دی-ئێن-ئەیەوە DNA بۆ سێ حاڵەت دابەش دەکرێت:

١- جێگرەوەی دووگیانی یان جێگرەوەی تەواوەتی؛

٢- جێگیرەوەی بوونی ئافرەتێک و بوونی دایکوباوکێکی یاسایی دەستکرد یان ئاسایی؛

٣- جێگرەوەیی لە ڕێگەی بەخشینی هیلکۆکە یان کۆرپەلەیەکەوە بە ژن و پیاوێک. (نایبزادە، ١٣٨٠، ٤١)

لە گرووپی یەکەمدا، هیلکۆکە یان سپێرمی ژن و پیاوێکی نەزۆک بە شێوازی پیتاندنی دەرەکی، کراونە ناو منداڵدانێک و بە ڕێکخستنی بازنەی ئامادەبوونی دووگیانی لە لایەن ئافرەتێکەوە کە منداڵدانێکی جێگرەوەی دەوێت، لەگەڵ ئەو ئافرەتەی ئامادەگیی وەرگرتنی کۆرپەلەکەی هەیە، دەگوازرێتەوە بۆ ناو منداڵدانی ئافرەتە جێگرەوەکە. لەم شێوازەدا، ژنی خاوەن منداڵدان، کۆرپەلەکە تا کاتی لەدایکبوون لە منداڵدانیدا هەڵدەگرێت. لە ڕووی بۆماوەییەوە ئەم منداڵە هیچ پێوەندییەکی لەگەڵ ئافرەتە خاوەنمنداڵدانەکەدا نییە و دایکوباوکە نەزۆکەکە باوانی بۆماوەیی منداڵەکەن. ئەم شێوازە بە مانای شێوازی دووگیانی جێگرەوە یان جێگرەوەی تەواو دەناسرێت.

لە گرووپی دووەمدا، دووگیانی خاوەنی منداڵدانەکە لە ڕێگەی پیتاندنی ڕاستەوخۆ یان پیتاندنی تاقیگەییەوە دەبێت. ئەم شێوازە بە جێگرەوەی ڕێژەیی ناو دەبرێت، کە لێرەدا ئافرەتی خاوەن

منداڵدان لە ڕووی بۆماوەییەوە پێوەندیی لەگەڵ کۆرپەلەکەدا هەیە و بە دایکی زیندەیی/بۆماوەیی هەژمار دەکرێت.

لە گرووپی سێیەمیشدا، کە لە ڕێگەی جێگرەوە بە بەخشینی هیلکۆکەوەیە، کۆرپەلەی پەیدابوو لە سپێرمی پیاوەکە و هێلکۆکە بەخشراوەکە، لەناو منداڵدانی ئافرەتێکی جێگرەوەدا دەچێنرێت. لێرەدا وەکوو نموونەی یەکەم، ئافرەتە جێگرەوەکە لە ڕووی بۆماوەییەوە هیچ پێوەندییەکی لەگەڵ کۆرپەلەکەدا نییە، بەڵام پیاوەکە دەبێتە باوکی ڕاستەقینەی منداڵەکە. لە حاڵەتی (جێگرەوە بە کۆرپەلەی هەدیەکراو)دا کۆرپەلە لە ژن و پیاوی دیکە یان ئافرەت و پیاوی بێگانە وەرگیراوە و لە منداڵدانی دایکی جێگرەوەدا چێنراوە. (ناصری مقدم، ١٣٨٧، ١٥)

## منداڵدانی جێگرەوە لە ڕووی مۆڕاڵی پزیشکییەوە

وەچەخەرەوە هاوبەشەکان، بە پێی هەندێک ڕێنمایی یاسایی لەبارەی ئامادەکارییەکانی منداڵدانی جێگرەوەوە تا ڕادەیەک ناڕوونن، کە زۆر جاریش دەست ناکەوێت، بۆیە پێویستیان بەوە دەبێت کە بە هوشیارییەکی زۆرەوە لە ئەنجامدانی کارەکەدا هەنگاو هەڵبگرن. هەروەها وەکیل و دەلاڵەکانی منداڵدانی جێگرەوە و بە تایبەتییش پزیشکانی چاودێریی تەندروستی، ڕێکاری زۆر دەگرنە بەر، کە بەبێ ئەو ڕێکارانە تەنانەت ناکرێت منداڵدانێکی جێگرەوەش بە دەست بهێنرێت. ئەم پزیشکانە

چاودێریی تەندرووستیی ئافرەتی خاوەن منداڵدانی جێگرەوە دەکەن، کە ڕاستییەکەی لە هەر گرووپێکی پزیشکیی پسپۆڕ زیاتر گرنگیی بەم لایەنە دەدەن. هەر بۆیە پێش هەموو شتێک پێویستە لەوە دڵنیا ببنەوە کە ئافرەتێک یان ژن و پیاوێک کە هەڵگری سپێرمێک بن، ئایا دەکرێت بە شێوازی دەستکرد بۆ ئافرەتێکی جێگرەوەی پیتاندن بگوازرێتەوە؟ ئەگەر چی لە ڕووی پزیشکی و یاساییەوە ئەنجامدانی کاری لەم شێوەیە زۆر مەترسیدارە، بەڵام دووگیانبوونی ئافرەتێک یان پیتاندنی هێلکۆکە و سپێرمی ژن و پیاوێک لە تاقیگە و گواستنەوەی بۆ منداڵدانی ئافرەتێکی تر، کە وەک ئەوە وایە لە ناو منداڵدانی ئافرەتی جێگرەوەدا پرۆسەی دروستبوونی کۆرپەلەیەک جێبەجێ بکرێت، شتێکی نامومکینە. لەم سۆنگەیەوە جێگەی سەرسڕمان نییە، کە چەندان ڕێکخراوی وەک: (ئەنجوومەنی زایینپزیشکانی ئەمەریکایی)* و (کۆلێژی ئەمەریکاییی پسپۆڕیی ژنان و نەخۆشیی ژنان)* لەبارەی ستاندادردە پێویستەکانی زاوزێی ناو تاقیگەکانەوە گواستنەوەی هێلکۆکە پیتێنراوەکان بۆ ناو ڕێڕەوی فالووپ و پرۆسە پێوەستەکانی زاوزێوە، چەندان ڕێگەچارەیان خستووەتە ڕوو. جگە لەم ڕێکخراوە پزیشکییانە چەندان ڕاسپاردەیان لەبارەی چۆنیەتیی مامەڵەکردن و ئامادەکردنی منداڵدانی جێگرەوەوە بە شێوەی مۆڕاڵی پێشکەش کردووە. کۆلێژی ئەمەریکاییی پسۆڕیی ژنان پێشنیاری ئەوە

---

* ARSM
* ACOG

دەکات، کە ئامادەكارییە پزیشکییەکانی منداڵدانی جێگرەوە تەنیا لەکاتی پێویستدا بکرێن. ئەوەش لەو کاتەدایە کە دایکی جێگرەوە بە تەواوی ڕازی بێت، جگە لەوەی پێویستە بارودۆخی دووگیانی و پێدانی کۆرپەکە بۆ خاوەنە سەرەکییەکانی لە بەرچاو بگیرێت. هەروەها پێویستە ئەو برە پارەیەی بە دایکی جێگرەوە دەدرێت، بە پێی خزمەتەکانی بێت، نەک بە پێی توانی ئافرەتەکە، بۆ ئەوەی منداڵێک بهێنێتە دنیاوە کە بە دڵی دایکوباوکی ڕاستەقینەی بێت.

ڕاسپاردەکانی کۆلێژی ئەمەریکایی پسپۆڕی ژنان، وەکوو ڕاسپاردەکانی سینگەر و وێلز وان، ئەوانیش بریتین لە: ئامادەکارییە پێویستەکانی منداڵدانی جێگرەوە لە لایەن بنکە خۆڕاییەکانی هەڵگری بڕوانامەی هاوشێوەی بنکەکانی منداڵ-هەڵگرتنەوەوە چاودێری بکرێت، هەروەها دەبێت دەرفەت بە دایکی جێگرەوە بدرێت. لەسەر بڕیاردانی بۆ ڕادەستکردنەوە یان هێشتنەوەی منداڵەکە لە لای خۆی، بەڵام سینگەر و وێلز بە پێچەوانەی کۆلێژی ئەمەریکایی پسپۆڕیی ژنان لەبارەی ئامادەکارییە پێشوەختەکانی منداڵدانی جێگرەوەوە لایەنگریی بەرەی گشتییان دەکرد، کە بڕوایان وا بوو نابێت ئەم ئامادەکارییانە لە لایەن چەند لایەنێکەوە قۆرغ بکرێن.

ئەنجوومەنی ئەمەریکایی پسپۆڕیی ژنان ڕاسپاردەگەلێکی تا ڕادەیەک جیاواز لەبارەی ئامادەکردنی منداڵدانی زاوزێ بەرانبەر منداڵدانی جێگرەوەی کولتوورییەوە دەخەنە ڕوو. هەرچەندە چەند مەرجێک لەبارەی هەردوو فۆرمی ئامادەکردنی منداڵدانی جێگرەوەوە هەن، ئاماژە بەوەش دەدرێت کە پێویستە

توێژینەوەی مەیدانیی زیاتر لەبارەی سوود و زیانەکانی ئامادەکارییەکانی منداڵدانی جێگرەوەوە بکرێت. وا دەر دەکەوێت ئەنجوومەنی زایینپزیشکانی ئەمەریکایی لەبارەی ئامادەکارییەکانی منداڵدانی زاوزێوە لە چاو منداڵدانی جێگرەوەی کولتووریدا، هەڵوێستێکی باشتری هەبێت. ئەم ئەنجوومەنە کە لە مەودای یاسایی و گشتیدا فراوانبوونی بە خۆیەوە بینیوە، بڕوای وایە هەتاوەکوو باوان پێوەندییەکی زیاتریان لەگەڵ منداڵەکەیاندا هەبێت، زیاتر متمانە بە قسەیان دەکرێت کە دایکوباوکی منداڵەکە بن. کە واتە لە شێوازی منداڵدانی جێگرەوەی کولتووریدا وا دەر دەکەوێت دایکی جێگرەوە زیاتر قسەی ڕەواجی هەبێت، چونکە تەنیا کەسێکە پێوەندییەکی نزیکی لەگەڵ منداڵەکەدا هەبێت؛ هەم پێوەندیی زاوزێی و هەمیش پێوەندیی بۆماوەیی.

بەڵام لە شێوازی منداڵدانی جێگرەوەی زاوزێییدا دایکی داهاتوو ئەو وتانەی کە لەبارەی دایکیەوەیەتی، زیاتر وەردەگیرین، چونکە تاکە کەسە کە پێوەندیی لەگەڵ منداڵەکەدا هەبێت؛ پێوەندییەکی بۆماوەیی و زانراو، بەڵام تاوەکوو ئێستا ئەم ئەنجوومەنە لەبارەی بەکارهێنانی دەرمانگەییی دایکی جێگرەوەوە هەڵوێستێکی ئەوتۆی نییە. (سەرکەوت، ١٣٩٣، ٨٥-٨٧) جەخت لەوەش دەکاتەوە، کە پزیشکانی چاودێریی تەندرووستی، دەتوانن لە ڕووی ئاکارییەوە لە بەدەستخستنی منداڵدانی جێگرەوەدا بەشداری نەکەن.

وشەی (surrogate) لە وشەی لاتینیی (surrogacy)وە وەرگیراوە. کە بە مانای جێگرەوە دێت و بۆ یەکەمین جاریش لە کتێبی تەوراتدا ئاماژەی پێ کراوە: سارا بە هۆی نەزۆکییەوە، بە ئیبراهیمی هاوسەری گوت ئەم گرفتە لە ڕێگەی هاجەرەی کەنیزەکیەوە چارەسەر بکات. بەر لە شێوازە نوێیەکانی یارمەتیدەری دووگیانی و زاوزێ، منداڵدانی جێگرەوە لە شێوەی جێگرتنەوەی ڕێژەیی و لە دۆخێکی ناپاساییدا لە وڵاتە جۆربەجۆرەکاندا هەبووە. مامۆستایەکی زانکۆی لیدز بە ناوی (بویس)* لە ساڵی ١٩٧٤دا ڕایگەیاند، پاش سێ جار تاقیکردنەوە توانیویەتی سێ پزی مرۆڤ لە دەرەوەی منداڵدان و لە تاقیگەدا بەرهەم بهێنێت و پاشان بیانخاتە ناو منداڵدانی ئافرەتانەوە و لەم ڕێگەیەوە سێ منداڵ لە دایک ببن. (سەرکەوت، ١٣٩٣، ٨٩) لە ساڵی ١٩٧٧دا یەکەمین گرێبەستی منداڵدانی جێگرەوەی ڕێژەیی داڕێژرا. ئەو گۆڕانکارییەی بە هۆی لەدایکبوونی یەکەمین منداڵی تاقیگەییەوە لە ساڵی ١٩٧٨دا درووست بوو، بووە هۆی ئەوەی یەکەمین شێوازی منداڵدانی جێگرەوەی تەواوەتی لە ڕێگەی پیتاندنی سپێرم و هێلکۆکەی هەردوو ژن و پیاوەوە پێکەوە، لە ساڵی ١٩٨٥دا جێبەجێ بکرێت. (یوسری و الحسنی، ١٣٨٦) لە فینلەندا، یۆنان و ئێرلەندا بەکارهێنانی

---

* Douglas Bevis

منداڵدانی جێگرەوە هیچ یاسایەکی تایبەتیی نییە. (رحیمی، ١٣٨٧، ١٧٩) ئەم شێوازە لە نەمسا، نەرویج، ئەڵمانیا، فەرەنسا و سوید نایاساییە و لە بەریتانیا، دانیمارک، هۆڵەندا و ئوسترالیاشدا تەنیا لەڕووی بازرگانییەوە قەدەغەیە.

لە ئیسپانیا، بۆ ئەوەی بنەماڵەی پاشایەتی بەردەوام بێت، پێویست بوو پاشا منداڵێکی کوڕی ببێت. ئەگەر هاتبا و شاژن منداڵی کوڕی نەبوایە، پاشا ئەوەندە ژنی دەهێنا تاوەکوو منداڵێکی کوڕی دەبوو. پاش لەدایکبوونی منداڵەکەش، هەموو ئەو ژنانەی پاشا هێنابوونی، وەکوو بەخێوکاری منداڵانی بنەماڵەی پاشایەتی لە قەڵەم دەدران. پاشان لە بەردەم جەماوەردا وا ڕادەگەیەنرا، کە منداڵە کوڕەکە هی شا و شاژنە و ئیتر ناسنامەی دایکە ڕاستەقینەکەی ون دەکرا. ئەنجامدانی زاوزێی جێگرەوە بەو شێوازەی لە ئێستادا دەکرێت، واتا دانانی هێلکۆکەی پیتێنراوی ژنومێردێک لەناو منداڵدانی ئافرەتێکی دیکەدا و پاش لەدایکبوونی، گەڕاندنەوەی منداڵەکە بۆ باوانە ڕاستەقینەکەی، بۆ یەکەمین جار لە کۆتاییەکانی دەیەی حەفتای سەدەی ڕابوردوو لە ئەمەریکا جێبەجێ کراوە. (سەرکەوت، ١٣٩٣، ٨٩) ئەم کارە ئەنجامی چالاکییەکانی بریکارێک بوو بە ناوی نوئێل کیل لە ئەمەریکا. ئەم کەسە چەندان دامەزراوەی جۆربەجۆری دامەزراند، کە بە پێی یاسای منداڵدانی جێگرەوە لە ئەمەریکا کاریان دەکرد. ئەم دامەزراوانە تاوەکوو ئێستا نزیکەی سی هەزار منداڵیان لە ڕێگەی منداڵدانی جێگرەووەوە بەرهەم هێناوە.

یەکەمین گرێبەستی پێدانی پارە بۆ جێبەجێکردنی پرۆسەی زاوزێ بە ڕێگەی منداڵدانی جێگرەوە بۆ ئەو ئافرەتەی ئەم کارە دەکات، لە ساڵی ١٩٨٠دا لە ئەمەریکا کرا. لە ئەنجامی بەستنی ئەم گرێبەستەدا ئافرەتێکی ٣٧ ساڵە، بە ناوی خوازراوی (ئیلیزابێس بەککین) لە بەرانبەر دەهەزار دۆلاردا ڕازی بوو بەوەی وەکوو دایکی جێگرەوە بێت. ئەنجامی ئەم سکپڕییە، لەدایکبوونی منداڵێکی کوڕ بوو کە پاش لەدایکبوونی گەڕێنرایەوە بۆ دایکوباوکە ڕاستەقینەکەی.

لە دەستووری ئێراندا بە پێی یاسای (شێوازی پێشکەشکردنی کۆرپەلە بە ژنومێردی نەزۆک) کە لە ١٣٨٢/٤/٢٩ پەسەند کراوە و ڕێنمایی جێبەجێکردنی یاساکە لە بەرواری ١٣٨٣/١٢/١٩ چارەسەری نەزۆکیی بە ڕێگەی کۆرپەلەی درووستبوو لە تۆوی مێرد و هێلکۆکەی ژنەکەی و گواستنەوەی بۆ منداڵدانی ئافرەتێکی دیکە بە ڕێگەپێدراو زانیوە. بە پێی ماددەی یەکی ئەم یاسایە، هەموو ناوەندە پسپۆڕییەکانی چارەسەری نەزۆکی، دەتوانن بە ڕەچاوکردنی بنەما شەرعییەکان و مەرجەکانی ناو یاساکە کاری گواستنەوەی کۆرپەلە پیتێنراوەکان بە واژووی ژنومێردی یاسایی و شەرعی، کە بە پێی ڕاپۆرتی پزیشکی، نەزۆکییان پشتڕاست کرابێتەوە، بۆ منداڵدانی ئافرەتێک بگوازنەوە، کە شووی کردبێت و شیکاری تەندرووستیی بۆ کرابێت. ئەم ناوەندانە دەتوانن پاش واژووی نووسراوی ژنومێردی نەزۆک و وەرگرتنی نووسراوی ڕێگەپێدانی دادگا لەبارەی وەرگرتنی کۆرپەلەوە لە لایەن ژنومێردی وەرگرەوە،

بە پێی ماددەی (٢ و ٤ی یاساکە و ٣ تا ٥ی ڕێنماییەکە، چارەسەری نەزۆکییەکە بکەن. (قاسمزادە، ١٣٨٧، ١٨٢) یاساداڕێژەرانی ئێران لەم یاسایەدا تەنیا یەک چارەسەری نەزۆکییان باس کردووە و خۆیان لە حاڵەتەکانی تر، بە تایبەت بەکارهێنانی منداڵدانی جێگرەوە، بواردووە.

## منداڵدانی جێگرەوە و فەلسەفەی مۆڕاڵ

شێوازەکانی چارەسەرکردنی نەزۆکی و زاوزێ، گۆڕانکارییەکی گەورەی لە لێهاتوویی مانەوەی نەوەکان و خێزانە نەزۆکەکاندا درووست کردووە. بەڵام ئەم پێشکەوتنە زانستییەش هاوشێوەی هەر پێشکەوتنێکی نوێی پزیشکی، پرسیارگەلێکی جۆربەجۆری لەبارەی درووستی و نادرووستیی مۆڕاڵیانەوە هێناوەتە پێشەوە. لێکۆڵینەوەی مۆڕاڵییانەی ئەم جۆرە دووگیانی و زاوزێیانەی کە لە ڕێگەی تەکنەلۆژیای نوێوە دەکرێن، لە ڕیزی گرنگترین باسوخواسەکانی (مۆڕاڵی زیندەزانی)دا لە قەڵەم دەدرێن. یەکێک لە مەسەلە گرنگە مۆڕاڵییەکان، کە لە پرۆسەی دایکی جێگرەوەدا گفتوگۆی لەبارەوە دەکرێت، پاراستنی شکۆ و کەرامەتی مرۆڤانەیە. شکۆی مرۆیی، کە سەرچاوەی بنەمای ئازادیی تاکەکەسییە، یەکێکە لە چوار بنەما سەرەکییەکەی مۆڕاڵی زیندەیی. هەر

یەکێک لە ڕۆڵەکانی مرۆڤ بە پێی مرۆڤبوونی، مافی سرووشتیی خۆیەتی، کە ڕێز لە کەرامەتی مرۆڤانەی بگیرێت و هەروەکوو کانت دەڵێت: پێویستە ئامانجی باڵا بێت و بە هیچ شێوەیەک وەکوو ئامرازێک بە کار نەهێنرێت. ئەگەر ڕێنماییی پێویست لەم بارەیەوە بەو کەسانە بدرێت، کە بە هەر شێوەیەک بێت لەم پرۆسەیەدا بەشدار دەبن، وا دەکات ڕێز لە مافی سەربەخۆبوونیان بنرێت و بە ئازادی و هۆشیاریی تەواو لەبارەی ئەم شێوازەوە، بەرپرسیاریەتییەکان قبووڵ بکەن و ئاستی بەڵێنەکانیان لە گرێبەستەکاندا بەرز بکەنەوە. یەکێکی تر لە بنەما مۆراڵییەکان، دەستەبەرکردنی سوود و دوورخستنەوەی زیانە لەو کەسانەی لەم پرۆسەیەدا بەشداری دەکەن. بۆ ئەم کارەش پێویستە بەر لە دەستپێکردنی پرۆسەی پێگەیاندنی کۆرپەلە، لە نەخۆشییەکانی ئافرەتی جێگرەوە و ئەگەری بوونی ڤایرۆسی ئایدز و هیپاتیت و هاوشێوەکانی لە جەستەی ژنومێردی یەکەم بکۆڵرێتەوە. چاودێریی پێویست لە ماوەی دووگیانی بۆ ئافرەتەکە بکرێت و تەمەنێکی دیاریکراویش بۆ ژن و مێردی یەکەم دابنرێت، بۆ ئەوەی لەکاتی خۆیدا هەوڵی منداڵبوون بدەن و لەوەش دڵنیا ببینەوە کە ماوەی دووگیانی بۆ ئافرەتی جێگرەوە زیانێکی ئەوتۆی نابێت، پێویستە لە لایەنی ڕۆحی و دەروونییشەوە ئامادە بکرێت. لایەنێکی دیکەش هەیە، کە پێوەستە بە ڕێگریکردن لە زیانگەیاندن بە منداڵەکە، ئەویش بریتییە لە شوناسی منداڵە لەدایکبووەکەی ئەم ڕێگایە. مادام ئەم ڕێگایە لە ڕووی کولتوورییەوە جێگەی نەگرتووە و لە ڕووی

کۆمەڵایەتییشەوە هەندێک لە خێزانەکان تەنیا یەک منداڵیان هەیە. بۆ ئەوەی منداڵ لە شۆک بە دوور بێت، پێویستە لە ماڵێکی تەواو و چەندکەسیدا ڕێگە بە جێبەجێکردنی ئەم کارە بدرێت. هەروەها نابێت ڕێگە بە دایکی جێگرەوە بدرێت، کە منداڵەکە بدات بە ژنێکی بێپیاو یان پیاوێکی بێژن. (اصغری، ١٣٨٧، ٣٥).

بەکارهێنانی ئابوورییانەی دایکی جێگرەوە، دەبێتە هۆی ئەوەی وەکوو ئامرازێک سوود لە مرۆڤ وەربگیرێت، تا هەندێک کەس لە ڕێگەی ئافرەتانی هەژارەوە سەرمایە کۆ بکەنەوە، بە تایبەت لە کۆمەڵگەکانی جیهانی سێهەمدا، کە بنەمای دادپەروەری پشتگوێ دەخرێت و دەوڵەمەندانی چاوچنۆک سوودی لێ دەبینن و وەکوو کارێکی بازرگانی مامەڵەی لەگەڵدا دەکەن. "لەم حاڵەتەدا دایکی جێگرەوە لە بەرانبەر وەرگرتنی بڕێک پارەدا لە ژن و مێردێکی نەزۆک، ڕۆڵی دایک دەبینێت. مەخابن، لە وڵاتی ئێمەدا زۆربەی نموونەکانی منداڵدانی جێگرەوە لە جۆری منداڵدانی جێگرەوەی بازرگانین." (آرامش، ١٣٨٧، ٣٧) ئەم کارە لە چەند ڕوویەکەوە نامۆڕاڵییە: (یەکەم)، جۆرێک مامەڵەی قازانجویستییە لە بەکارهێنانی دایکی جێگرەوەدا؛ (دووەم)، فرۆشتنی ئەو شتەی کە لە ڕووی کەرامەتی مرۆییەوە قابیلی فرۆشتن نییە؛ (سێیەم)، ڕەتکردنەوەی پێشکەشکردنی مرۆڤدۆستانە. بنکە و دەلاڵەکانی دایکی جێگرەوەش گوڕی زیاتر بە سوودوەرگرتنی نامرۆییانە لەم پرۆسەیەدا دەبەخشن، بۆیە دەبێت ڕێگە بە دامەزراندنی هەر جۆرە بنکە و دامەزراوەیەک نەدرێت، کە ئامانجی ناساندن و

ئامادەکردنی ئافرەتی جێگرەوە بێت بۆ کردنی کاری دووگیانی بۆ ژنومێردێکی نەزۆک. لە ئێستادا تا ڕادەیەکی زۆر کۆڕاییەک لەبارەی قەدەغەبوونی جێگرەوەی بازرگانییەوە هەیە. هەر چەندە قەدەغەکردنی ئەم ڕێگایەش هەندێک سەرئەنجامی نەخوازراوی دەبێت، بەڵام گرفتە مۆڕاڵییەکانی شێوازی منداڵدانی جێگرەوەی بازرگانی لە چاو سوودەکانی زۆر زیاترن، چونکە لەپێناو دابینکردنی بژێویدا لە لای ئەو خێزانانەی بە دەست هەژاری و ئالوودەبوون بە ماددەهۆشبەرەکانەوە دەناڵێنن، زۆر بە ئاسانی ملیان بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە داوە و تەندرووستی و سۆزی خۆیان لە بەرانبەر پارەیەکی کەمدا گۆڕیوەتەوە کە زۆر جار ئەو ئافرەتانە خۆشیان مافی خەرجکردنی پارەکەیان نییە. بێ گومان ڕازیکردنی ئەم جۆرە ژنانە بۆ ئەوەی منداڵدانیان بە کار بهێنرێت، بە توندی ڕەت دەکرێتەوە. لە ڕەزامەندیی هۆشیارانەدا سێ لایەنی گرنگ هەن، ئەوانیش بریتین لە: شیاوێتی، بەئاگابوون لە ناوەڕۆکی کارەکە و ئازادی. ڕەگەزی یەکەم (شیاوێتی) لەو سۆنگەیەوە کە تەنیا لەناو ئافرەتانی باڵغ و پێگەیشتوودا دەکرێت، لە بەرچاو ناگیرێت و وە لاوە دەنرێت، بەڵام دوو ڕەگەزەکەی تر بۆ گونجاوبوونی ئەم کارە بەئاگابوون و ئازادیی ئافرەتەکەن، کە دەبێت لە بەرچاو بگیرێن. ڕەگەزی بەئاگابوون جەخت لەوە دەکاتەوە کە هەردوو لا ئاگاداری هەموو ئەو وردەکارییانە بن کە کاریگەرییان بەسەر بڕیاردانیانەوە بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە دەبێت. مادام ئەگەری ئەوەش دێتە ئاراوە کە سوودە پزیشکییەکانی ئەم ڕێگایە تا چ

ڕاددەیەک بۆ لیژنەی پزیشکی بێت، کە واتە وا باشترە لە تیم یان کەسێکی بێلایەنی شارەزا ڕاوێژ وەربگیرێت. هەروەها پێویستە ماوەیەکی گونجاو بە هەردوو لا بدرێت، تاوەکوو خۆیان یەکلایی بکەنەوە. ڕەگەزی سێیەم، بریتی بوو لە ئازادیی دایکی جێگرەوە بۆ قبوولکردنی ئەم بەرپرسیاریەتییە. لەوانەیە خزمە نزیکەکانی ژنومێردی نەزۆک، بە تایبەت دایک و خوشکی هەردوو لا، هەست بە جۆرێک (زۆرلێکردنی مۆڕالی) بکەن، کە خۆیان ناچار کردبێت لەپێناو یارمەتیدانی ئەواندا بۆ کردنی ئەم کارە ڕازی بن. جا بۆ ئەوەی هەردوو لا لە زانیارییەکانی بەردەستیان دڵنیا بن و هەست بە هیچ جۆرە زۆرلێکردنێک نەکەن، پێویستە دەستەی مۆڕاڵیی سەربەخۆ پێک بهێنرێت کە پرۆسەکە بە تەواوەتی لە ئەنجامدەرانی جیا بێت و چاودێریی کارەکانیان بکات. پێویستە دەستەی مۆڕالی لەوە دڵنیا بێتەوە، کە خەرجییەکان تەنیا لە ئاستی قەرەبووکردنەوەی خەرجی دەرمان و چاودێرییەکاندا بێت. بە هیچ شێوەیەک جۆرێک هاندانی بۆ بەشداریکردن لەم پرۆسەیەدا پێوە دیار نەبێت. (اصغری، ١٣٨٧، ٣٣).

منداڵدانی جێگرەوە تەنیا لە کاتێکدا لە ڕووی مۆڕالییەوە پەسەندە، کە لە ڕووی هەستی مرۆڤدۆستانەوە بکرێت. هەڵبەت بە لەبەرچاوگرتنی قەرەبووکردنەوەی ئەو خەرجییانەی دایکی جێگرەوە تا کۆتایی دووگیانییەکە، کارێکی مۆڕالی دەبێت. ئەم خەرجییانە بریتین لە خەرجییە پزیشکییەکان، چارەسەرکردنی کاریگەرییەکانی دووگیانی و لەدایکبوون، لەگەڵ

قەرەبووکردنەوەی ئەو داهاتەی دایک، کە بە هۆی دواکەوتنی لە کار و کەسابەت یان نەتوانینی لە چوونەسەرکار تووشی بووە. لە ڕووی مۆڕاڵییەوە، پێویستە ئەو ئافرەتانەی دەیانەوێت ڕۆڵی دایکی جێگرەوە بگێڕن، لە ژیانیاندا تەنیا یەک جار ئەم کارە بکەن، مەگەر لە جاری دووەمیشدا بۆ هەمان ژنومێردی یەکەم جار دووگیانییەکە دووبارە بکاتەوە، چونکە لەم حاڵەتەدا ئەگەری سوودوەرگرتنی نامرۆڤانە کەم دەکرێتەوە و ڕێگەش بە دووبارەکردنەوەی دووگیانیی مرۆڤدۆستانە نادرێت، لەبەر ئەوەی باری جەستەیی و دەروونیی دووگیانییە یەک-لەدوای-یەکەکان ئەوەندە زەحمەتە کە ڕێگە بە دووبارەکردنەوەیان نادرێت. (آرامش، ١٣٨٧، ٤٥) لە هیندستاندا کردنی ئەم کارە تا سێ جار ڕێگەپێدراوە، ئەگەر بێت و بەستێنێکی کولتووری-کۆمەڵایەتیی گونجاو بۆ ئەم کارە بسازێنرێت و ڕێگە لە جیابوونەوەی ژنومێردی نەزۆک بگیرێت  ومنداڵێکیان پێ ببەخشرێت، بێ گومان منداڵدانی جێگرەوەش وەکوو بەخشینی خوێن و ئەندامێکی جەستە وایە و بە کارێکی مرۆڤدۆستانە لە قەڵەم دەدرێت. (آخوندی و بهجتی اردکانی، ١٣٨٧، ٩). ئەگەر کردنی ئەم کارە لە گۆشەنیگایەکی مرۆڤدۆستانەوە بۆ سەرچاوەیەکی بەدەستهێنانی سامان بگۆڕرێت، ئەوا دەبێتە هۆی پێشێلکردنی ڕەهەندی مۆڕاڵیی کارەکە. یەکێکی دیکە لەو دڵخورتییە مۆڕاڵییانەی پێوەندیی بە ڕێز و کەرامەتی مرۆڤەوە هەیە، بەکارهێنانی دایکی جێگرەوەیە بۆ درووستکردنی لێکچووی مرۆڤەکان (هاوشێوەسازی) یان دەستکاریکردنی

شریتی بۆماوەیی (DNA). یەکێکی دیکە لە دڵخورتییەکان ئەگەری بەکارهێنانی ئەم ڕێگەیەیە لە لایەن ئەو ژنومێردانەی کە خۆیان توانی منداڵبوون و دووگیانییان هەیە، بەلام بە هۆی هەندێک لایەنی کۆمەلایەتی یان بۆ دوورکەوتنەوە لە ئازار و کاریگەرییە جەستەییەکانی دووگیانی، نایانەوێت خۆیان منداڵیان ببێت.

## ڕوانگە مۆڕاڵییەکان لەبارەی دووگیانییەوە بە شێوازی منداڵدانی جێگرەوە

هەروەک بینیمان، پێناسەی جیاواز لەبارەی دووگیانی و زاوزێوە بە شێوازی منداڵدانی جێگرەوە بوونی هەیە. شتێکی ڕوونە کە مەبەستی ئێمە لەم شێوازەدا دەگەڕێتەوە بۆ دووگیانی بە شێوازی دایکی جێگرەوەی دووگیانی*، کە لەم پرۆسەیەدا هێلکۆکە و سپێرمی ژنومێردێک لە تاقیگەدا دەپیتێنرێن و پاشان لە منداڵدانی ئافرەتێکی تردا کە ئامادەگییەکی گونجاوی بۆ ئەم کردارە هەیە، جێگیر دەکرێت. کاتێک ئەم بابەتە لە ڕووی مۆڕاڵییەوە هەڵدەسەنگێنین، تێبینی ئەوە دەکەین کە هاوشێوەی زۆربەی دیاردە و شێوازە نوێیەکانی بواری پزیشکی، ئەم

---

* Gestational Surrogate Mother

ڕێگایەش لایەنگر و نەیاری هەیە و ئێمەش لە خوارەوە خاڵە گرنگەکانی شەنوکەو دەکەین.

## لایەنگرانی دایکی جێگرەوە

لایەنگرانی مەسەلەی دایکی جێگرەوە لەو بڕوایەدان، کە ئەو نیگەرانییانەی لەم بارەیەوە دەخرێنە ڕوو، لە ڕاستییەوە دوورن و تەنیا لە زەین و بیری ئەواندا بوونیان هەیە و هیچ پێوەندییەکیان بە ئامادەکارییەکان و دەستەبەرکردنی دایکی جێگرەوەوە نییە، چونکە لە سەردەمی ئێستاشدا ڕاستییەکە پێچەوانەی بانگەشەکانی ئەوانە. ئەوانەی پشتیوانی لە دایکی جێگرەوە دەکەن، پێیان وایە بە هیچ شێوەیەک منداڵی پەیدابوو لە ئەنجامی ئەم پڕۆسەیەوە زیانی پێ ناگات. بۆ نموونە، لەبارەی مافەکانی دووگیانی و زاوزێوە وەکیل مۆری ئەندرۆو، پێی وایە ئەو دایکە جێگرەوانەی قسەی لەگەڵدا کردوون، هەموویان پێیان ڕاگەیاندووە کە گرنگییەکی زیاتر بە دووگیانییە جێگرەوەکەیان دەدەن لە چاو دووگیانیی خۆیاندا، چونکە منداڵی کەسێکی دیکەیان هەڵگرتووە.

هەڵبەت دایکی جێگرەوەش سوودمەندی یەکەمی پڕۆسەی ئامادەکردنی منداڵدانی جێگرەوەیە. لایەنگرانی دایکی جێگرەوە بڕوایان وایە بە پێچەوانەی ئەو لێدوانە نامەیدانییانەی لەم بوارەدا پێشکەش دەکرێن، زۆربەی دایکانی جێگرەوە پارەی

پێویستیان بۆ دابین دەکرێت و بە شێوازێکی ورد لە بێژنگ دەدرێن و ژنگەلێکی بەئاگان، کە حەز دەکەن ئەو خزمەتەی لەبارەی زاوزێوە دەیکەن، بیفرۆشن یان بیبەخشن بەو ژنومێردەی لەگەڵیاندا ڕێک دەکەون. لایەنگری ئەم کارە بڕوایان وایە بە هیچ شێوەیەک لە نێوان ژناندا بۆ کردنی ئەو کارە جیاکاری ناکرێت. بەڵگەی پێویست لە بەردەستدایە کە ئامادەکارییەکانی منداڵدانی جێگرەوە دەتوانێت ئافرەتان لێکدی نزیک بکاتەوە، یان تەنانەت کاریگەریی زۆر لەوە گەورەتریشیان بەسەرەوە بە جێ بهێڵێت. بۆ نموونە: دەروونناسێک بە ناوی هێلاری نافین، توێژینەوەیەکی لەسەر دووهەزار ژنومێرد و دووهەزار دایکی جێگرەوەوە کردووە. تێبینیی ئەوەی کردووە کە ئەو ئافرەتانەی دایکی ڕەسەنی منداڵەکەن و خەریکی دەوام و کاری تایبەتن، لە دایکانی جێگرەوەوە فێری هەندێک لایەنی بەخێوکردن و پەروەردەکردنی منداڵ دەبن و کاتێک منداڵەکەیان بۆ دەگەڕێنرێتەوە، کەمتر سەرقاڵی کار و دەوامەکەیان دەبن. لە لایەکی تریشەوە، دایکانی جێگرەوە دەکەونە ژێر کاریگەریی ژنانی نەزۆکەوە و ئاسۆی هزریی خۆیان فراوان دەکەن و زۆربەیان پاش تەواوبوونی ماوەی دووگیانی، درێژە بە خوێندن دەدەن یان لە کارەکانیاندا پێشکەوتنی بەرچاو بە خۆوە دەبینن. (سەرکەوت، ١٣٩٣، ٩١) هەروەها ئەم کارە لە ژیانی ژنومێردی نەزۆکیشدا دەبێتە هۆکاری پتەوکردنی پێوەندییەکانیان و ڕێژەکانی جیابوونەوە لە ژنومێردە نەزۆکەکاندا زۆر کەم دەکاتەوە.

١. ئەم کارە یارمەتیی چارەسەرکردنی گرفتێکی گەورە دەدات کە بە نەزۆکی ناو دەبرێت، چونکە بەشێک لەو ژنومێردانەی بە هۆی منداڵدانی ژنەکەوە یان بە هۆی نەخۆشیی جەستەییەوە نەیانتوانیوە ببنە خاوەنی منداڵ، توانیویانە لەم ڕێگایەوە منداڵیان ببێت؛

٢. ئەم کارە لە ڕوانگەی مۆڕاڵی، یاسایی، شەرعی و عورفییەوە قبووڵ کراوە؛

٣. منداڵی لەدایکبووی ئەم ڕێگەیە بە پێچەوانەی هەڵگرتنەوەی منداڵ یان وەرگرتنی سپێرم و هێلکۆکەی کەسانی دیکەوە، لە ڕووی بۆماوەییەوە بە تەواوی بۆ دایکوباوکی ڕاستەقینەی دەگەڕێتەوە؛

٤. دایکانی پێشکەشکاری منداڵدانی جێگرەوە، بە ویست و هۆشیاریی خۆیان مل بۆ ئەم کارە دەدەن، ئەگەر بێت و بڕە پارەیەکیش لە بەرانبەر ئەم کارەدا وەربگرن، بە پێی ڕێککەوتنێکی پێشوەختە دەبێت، کە دەکرێت زۆر دادپەروەرانەش بێت. تەنانەت بڕە پارەی وەرگیراو لە وڵاتی جیهانی سێهەمیشدا تا ڕاددەیەکی زۆر دادپەروەرانەیە و بڕێکی باشیش دەبێت؛

٥. زۆربەی ئەو ئافرەتانەی منداڵدانیان بۆ ئەم کارە بە کار دەهێنن، هەست بە پەشیمانی ناکەن. لە توێژینەوەیەکدا کە لە لایەن هێلاری هانافینەوە لەسەر دووهەزار ژنومێردی داواکار و ئافرەتانی خاوەن منداڵدان کراوە، بۆی دەر کەوتووە هەردوو لا پێوەندییەکی گونجاویان لەگەڵ یەکتردا هەبووە و لە زۆربەی

حاڵەتەکانیشدا، دایکانی خاوەن منداڵدان هیچ گرفتێکی ڕۆحییان لەوەدا نەبووە، کە منداڵەکە بۆ باوانی خۆی بگێڕنەوە؛

٦. یاسا و مادده قبووڵکراوەکانی زۆربەی وڵاتان، لە نێویشیاندا وڵاتی ئێران، زۆربەی لایەنە گوماناوییەکانی ئەم کارەیان ڕۆشن کردووەتەوە، لەوانەش: پەشیمانبوونەوەی هەردوو لا لە ئەنجامدانی کارەکە، پێنەدانی منداڵەکە لە لایەن دایکی جێگرەوەوە، گرنگینەدانی دایکی جێگرەوە بە تەندرووستیی کۆرپەلە، مردن یان جیابوونەوەی ژنومێردی خوازیاری منداڵ و چەندان شتی دیکەی لەم شێوەیە لەپێشدا خراونەتە بەر باس و پێشبینییان کراوە و لە ڕێگەی وەرگرتنی ڕاوێژە یاسایی و مۆڕاڵی و پزیشکییە پێویستەکانەوە لەکاتی نووسینی ڕێککەوتنەکەدا لە بەرچاو گیراون و لەکاتی جێبەجێنەکردنی ڕێککەوتنەکە لە لایەن هەر یەکێکیانەوە، بە یاسا لێپرسینەوەیان لەگەڵدا دەکرێت؛

٧. هەروەها بە پێی یاسا گومانی ئەوەش ڕەوێنراوەتەوە، کە منداڵی پەیدابوو لەم کارە هی ئافرەتی خاوەند هێلکۆکەیە یان ئەو ئافرەتەی هیلکۆکە و سپێرمی پیتێنراو لە ناو منداڵدانیدا جێگیر کراوە، چونکە لەکاتی پڕکردنەوەی ناسنامەی منداڵەکەدا پێویست بەوە دەکات ناوی دایکی منداڵەکە بنووسرێت؛

٨. هەر وەک پێشتریش ئاماژەمان پێ کرد، ئەو ئافرەتانەی منداڵدانی خۆیان بۆ ئەم کارە بەخشیوە، بە خواست و ئارەزووی خۆیان ئەم کارەیان کردووە، بۆیە لە زۆربەی حاڵەتەکاندا لەکاتی گەڕاندنەوەی منداڵەکە بۆ باوانی، گرفتێکی ڕۆحیی زۆر

توندیان نەبووە. لە توێژینەوەی (٤٣) ژنومێرد و منداڵێکی بەدەستهاتوودا بەم ڕێگایە لە ئینگلتەرا، هیچ جۆرە دژایەتییەکی توند لە نێوان ژنومێردی داواکار و ئافرەتی جێگرەوەدا ڕووی نەداوە.

## نەیارانی بابەتی دایکی جێگرەوە

زۆربەی ئەو قسەوباسانەی دژی دایکی جێگرەوەن، لەسەر بنەمای کۆمەڵێک گومان دانراون، کە پێیان وایە ئەم کارە زیان بە دایکی جێگرەوە دەگەیەنێت. سەرەتا بانگەشەی ئەوە دەکرێت، کە لایەنی دەروونیی دایکی جێگرەوە زیان بە کۆرپەکە دەگەیەنێت. ڕەخنەگران پێیان وایە مادام دایکی جێگرەوە سکی بە منداڵێک پڕە، کە هی خۆی نییە و بۆ کەسانی ترە، لەوانەیە کەمتر ئارەزووی ئەوەی هەبێت لە ماوەی دووگیانییەکەدا تەندرووستیی خۆی یان تەندرووستیی کۆرپەلەکەی بپارێزێت. هەروەها کەمتر بە شێوازێکی سۆزداری لەگەڵ کۆرپەلەکەدا هەڵسوکەوت بکات، چونکە پێیان وایە خۆڕاگریی بەرانبەر ئازارەکانی دووگیانی زۆر زیاتر دەبێت. بە پێی یەکێک لەو توێژینەوانەی لەبارەی ڕابوردووی ژیانی دایکی جێگرەوەوە کراون، بۆیان دەر کەوتووە دوو لەسەر سێی کۆی (٤٣) ژنی جێگرەوە، هۆکارێک یان چەند هۆکارێکی مەترسیداریان پێش

منداڵبوون هەبووە: جگەرەکێشان، داهاتی کەم، سەڵتبوون و لێکچوونی سفر یان زۆرتر لە چوار.

لەمە خراپتر، ئەوەیە کە ئامادەکردنی دایکی جێگرەوە، پرۆسەی دووگیانی و زاوزێ دابەش دەکات و لە هەمان کاتیشدا جۆرێک تایبەتمەندیی پێ دەبەخشێت، واتا ژنان دەکات بە سێ بەشەوە: دایکانی بۆماوەیی، دایکانی زاوزێ و دایکانی پەروەردەکار. ڕەخنەگران پێیان وایە لە داهاتوودا هیچ دایکێک ناتوانێت لە یەک کاتدا هەم منداڵ بهێنێتە دنیاوە، هەم پەروەردەشی بکات. بەڵکوو ئەو ژنانەی لە ڕووی بۆماوەییەوە تواناترن، هەوڵ دەدەن تۆوەکان لە تاقیگەکاندا بەرهەم بهێنن، ئەو ژنانەیش لە ڕووی جەستەییەوە بەهێزترن، ئەم منداڵە بلوورییانە تا کۆتاییی ماوەی لەدایکبوون هەڵدەگرن و ژنانی نەرمونیانیش لەکاتی لەدایکبوونەوە تا گەورەبوون، پەروەردەکردنی منداڵەکە لە ئەستۆ دەگرن.

سەرەڕای ئەوەی ڕەخنەگران لە سوودوەرگرتن لە ژنان نارەحەتن، پێیان وایە منداڵیش لەم پرۆسەیەدا وەکوو کاڵایەک مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت. لە جێی ئەوەی ژنومێردی نەزۆک منداڵێک ببەنە ناو خێزانیانەوە و بەخێوکردن و پەروەردەکردنی لە ئەستۆ بگرن و قبووڵی نەزۆکبوونیان بکەن، لەسەر ئەوە سوورن کە لە هێلکۆکە و سپێرمی خۆیان منداڵێکیان ببێت، کە لە ڕووی بۆماوەییەوە هی خۆیان بێت. هەر بۆیە بۆ ئەم ئامانجە پارەیەکی زۆر دەدەن بۆ ئەوەی خاوەنی منداڵی خۆیان بن. هەندێ جاریش ئافرەتێک توانی سکوزای هەیە، بەڵام بۆ

ئاسایشی خۆی یان بە هۆی لووتبەرزییەوە، ژنانی دیکە بە کار دەهێنن، تاوەکوو مەترسییەکان و ناڕەحەتییەکانی دووگیانی لە کۆڵ خۆیان بکەنەوە. لێرەشدا هەوڵ دەدەین گرنگترین تێڕوانینەکان و هۆیەکانی دژایەتیکردنی منداڵدانی جێگرەوە بخەینە بەر باس:

١. ئەو کەسانەی گرنگیی بە بەهاکان، بنەماکان و پایەکانی خێزان لە ڕوانگەی کولتوورییەوە دەدەن، پێیان وایە ئەم کارە زیانێکی گەورە لە تێڕوانینی کولتوورییانەی خێزان و کۆڵەکە پێکهێنەرەکانی دەدات، کە پێوەندیی دایکانە و منداڵانەش یەکێکە لە کۆڵەکە گرنگەکانی؛

٢. هەندێکیش لەو بڕوایەدان ئەم کارە کاریگەریی خراپ دەکاتە سەر زڕمنداڵ. واتە بەشێکی زۆری ژنومێردە نەزۆکەکان لەجیاتی قبووڵکردنی منداڵێکی بێسەرپەرشتیار هەوڵ دەدەن ڕێگای دووگیانی جێگرەوە بە کار بهێنن، بۆیە بەشێکی زۆری منداڵە بێسەرپەرشتەکان لە ناوەندەکانی چاودێریی منداڵانی بێکەسوکاردا چانسی ئەوەیان لە دەست دەچێت، کە لە ئامێزی خێزانێکدا خۆیان ببیننەوە و بە زڕمنداڵ قبووڵ بکرێن؛

٣. هەندێکیش لە گۆشەنیگای فیمێنستیانەوە سەیری مەسەلەکە دەکەن. ئەمانە بڕوایان وایە برەودان بەم جۆرە سکوزایانە دەبێتە هۆی بەکارهێنانی ئافرەتان وەک ئامێری درووستکردنی منداڵ بۆ دەوڵەمەندەکان. ژمارەکیش تێڕوانینی توندتریان هەیە و ئەم کارە بە سووکایەتیکردن و بەکارهێنانی ئافرەتان لە لایەن دەوڵەمەندەکانەوە دەزانن.

٤. لەبەر ئەوەی تێچوونەکانی ئەم جۆرە دووگیانییە لە زۆربەی ولاتاندا زۆرە، (بۆ نموونە لە ئەمەریکا نزیکەی دەهەزار دۆلار بە دایکی جێگرەوە دەدرێت،) ژمارەیەک لە ژنومێردە خوازیارەکان ڕوو لە ولاتانی جیهانی سێیەم دەکەن، چونکە تێچووی ئەم کارە لە ولاتانی جیهانی سێیەمدا نزیکەی یەک لەسەر سێی تێچوویەتی لە ئەمەریکا و ئەورووپادا. بە ئەنجامگەیاندنی ئەم پرۆسەیە و بەکارهێنانی ژنانی ولاتانی جێهانی سێیەم، ئەگەری کەڵکوەرگرتنی نادادپەروەرانە و نێوەندگیریی دەلاڵەکان و درووستبوونی قەرەباڵغیی مرۆییی لێ دەکەوێتەوە. بۆیە پێویستە کۆنترۆڵ و سنووردار بکرێت؛

٥. هەندێکی تریش لەو بڕوایەدان سوودوەرگرتن لە منداڵدانی جێگرەوە لە ڕووی کولتوورییەوە، هێشتا بە باشی جێی خۆی نەکردووەتەوە. لە لایەکی تریشەوە، لە ڕووی پزیشکییەوە ئەگەری گواستنەوەی هەندێک نەخۆشیی وەک ئایدز و هیپاتیت لە ڕێگەی دایکی جێگرەوەوە بۆ کۆرپەلە یان گواستنەوەی هەندێک نەخۆشیی ژنومێردی نەزۆکەوە بۆ دایکی جێگرەوە هەیە؛

٦. بابەتێکي تر کە لە باسی دژایەتیکردنی ئەم کارەدا دەخرێتە ڕوو، دەگەڕێتەوە بۆ خواستەکانی ژنومێردی خوازیار، چونکە پێشبینیی ئەوە دەکرێت پاش لەدایکبوونی منداڵەکە، ژنومێردەکە منداڵەکەیان بەو شێوازەی لە خەیاڵیاندا بووە، نەیەتە بەرچاو، یان لە ڕووی تەندرووستییەوە منداڵەکە گرفتی هەبێت، بۆیە لە

قبووڵکردنی منداڵەکە یان پێدانی پارەی دیاریکراو بۆ دایکی جێگرەوە پەشیمان ببنەوە؛

٧. هەندێکیش ئەگەرێکی دوولایەنە لە دژایەتیکردنی ئەم کارەدا دەخەنە ڕوو؛ ئەگەری یەکەم، بۆ چییەتیی ئەم شێوازە دەگەڕێتەوە، کە لەوانەیە ببێتە هۆی سوودوەرگرتنی نادادپەروەرانە لە ژنانی هەژار و خستنەژێرپێی کەرامەت و شکۆی مرۆیی و ئازادییان لێ زەوت بکات. ئەگەری دووەم، ئەوەیە کە پێدەچێت هەندێک لە دایکانی جێگرەوە خواستی نوێ بخەنە بەردەستی ژنومێردی خوازراوی منداڵ، بە شێوەیەک لە ڕێککەوتنەکەی نێوانیاندا ئاماژەی پێ نەکرابێت، وەکوو داواکردنی پارەی زیاتر لە ژنومێردەکە و هەڕەشەی لەباربردنی کۆرپەلە لە ئەنجامی پێنەدانی پارەکە یان پاش لەدایکبوون، منداڵەکە بۆ دایکوباوکی ڕاستەقینەی نەگەڕێنرێتەوە؛

٨. هەر وەکوو پێشتریش ئاماژەی پێ درا، بە هۆی کێشەکانی دایکی جێگرەوەوە ڕێگە و شێوازێکی نوێ بێتە کایەوە، کە بە پێی ئەم شێوازە ئەو ژنانەی لە ڕووی بۆماوەییەوە بەهێزترن، تەنیا هێلکۆکە ببەخشن و پاشان لە تاقیگەدا ئەم هێلکۆکەیە لەگەڵ سپێرمێکدا بپیتێنرێت و کۆرپەلەیەک بێتە بوون، ئەم کۆرپەلەیەش لە منداڵدانی ئافرەتێکدا جێگیر بکرێت، کە توانی جەستەیی زیاتری هەیە و بەرگەی نارەحەتییەکانی سکوزا زیاتر دەگرێت. لە کۆتاییشدا منداڵە لەدایکبووەکە بدرێتە دەست ئافرەتانی خۆشڕەفتار و نەرمونیان، تاوەکوو پەروەردەکردن و گەورەکردنیان لە ئەستۆ بگرن. (هەمان سەرچاوە، ٩٢-٩٩) ئەم

کاره خۆی له خۆیدا له ڕووی دەروونییەوە زیانێکی گەورە لە کەسایەتیی سەربەخۆی منداڵ و مافەکانی دەدات، لە هەمان کاتیشدا زیانێکی زۆر لە ڕەسەنایەتیی پێوەندیی دایک و منداڵ دەدات و چەمکی دایکایەتی خەوشدار دەکات.

# لیستی سەرچاوەکان

## الف) منابع فارسی:

١. آخوندی ،محمد مهدی، بهجتی اردکانی زهره (١٣٨٢،) ضرورت بررسی ریشه‌ای ابعاد متنوع ابعاد سقط جنین در ایران. ضمیمه فصلنامه باروری و ناباروری، چکیده مقالات، سمینار بررسی جامع ابعاد سقط جنین در ایران، پژوهشکده ابن سینا؛

٢. اسلام تبار، شهریار، الهی منش، محمدرضا، (١٣٨٦،) مسائل اخلاقی در قتل ترحم آمیز، تهران، مجد؛

٣. اسلامی، محمد تقی؛ دبیری، احمد؛ علیزاده، مهدی و همکاران (١٣٨٦،) اخلاق کاربردی چالشها و کاوشهای نوین در اخلاق عملی، قم، انتشارات پژوهشگاه علوم و فرهنگ اسلامی؛

٤. اعتمادیان، محمود ناصرالدین (١٣٤٢،) اخلاق و آداب پزشکی، تهران، انتشارات دانشگاه تهران؛

۵. اوزمن، هوارد، کراور، سموئل. ام (۱۳۷۹، فلسفه تعلیم و تربیت. ترجمه گروه علوم تربیتی. تهران، انتشارات مؤسسه آموزشی و پژوهشی امام خمینی (ره)؛

٦. باقری، خسرو (۱۳۸۷، مبانی شیوه‌های تربیت اخلاقی (نقد تطبیقی علم اخلاق و روانشناسی معاصر،) تهران، مرکز چاپ و نشر سازمان تبلیغات اسلامي؛

۷. پنس، گرگوری ای، (۱۳۷۲، موارد کلاسیک در اخلاق پزشکی، ترجمه‌ای پژمان حبیبی، تهران، معاونت امور فرهنگی حقوقی و مجلس وزارت بهداشت و درمان و آموزش و پزشکی؛

۸. پیک حرفه، شیرزاد (۱۳۹۰، مرزهای اخلاق، تهران، انتشارات نشر نی؛

۹. جان رنلد، ویلیامز (۱۳۸۹، دستنامه اخلاق پزشکی، ترجمه، دکتر نازآفرین قاسمزاده، نریمان سپهروند، چاپ اول، تهران، انتشارات گپ؛

۱۰. جعفری، لطیف (۱۳۸٦، ضوابط اخلاقی در حرفه روان‌درمانگری، آستارا، انتشارات دانشگاه آزاد اسلامی آستارا؛

۱۱. خزائی، زهرا (۱۳۸۹، اخلاق کاربردی: ماهیت، روش-ها و چالش‌ها، در: جستارهایی در اخلاق کاربردی، قم، انتشارات دانشگاه قم؛

۱۲. داودی، محمد (۱۳۸۵، تربیت اخلاقی در سیره پیامبر (ص) و اهل بیت (ع.) جلد سوم، تهران، پژوهشگاه حوزه و دانشگاه؛

۱۳. دباغ، سروش (۱۳۸۸، درس گفتارهایی در فلسفه اخلاق، تهران، انتشارات مؤسسه فرهنگی صراط؛

۱٤. دیبایی، امیر (۱۳۸۱، چکیده اخلاق و قوانین پزشکی، قم، دفتر نشر معارف؛

۱۵. رزمساز، بابک (۱۳۷۹، بررسی فقهی-حقوقی سقط جنین، انتشارات خط سوم، چاپ اول؛

۱٦. زالی، محمدرضا (۱۳۸۷، مبانی نوین ارتباط پزشک و بیمار، نشر مؤسسه فرهنگی حقوقی سینا؛

۱۷. الستیر و کمپل (۱۳۷۲، معضلات اخلاقی پزشکی، ترجمه حسن میانداری، چاپ اول، نشر معاونت امور فرهنگی حقوقی و مجلس وزارت بهداشت و درمان و آموزش و پزشکی؛

۱۸. شریفی، احمد حسین (۱۳۸٤، آیین زندگی اخلاق کاربردی، قم، دفتر نشر معارف؛

۱۹. صفایی، سید حسین، امامی، اسدالله (۱۳۸۰، مختصر حقوق خانواده، تهران، نشر دادگستر؛

۲۰. عباسي، محمود (۱۳۸۳، حقوق پزشکی؛ مجموعه مقالات، انتشارات حقوقی، چاپ دوم، تهران؛

۲۱. عباسی، محمود (۱۳۸۲، حقوق پزشکی، پیوند اعضاء، تهران، نقش هزار رنگ؛

۲۲. فرانکنا، ویلیام کی (۱۳۷٦، فلسفه اخلاق، ترجمه هادی صادقی، قم، مؤسسه فرهنگی طه؛

۲۳. قرآن کریم؛

۲٤. قضایی، صمد (۱۳۷۳، پزشکی قانونی، انتشارات دانشگاه تهران، چاپ سوم؛

۲٥. کالینسون، دایانه (۱۳۸۰، پنجاه فیلسوف بزرگ، ترجمه محمد رفیعی مهرآبادی، تهران، عطایی؛

۲٦. کانت، ایمانوئل (۱۳٦۹، بنیاد مابعدالطبیعه اخلاق، ترجمه، حمید عنایت و علی قیصری، تهران، خوارزمی؛

۲۷. گنسلر، هری ج. (۱۳۹۰، درآمدی بر فلسفه اخلاق معاصر، ترجمه مهدی اخوان، تهران، نشر شرکت، انتشارات علمی و فرهنگی؛

۲۸. گوتک، جرالد. ال (۱۳۸٦، مکاتب فلسفی و آراء تربیتی. ترجمه محمد جعفر پاکسرشت، تهران، انتشارات سمت؛

۲۹. گودرزی، فرامرز (۱۳۷۰، پزشکی قانونی، انتشارات انیشتن، چاپ اول؛

۳۰. لاریجانی، باقر (۱۳۸۲، پیوند اعضا مباحث علمی اخلاقی حقوقی و فقهی، چاپ اول، تهران، انتشارات برای فردا؛

۳۱. لاريجاني، باقر (۱۳۷۸ش، نگرش جامع به پیوند اعضاء، چاپ اول، تهران، بنیاد امور بیماریهای خاص؛

۳۲. لاریجانی، باقر (۱۳۸۳، پزشک و ملاحظات اخلاقی ج۱، مروری بر مبانی اخلاق پزشکی، تهران، نشر برای فردا؛

٣٣. لاریجانی، باقر (١٣٨٣،) پزشک و ملاحظات اخلاقی ج٢ تصمیم‌گیری اخلاقی در موارد واقعی، مترجمان: دکتر علی جعفریان، دکتر علی کاظمیان، دکتر سید موسی صدر حسینی، دکتر علیرضا پارساپور، تهران، نشر برای فردا؛

٣٤. مانسن، رونالد (١٣٧٤،) مداخله و تأمل در اخلاق پزشکی ج١، مترجمان: فرامرز چمنی، اصغر ابوترابی، تهران، نشر مرکز مطالعه و تحقیقات اخلاق پزشکی؛

٣٥. مک اینتایر، السدر (١٣٧٩،) تاریخچه فلسفه اخلاق، ترجمه: انشاء الله رحمتی، تهران، انتشارات حکمت؛

٣٦. ملکیان، مصطفی (١٣٨١،) سخن مترجم در نگاه به فلسفه اخلاق در سده بیستم، ترجمه مصطفی ملکیان، تهران، دفتر پژوهش و نشر سهروردی، ١٥- ٩؛

٣٧. نایبزاده، عباس (١٣٨٠،) بررسی حقوقی روشهای نوین باروری مصنوعی، مادر جانشین، اهدای تخمک یا جنین، تهران، انتشارات مجد؛

٣٨. نلر، جی. اف (١٣٧٣،) آشنایی با فلسفه آموزش و پرورش، ترجمه فریدون بازرگان دیلمقانی، تهران، انتشارات سمت؛

٣٩. نوبخت، محمد (١٣٨٥،) شبیهسازی انسان؛ چیستی، کیفیت، بایدها و نبایدها، تهران، آموزش و پرورش استان تهران؛

٤٠. نوبخت، محمد، مرادی، احسان (١٣٨٧، ) شبیهسازی انسان از دیدگاه ادیان مختلف، دومین همایش بررسی ضوابط شرعی در پزشکی؛

٤١. هولمز، رابرت ال (١٣٨٥، ) مبانی فلسفه اخلاق، ترجمه مسعود علیا، تهران، انتشارات ققنوس؛

٤٢. ویسیک، جن (١٣٧٣، ) ترجمه دکتر ناصر بلیغ، تهران، نشر مرکز مطالعات و تحقیقات اخلاق پزشکی؛

٤٣. یاسپرس، کارل (١٣٧٢، ) کانت، ترجمه میر عبدالحسین نقیبزاده، تهران، طهوری.

**مقاله:**

٤٤. آخوندی و همکاران (١٣٨٧، ) رحم جایگزین و ضرورت استفاده از آن در درمان ناباروری، فصلنامه باروری و ناباروری، دوره ٩، شماره ١؛

٤٥. آخوندی، محمد مهدی؛ بهجتی اردکانی؛ زهره (١٣٨٧، ) رحم جایگزین و ضرورت استفاده از آن در درمان ناباروری، فصلنامه باروری و ناباروری؛

٤٦. آرامش، کیارش (١٣٨٧، ) بررسی اخلاقی رابطه پولی در رحم جایگزین، فصلنامه باروری و ناباروری؛

٤٧. اسلامی، محمد تقی (١٣٨٩، ) (نقش اخلاق کاربردی در توجه به فلسفه اخلاق) در معرفت اخلاقی، شماره ٢؛

٤٨. اسماعیل آبادی (١٣٨٧، تأملات اخلاقی-حقوقی در شبیهسازی، مجله اخلاق و تاریخ پزشکی، سال اول، شماره ٢، بهار ٤٥-٣٨؛

٤٩. اصغری، فریبا (١٣٨٧، ملاحظات اخلاقی در روش کمک باروری رحم جایگزین، فصلنامه باروری و ناباروری؛

٥٠. اکرمي، محمد، باستاني، امیر و اوسطی، زهرا (١٣٨٩، پرهیز از خطای پزشکی در سقط درمانی، چقدر باید مراقب باشیم؟ مجله اخلاق و تاریخ پزشکی، دوره سوم، شماره ٤؛

٥١. آلموند، برندا (١٣٨٦، (اخلاق کاربردی) در راهبرد توسعه، ترجمه حامد حاجی حیدری، شماره ٩.

٥٢. بسامی، مسعود (١٣٨٦، اتانازی از دیدگاه اخلاق و ادیان، شماره ٢؛

٥٣. پارساپور، علیرضا، محمد، کاظم، ملک افضلی، حسین، علاءالدینی، فرشید، لاریجانی، باقر (١٣٨٨، (بررسی نگرش بیماران، پزشکان و پرستاران در خصوص ضرورت رعایت حقوق بیمار) در مجله اخلاق و تاریخ پزشکی، دوره ٢، شماره ٤؛

٥٤. تفضلی، ابوالقاسم، (١٣٨٢، به من حق مردن بدهید، شماره ١٨؛

٥٥. تولیزاده، سعید و زکیانی، شعله (١٣٨٦، مرگ مغزی و اهداء اعضاء؛ مجله علمی دانشگاه علوم پزشکی گرگان، تابستان ٨٦، دوره ٩، شماره ٢، پی در پی ٢٢؛

٥٦. حجتی، سید مهدی (١٣٧٩،) تحلیل حقوقی اتانازی (مرگ شیرین،) شماره ٣٠؛

٥٧. حسین شریفی، احمد (١٣٩٠،) چیستی اخلاق کاربردی در معرفت اخلاقی، سال دوم، شماره سوم؛

٥٨. خاقانیزاده، مرتضی، ملکی، حسن، عباسی، محمود، عباسپور، عباس، محمدی، عیسی (١٣٩٠،) چالش‌های آموزش اخلاق پزشکی مرتبط با اساتید مطالعه کیفی، در مجله ایرانی آموزش در علوم پزشکی، ١١ (٨)؛

٥٩. دباغ، سروش (١٣٨٦،) اخلاقی پزشکی، بررسی اتانازی داوطلبانه غیر فعال از منظر اخلاق راس، شماره ١؛

٦٠. رنجبریان ا. و سیف ز. (١٣٨٨،) چالشهای حقوق بشری شبیهسازی انسان، فصلنامه حقوق، مجله دانشکده حقوق و علوم سیاسی، شماره ١، بهار، ١٥٤-١٢٩؛

٦١. شاملو، باقر (١٣٨١،) سقط جنین در نظام حقوقی فرانسه. ضمیمه فصلنامه باروری و ناباروری، چکیده مقالات سمینار بررسی جامع ابعاد، سقط جنین در ایران، پژوهشکده ابن سینا ١٣٨١؛

٦٢. شکور، مهسا، یوسفی، علیرضا، بذرافکن، لیلا، جوهری، زهرا، طاهری، صفورا، امید، اطهر (١٣٩٢،) ابعاد اخلاقی سقط جنین در آموزش پزشکی، مجله ایرانی اخلاق و تاریخ پزشکی، دوره‌ای ششم، شماره ٥، آذر؛

٦٣. قاسمزاده، سید مرتضی (١٣٨٧،) قراردادهای رحم جایگزین در حقوق ایران، فصلنامه باروری و ناباروری؛

٦٤. قورچیان، نادر، جعفری، پریوش، قانعی، مصطفی، شایان، شهرام (۱۳۹۳،) پیوند بین آموزش و پژوهش در دانشگاههای برتر جهان، مطالعه مروری با ارائه یک الگوی مفهومی، در مجله ایرانی آموزش در علوم پزشکی، ١٤ (٨)؛

٦٥. گرمارودی، شیرین (۱۳۸۷،) سخنی پیرامون رحم جایگزین در ایران، فصلنامه باروری و ناباروری؛

٦٦. محمدی، ع (۱۳۸۷،) مساله هویت روانی در شبیهسازی، مجله تاریخ و اخلاق پزشکی، سال اول، شماره ۳، تابستان، ص۷۲-٦٥؛

٦٧. ناصری مقدم، حسین (۱۳۸۷،) واکاوی احکام فقهی نسب در کودک متولد از رحم جایگزین، فصلنامه باروری و ناباروری؛

٦٨. نیکومنش، ا. (۱۳۸٥،) برداشت عضو از مبتلا به مرگ مغزی و لسان آیات و روایات، مجله برهان و عرفان، شماره ۷؛

٦٩. نیکوئی نژاد، ل (۱۳۹۰،) اختیار در فرایند فناوری همانسازی انسانی، مجله تاریخ و اخلاق پزشکی، دوره چهارم، شماره ٥، ص۳۸-۳۱؛

۷۰. وکیلی نژاد، مولودالسادات و قربان نژاد، فاطمه و تابعی، سید ضیاءالدین و محمودیان، فرزاد، ملاحظات اخلاقی و اجتماعی در تکنولوژی پیوند عضو از حیوان به انسان (xenotrasplantation) در مجله اخلاق و تاریخ پزشکی، دوره ۲، شماره ۱، ص ٤٠- ۳۱؛

۷۱. یوسری، محمد؛ الحسنی، صفا، (۱۳۸٦) اهمیت رحم جایگزین در مذاهب و کشورهای مختلف اروپایی، فصلنامه باروری و ناباروری، ضمیمه دوره ۸، شماره ۲؛

**پایاننامه:**

۷۲. حسنی، محمد (۱۳۸۲) بررسی دیدگاه ارزش شناسی علامه طباطبایی و دلالتهای آن در تربیت اخلاقی، رساله دکتری، دانشکده روانشناسی و علوم تربیتی، دانشگاه تهران؛

۷۳. یزدانپناه، قربانعلی (۱۳۸٤) بررسی منش تفکر انتقادی در برنامه درسی، رساله دکتری، دانشکده علوم انسانی، دانشگاه تربیت مدرس.

**ماستەرنامە**

سەرکەوت رسول حسن (۱۳۹۳) تبین و تحلیل اخلاق پزشکی با تاکید بر مسئلەهای مبتلابه در کردستان- عراق، دانشگاه بین المللی امام خمینی، قزوین، دانشکده علوم انسانی.

## سەرچاوەی کوردی


١. کانت، ئیمانوێل (٢٠١٥،) ڕەخنەی عەقڵی پراکتیکی، و: سۆران عومەر حەمە، نێوەندی ڕۆشنگەری بۆ لێکۆڵینەوەی فیکری و سیاسی، کوردستان، عێراق؛

٢. کەمال، محەمەد (٢٠١٧،) فەلسەفەی کانت، چاپخانەی سەردەم، سلێمانی؛

٣. کانت، ئیمانوێل (٢٠١٥)، بناغەدانانی میتافیزیکی مۆڕاڵ، و: سۆران عومەر حەمە، نێوەندی ڕۆشنگەری بۆ لێکۆڵینەوەی فیکری و سیاسی، کوردستان، عێراق؛

٤. کانت، ئیمانوێل (٢٠١٤،) پرۆلیگۆمێننا، دانانی بنەمای میتافیزیکی مۆڕاڵ، و: د. حەمید عەزیز، چاپخانەی ڕۆشنبیری، هەولیر؛

٥. خۆزەگالیندۆ، هیکتۆر زاگاڵ (٢٠١٣،) فەلسەفەی مۆڕاڵ، و: سەعید کاکی، چاپخانەی ڕۆشنبیری، هەولێر؛

٦. کۆمەڵێک نووسەر (٢٠١٤،) بنەماکانی فەلسەفەی مۆڕاڵ، و: سەعید کاکی، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، هەولێر.

٧. بە زمانی عەرەبی:

٨. عبدة، مصطفی (١٩٩٩،) فلسفة الأخلاق، ط٢، القاهيرة.

ئایا سنوورەکانی ئەخلاق تا کوێ درێژ دەبنەوە؟ ئایا هەموو کار و کردەوەکانی ئێمە دەچنە نێو بازنەی داوەریی ئەخلاقییەوە، یان تەنها بەشێك لە کار و کردەوەکانمان؟ بنەما ئەخلاقییەکان چین و لە کوێوە سەرچاوە دەگرن: کۆمەڵگە، ئایین یان عەقڵ؟ کێ مافی بڕیاردانی ئەخلاقیی هەیە و ئەو مافە چۆن بە دەست دێت؟ بۆچی دەبێت ئەخلاقییانە ڕەفتار بکەین؟ ئایا پێوەرێکی ئەخلاقیی گەردوونیمان هەیە، یان ئەخلاق بە پێی کات و شوێن دەگۆڕێت؟ ئایا دەشێت گۆڕانی پێوەرە ئەخلاقییەکان بەهانەیەك بن بۆ ئەوەی مرۆڤ نائەخلاقییانە ڕەفتار بکات؟ ئایا ئەخلاق تەنها (خراپەنەکردن)ـە، یان (باشەکردن) یەکێکە لە ئەرکە ئەخلاقییەکانی ئێمە؟ داوەریی ئەخلاقی تا چەند سەبژێکتیڤە؟ کاتێك پێوەرێکی ئەخلاقی لەگەڵ بەرژەوەندیی تایبەتیدا تێك دەگیرێت، دەبێت کام لایەن بگرین؟ بڕیارەکانی پزیشك لە کوێوە سەرچاوە دەگرن: ئایین، کولتوور، یان فەلسەفە؟ ئەی بڕیارەکانی نەخۆش؟ لەباربردن، ئۆتۆنازی، بەکرێدانی منداڵدان و منداڵی بلووری ئەخلاقین یان نا، و بۆچی؟ بۆ وەڵامی ئەم پرسانە و چەندان پرسی تر، پێشنیار دەکەم ئەم کتێبە بخوێنیتەوە.

# Moral Philosophy & Medical Ethics

sarkawt sawadi

بەرگ: ئیبراهیم ساڵح